# لە ڕەوت و ئایدۆلۆژیای ئیسلامییەوە بەرەو ئیسلامییە نوێیەکان


.............................................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ

- نووسینی: د. عبدالله المالكي
- وەرگێڕانی: عومەر تۆفیق الخطاط
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە ( )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەرۆك

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس بۆ زاتی پاکی پەروەردگارمان، کە شەریعەتێکی جوان و لەبار و گونجاو بۆ هەموو سەردەمەکانی پێبەخشیوین.. کە ئەگەر بە لێزانی و ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و بە رەچاوکردنی زەمینە و بارودۆخە جیاجیاکان جێبەجێ بکرێت، بەهەشتێك هەر لە دنیا پێش قیامەت بۆ مرۆڤەکان فەراهەم دێنێ.

درودو سەلامیش بۆ گیانی پاکی ئەو رەسولە نازدارەی لە ماوەی (٢٣) ساڵ پێغەمبەرایەتیدا هەموو چەمکەکانی شەریعەتی خوای پێ راگەیاندین و بە فەرموودە جوان و پڕ لە حیکمەتەکانی قورئانی کەریمی بۆ راڤەکردین و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤایەتی دایەوە. بەهۆی ئەم شەریعەتە زیندووەوە، لە سەردەمی خۆیدا (صلى الله عليه وسلم) و هەر چوار خەلیفە راشیدەکەیدا، بەهەشتێك لە دادپەروەریی و بەرخودان و هەست بە چێژ و تامی ژیان کردن هاتەکایەوە.

ئەمڕۆ ئێمە (زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ) دوورکەوتووینەتەوە لە زەمەنی ئاڵتوونی سروش و وەحی ئیلاهی، بۆیە لە میکانیزمی ئامێزگرتن و هێنانەوەی بۆ سەر شانۆی سیاسی ژیان گۆڕانکاریی روویداوە و ئەو سەردەمە رۆیی کە کەسێك بتوانێت و خۆی بسەپێنێ بەسەر وڵاتدا و بە ئارەزووی خۆی شەریعەت جێبەجێ بکات بەسەر میللەتەکەیدا. ئەمڕۆ سندوقی هەڵبژاردن و ژماردنی دەنگی بەڵێ و دەنگی نەخێر، لە سیستەمی سیاسی وڵاتانی جیهاندا ـ جگە لە دیکتاتۆری و شانشینەکان ـ پەیڕەو دەکرێت.

پرسکردن بە خەڵکی هەر وڵاتێك لە سەرجەم پرۆسە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکاندا بووەتە شتێکی حەتمیی، لە پێناو لابردن و کەمکردنەوەی نەیاری و بۆڵەی جەماوەری لە دەرکردنی یاسا و بڕیارە چارەنووسسازەکاندا. شەریعەتی ئیسلام خۆی لە خۆیدا چارەسەرە، نەك کێشە، ئیسلام بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکان هێناویەتی، بەڵام بەو مەرج و زەمینە و خەڵکەی کە ئیسلام پەروەردەیان ئەکات و دایناوە بۆیان، ئەگینا باشترین جۆری تۆو ئەگەر نەکرێتە زەمینێکی بەهێز و بەپیت و بەرەکەت، لە ئاکامدا رووەکێکی بێ بەرهەم دەڕوێت کە هەڵکێشانی لە بن زۆر باشترە لەوەی کە زەوییەکەش بەخۆڕایی و بەبێ سوود داگیر بکات.

ئەم شەریعەتە لەهەر وڵاتێکدا جێبەجێ کرابێت بەبێ پەروەردەکردنی تاکی موسڵمان لەسەری و بەبێ زەمینەسازیی بۆ جێبەجێکردنی و بەبێ رەچاوکردنی گۆڕانکارییە سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵاتییەکان، بەداخەوە لەباتی ئەوەی ئەو وڵاتە بکاتە یەك پارچە بەهەشت لە دادپەروەریی و خۆشگوزەرانی، کردوویەتی بە زەمینەیەك بۆ رقبوونەوە لە شەریعەتی پاکی ئیسلام و دروستکردنی دۆخێکی نەخوازراو و بێزراو. بە مانایەکی تر، حکومەتی ئیسلامی تا هۆکارەکانی دزی ـ کە زۆربەی لە هەژاری و کەمدەرامەتییدا خۆی دەبینێتەوە ـ بنەبڕ نەکات، نابێ حەددی دزیی بەسەر میللەتدا جێبەجێ بکات و دەستی لایەك لە وڵات بقرتێنێ و بڵێن ئەمە چییە شەریعەت جێبەجێ ئەکات.

یان پێش ئەوەی کاری هاوسەرگیریی ئاسان بکات بۆ کچان و کوڕان و هەموو هۆکارەکانی زینا و داوێنپیسیی نەهێڵێت ـ کە لەوانەیە چەند ساڵێکی پێ بچێت ـ ئەوجا حەدی زینا جێبەجێ بکات. کەواتە ئەمڕۆ بۆیە، ئەگەر

خەڵكانێك هەبن، لە جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی بترسن و بە دەنگی نەخێر رەفزی بکەن، ناهەقیان ناگرین، چونکە هەر هەنگیان دیوە، هەنگوینیان نەدیوە.

وائەزانن جێبەجێکردنی شەریعەت لەوەدایە هەرکەس دزی کرد، یەکسەر بەبێ سێودوو دەستی ببڕین و هەرکەس پیاوی کوشت یەکسەر بیکوژینەوە و هەرکەس زینای کرد یەکسەر رەجمی بکەین و مەی خواردنەوە نەمێنێ و حیجابی ئیسلامی بەسەر کۆمەڵگەدا فەرز بکرێت، لەمەدا من ناهەقی ترسیان ناگرم، چونکە بنەبڕکردنی ئەو هەڵە و تاوانانە ـ بە جێبەجێکردنی شەریعەت لەناو ناچن ـ ، بەڵکو لە رێگەی پەروەردەکردن و هۆشیارکردنەوەی تاك تاکی موسڵمانە بە ترسناکیی ئەو گوناهانە و ئاسەواری ناشیرینیان چ لە دنیا و چ لە سزای سەختی خوایی بۆ ئەنجامدەرانیان لە رۆژی دواییدا.

من لە چەند کەسم پرسیار کردووە کە ئەگەر تۆ ببیت بە سەرۆکی وڵات و هەموو دەسەڵاتەکانیش لای تۆ بن، چی ئەکەیت بە شەریعەتی ئیسلام، لە وەڵامدا وتی شەریعەت جێبەجێ ئەکەم، وتم زۆر باشە بەڵام شەریعەت لای تۆ چییە؟ یەکسەر شەش حەوت تاوانی بۆ ژماردم لە دزیی و پیاوکوشتن و مەی خواردنەوە و قوومار و سفووری ئافرەتان و .. هتد.

وتم دەی من چوومە سەر تەختی حوکم هیچ یەکێ لەوانە جێبەجێ ناکەم، وتی بۆ بۆ! خۆتۆ خۆت بە موسڵمان ئەزانی، شەریعەتی ئیسلام لە وڵاتانی ئیسلامیدا پەکی خراوە، ئەی نابێ بیهێنینیەوە؟!

وتم جێبەجێکردنی شەریعەت ئەو شەش حەوت شتە نییە کە تۆ باسی ئەکەی، من ئەو شەش حەوت شتە ئەوەستێنم و جێبەجێی ناکەم تا دادپەروەریی کۆمەڵایەتی قورئانی جێبەجێ نەکەم، تا ئازادی نەگێڕمەوە بۆ

گەلەکەم، تا لە جوانی و خۆشییەکانی ئیسلام پێشکەش بە گەلەکەم نەکەم، سزا و ناخۆشییەکانیان بەسەردا جێبەجێ ناکەم و ئیسلامیان لەبەر چاو ناخەم. من حیجاب فەرز ناکەم بەسەر کۆمەڵگەکەمدا، بەڵام هەوڵ ئەدەم بۆ پۆشتەیی و حیجاب برەو پێ بدەم و شیرینی بکەم لە دڵی ئافرەتانی وڵاتەکەمدا تا دواتر خۆیان بە حەزو تاسەوە سفوری بەجێ بێڵن و بەرگی حەیا و شەرم بپۆشن. دیموکراسی یان گەڕانەوە بۆ رای خەڵکی لە یەکلاکردنەوەی هەموو مەسەلە سیاسی و ئابوورییەکاندا بۆتە بەشێکی زۆر گرنگ لە پرۆسەی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی وڵاتدا.

ئەوروپییەکان لە رێگەی ئەم پرۆسەیەوە توانیویانە ژیانیان بەشێوەیەکی جوان و یاسایی رێك بخەن و بێ شەریعەتییان پێوە دیار نەماوە.

ئێمە ئەگەر سەیرێکی ژیانی پێغەمبەری خوا (موحەممەد) (صلی الله علیه وسلم) بکەین، بۆمان دەرئەکەوێت کەسێکی خۆسەپێن و دیکتاتۆر نەبووە و رای خۆی فەرز نەکردووە بەسەر گەلەکەیدا، لەکاتێکدا رای ئەو بەشێك بووە لە شەریعەتی خوا و ﴿وَما ینطقُ عنِ الهَوى﴾ شایەتی ئەو راستییەن.

لە چەندان جێگادا ئەیتواتی بە ڕای خۆی کارەکان بکات و کەسیش جورئەتی ئەوەی نەئەکرد بە روویدا بوەستێتەوە، کەچی راوێژی پێ ئەکردن و پرس‌و رای جەماوەری لەلای زۆر گرنگبوو، کاریشی بە ڕایەکەی ئەوان ئەکرد وەك لە کاتی دەرچوون لە شاری مەدینە بۆ جەنگی بەدر و دەیان جێگای تر کە لەم پێشەکییە کورتەدا جێگای نابێتەوە.

## پێشەکی نووسەر

لە ژێر سایەی شۆڕشەکانی ـ ئەم دواییەی ـ وڵاتانی عەرەبی و دەست خستنەوەی ئیرادەی گەلان و لەناوبردنی رژێمە حوکمڕانە دیکتاتۆرەکان، پرۆژەی ـ ئیسلامی سیاسی ـ وەك بژاردەیەکی بەهێز دەرکەوت، بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و بۆ بەڕێوەبردنی وڵات هەڵبژێردرا.

بۆ بەرپاکردنی دەسەڵاتی سیاسی و گۆڕینی لە کەشێکی ستەمکارییەوە بۆ کەشێکی دیموکراتی، لە کەلتووری سەرکوتکردن و دوورخستنەوە و تۆقاندن کە رژێمە خۆسەپێنەکان بەرپایان کردووە، گۆڕینی بۆ کەلتووری سەربەستی و فرەحیزبی و جێگیرکردنی مافی مرۆڤە، لە جیهانی پڕ لە گەندەڵی و بێبەشکردن و نەزانی و ستەمی کۆمەڵایەتییەوە بۆ جیهانێکی پڕ لە گەشە و پێشکەوتنی زانستی و خۆشگوزەرانی و دادەوەری کۆمەڵایەتی.

ئەمەو چەندانی تر لە شایستە شۆڕشگێڕییەکان کە لە پێناویدا گەلان چوونە سەر شەقام و ماڵ و نامووس و خوێنیان لە پێناویدا بەخشی.

ئەمەش مانای وایە بزاڤە ئیسلامییە سیاسییەکان تاقیکردنەوەیەکی قورس و گرانیان لەبەردەمدایە، سپاردەیەکی زۆر گەورەیان لەبەردەمدایە، چونکە خوێنی گەشی چەندان شەهیدی شۆڕشگێڕ رێژرا، کە ئەوەش هۆیەکی راستەوخۆ بوو بۆ لادانی حوکمی دیکتاتۆریەت و رزگارکردنی ئیرادەی گەل.

لەسەر هەموو لایەنە ئیسلامییەکان پێویستە ـ بە هەموو بۆچوون و جۆرەکانیانەوە ـ کە پێش ئەوەی بچێتە ناو ئەزموونی حوکمڕانی و سیاسەتەوە، ئەم پرسیارەی خوارەوە لەخۆی بکات:

ئایا گەلانی راپەڕیو لەم قۆناغەدا چیان دەوێت؟ ئەو شتە چیبوو کە لە پێناویدا دەستیان دایە راپەڕین و خوێنی گەشی خۆیان لە پێناویدا رژاند؟

ئایا بۆچی ئەم باجە گەورەیان دا؟ لە پێناو دەستخستنی چیدا ئەم هەمووە قوربانییان داوە و بەردەوامیش دەیدەن؟

ئەوەی بە وردی چاودێری ئەو جوڵانەوە شۆڕشێگرانەیەی گەلانی بەهاری عەرەبی بکات بێ قسە بۆی دەردەکەوێت کە گەلانی شۆڕشگێڕ نەچووە سەر شەقام تەنها بۆ دەستخستنی (سەربەستی و کەرامەت و دادپەروەری) نەبێت... چونکە واقیعی شۆڕشەکان و دیمەنە جۆراوجۆرە دووبارەکان و گوێگرتن بۆ دروشمو داواکارییەکانیان بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا ئەم راستییە دەسەلمێنێت. ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە گەلان بۆ ئەوە راپەڕین کە داوای مافی سەروەرێتی خۆیان بکەن بەسەر وڵات و زەوی و خێروبێریانەوە..

چووە سەر شەقام تا شەرعییەتی سیاسی بۆ بگەڕێتەوە و هەر ئەویش بکرێتە سەرچاوەی و ئەویش حکوماتەکانی خۆی دیاری بکات و هەر گەلیش بتوانێت چاودێری بکات و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات، بەبێ کەمترین ترس و تۆقاندن و سەرکوتکردن.

چووە سەر شەقام تا دەوڵەتی یاسا بەرپا بکات، تا یاسا بەسەر هەمواندا سەروەر بێت، نەك تەنها لاوازەکان بگرێتەوە و بەهێز و دەست رۆیشتووەکان لێی قووتار بن.

چووه سەر شەقام تا وڵات رزگار بکات لە چەتەکانی گەندەڵی، ئەوانەی سوودمەندن لە وڵاتی ستەمکاری و ئەوانەشی کە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان لەوەدا بوو لەپێناو پڵیشاندنەوەی هەژاراندا دەبوونە هاوپەیمانی دەسەڵاتە گەندەڵەکان.

چووە سەر شەقام تا مافی خۆی بەکاربێنێ، لە دروستکردن و بەرپاکردنی دەوڵەتێکی شارستانی ئازاددا و لە هەموو بوارەکاندا بەبێ ترس و تۆقاندن و سەرکوتکردن.

چووە سەر شەقام تا بتوانێت زیندانە باستیلییەکان کە لە هەموو وڵاتە عەرەبییەکاندا بڵاوبوو تێك بشکێنێت، جەلادەکانیش و دادوەرەکانی باستیلەکان و وەزیرەکانی ناوخۆ لەناوبەرێت.

لە یەك وشەدا، گەلان چوونە سەر شەقام بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی زەوتکراویان. بەڵێ دەسەڵاتیان و بەس، هیچی تر نا، بەبێ هیچ پاڵنەرێکی ئایدیایی و بیروباوەڕێك ئیتر ئاینی بێ یان دەستکرد.

با روونتر قسە بکەین:

گەلان بۆ ئەوە نەچوونە سەر شەقام و رانەپەڕین تا داوای جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام بکەن، هەرچەندە ئەمە داوایەکی شەرەفمەندایە و ئاواتی هەموو موسڵمانێکە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا. بەڵام گەلان ئەم دروشمەیان هەڵ نەبڕی لە رێپێوان و مانگرتنەکانیاندا. بۆ ئەوە نەچوونە سەر شەقام تا پەیڕەوی ئەهلی سوننە و جەماعە زیندوو بکەنەوە.

یان لەپێناو سەرخستنی پرۆگرامی سەلەفی دا وەك هەندێك وا گومان دەبەن.

نەچوونە سەر شەقام، تا رەوشتە ناشیرینەکان یان بیدعەو داهێنراوەکان لە ریشە دەربهێنن، یان بۆ ئەوەی مەزارگە و قەبری شێخەکان تێك بشکێنن.

یان بۆ هێنانە کایەی بانکی ئیسلامی رانەپەڕین، یان بۆ رێگەپێدانی فرەژنی یان بۆ سەپاندنی پۆشاکی ئیسلامی و پەچە، یان بۆ قەدەغەکردنی مەیخواردنەوە و نەهێشتنی مەلهە و سەماخانەکانی شەو نەبوو.

گەلان بۆ ئەم مەبەستانە رانەپەڕین. بەڵکو بۆ ئەوە چوون سەر شەقام تا یەکەم سەرلەنوێ دەستیان بەسەر وڵاتەکانیاندا بڕواتەوە و ببنەوە تاکە سەرچاوەی دەسەڵات و شەرعیەت. تەنها گەل ئەوەی بۆ هەبێت، نەك بۆ سەرکردەیەکی تاکانە، یان بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا، یان بۆ تەنها حیزبێك. بەڵام خۆ بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە گەلانی موسڵمان دژی ناسنامەی ئیسلامی خۆی و سەرچاوە شەرعییەکانی بێت.

بەڵکو ئێمە زۆر لەوە دڵنیایین کە گەلانی عەرەبی زۆر زیاتر نەژادپەروەر و پارێزەری ناسنامەو بەها باڵاکانی خۆیەتی، زیاتر لە رژێمە گەندەڵەکان یان لە خەڵکە هەلپەرست و مشەخۆر و بەرژەوەندچییەکانی دەوری دەسەڵاتە گەندەڵەکان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دووبارە دەڵێم بۆ هیچێ لەو مەبەستانە شۆڕشی نەکرد و نەچووە سەر شەقام و رژێمە گەندەڵە دیکتاتۆرەکانی نەڕووخاند. کەواتە ئەوەی هاووڵاتییەکی عەرەبی هێنایە سەر شەقام، گەڕاندنەوەی (شکۆ) بوو بۆ گەل، گەڕاندنەوەی دەسەڵات بوو بۆ گەل، لەو پێناوەدا خوێنی رشت و قوربانی گەورەی دا.

**ئەم قسەیە manای چییە؟**

ئەم قسانەی پێشوو مانای ئەوەیە کە دوای گەڕانەوەی شکۆ ـ سیادە ـ بۆ گەل، کەس بۆی نییە هیچ بەسەر ئەم گەلەدا بسەپێنێ، تا نەگەڕێتەوە بۆ زانینی ویستی گەل لە هەڵبژاردنی ئەو دەستوور و یاسایەدا کە خۆی هەڵی دەبژێرێت لە رێگای صندوقەکانی دەنگدانەوە، ئەگەرهاتوو گەل یاسای ئیسلامی و بەها بەرزەکانیان هەڵبژارد و کردیانە سەرچاوەی گەورە و چوارچێوەی یاساکانیان، لەم کاتەدا هیچ کەس بۆی نییە بدات بەسەریدا، یان شتێکی تر بەدەر لەو ویستە یسەپێنێ بەسەریاندا، خۆ ئەگەر شتێکی تری جگە لەم بژاردەیە هەڵبژارد بەدەر لە شەریعەتی ئیسلامی، لێرەشدا پێویستە رێز لە بژاردنەکەی بنرێت و نابێ بقەوچێنرێتەوە و زۆری لێ بکرێت بۆ هەڵبژاردەیەکی تر کە خۆی قەناعەتی پێی نییە.

دەبێ چاو دابخەین لە قەناعەتی تاکە کەسی خۆمان و هەڵوێستی شەرعیمان دەربارەی ئەو کەسەی ئەم بژاردەیە هەڵدەبژێرێت، ئیتر ئەو کاتە خۆی بەرپرسیارە لەبەردەمی خوا و لەبەردەمی مێژوودا، لەو کاتەشدا ئێمە تەنها ئەوەمان بۆ هەیە کە رەوشتی کێبرکێی نێوان بیر و هزر و بۆچوونەکان بەکاریبهێنین و لەو رێگایەوە گۆڕینی کۆمەڵایەتی ئاشتییانەوە و لە رێگای دەستاودەست کردنی دەسەڵاتەوە بیانگۆڕین.

بەڵام هەرگیز بەکارهێنانی زەبر و زەنگ و چاوسوورکردنەوە و تۆقاندنەوە بمانەوێت بیگۆڕین، هیچ بەرهەمێکیان نابێت، جگە لە بیروباوەڕی تەزویر و بەها و بنەمای دەرەکی و شکڵی بەجۆرێ نەچووبێتە ناو پەرەکانی دڵ و ئاوێتەی رۆح نەبووبێت، خۆ ئاشکرایشە ئاوا بیروباوەڕێکی درۆ و رەوشتی زایەری و شکڵی، هەرگیز کۆمەڵگایەکی چاکساز بەرهەم ناهێنێت.

بێگومان شەریعەتی ئیسلام بە هەموو بنەما و مەبەستەكانییەوە بۆ كۆمەڵگەیەكی ئا لەم چەشنە نەگونجاوە، هەر لەبەر ئەم هۆكارەشە كە سەربەستی بیروباوەڕ و ویژدان لە قورئانی كەریمدا یەكێكە لە مەسەلە گرنگەو جێگیرە گشتییەكان، كۆمەڵە دەقێكن نابێ نەیارییان بكرێت و ناشبێت تایبەتمەند بكرێت و یان نابێ حوكمەكەی بە ئایەتە چەند ماناكان ـ متشابهات ـ بسڕێتەوە.

چەندان ئایەتی قورئانی كەریم ئەم مانایە دووپات دەكاتەوە، وەك ئەوەی خوای پەروەردگار ـ عزوجل ـ ئەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾[1]، واتە: پێیان بڵێ: حەق و راستی لە بەرنامەی پەروەردگارەتاندایە، جا هەركەسێ باوەڕی پێ دێنێ ئازادە و ئەوەشی باوەڕی پێ ناكات هەر ئازادە.. یان ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾[2]، واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە وای دەكرد كە هەموو سەرزەوی بەیەكەوە باوەڕبێنن، ئەی باشە تۆ ـ ئەی موحەممەد ئەی موسڵمانان ـ ئەتەوێ بە زۆرلێكردن خەڵكی بكەیتە باوەڕدار؟!! یا ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾[3]، واتە: هەركەسێ رێنموونی و هیدایەت وەربگرێت ئەوە خۆی سوودی لێ وەردەگرێت و هەركەسیش گومڕا ببێت هەر خۆی زیان دەكات و تۆش وەكیل نەكراویت كە هەر دەبێت موسڵمانیان بكەیت.

---

[1] الكهف: ٢٩.

[2] يونس: ٩٩.

[3] يونس: ١٠٨.

یان ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾[1]، واتە: تۆ لەسەرتە تەبیلیغیان بکەیت و ئەوی تری کە سزای رۆژی قیامەتە لێی گەڕێ بۆ خۆمان. یان ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ * لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾[2]، واتە: بیریان بخەرەوە چونکە تۆ لەسەرتە بیریان بخەیتەوە و لەوە زیاتر تۆ دەستت ناڕوات بەسەریاندا. ئەمەو چەندان ئایەتی تر کە لێرەدا بوار نییە هەموویان بهێنم و بیکەم بە کوردی.

کەواتە لە کاتی بژاردەی دووەمدا کە وەك باسمکرد ـ گەل شتێکی تری جگە شەریعەت هەڵبژارد ـ بانگخوازان چاریان نییە هەردەبێت خەریکی کاری خۆیان بن لە گەیاندنی بانگی هەق و بنەماکانی ئیسلام و باسی بەها بەرزەکانی و رەوشتە باڵاکانی بەشێوازێکی پڕ لە حیکمەت و ژیری و لێزانی و ئامۆژگاری چاك بۆ خەڵکی بکەن.

بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەسەر گەلدا بسەپێنن، چونکە سەپاندنی لە رێگای دەسەڵاتەوە دەبێت و دەسەڵاتیش رەوایی لە گەلەوە وەردەگرێت.

ئەگەرهاتوو گەل ـ ئوممەت ـ باوەڕی بە بنەما و بەها بەرزەکانی ئیسلام هەبوو، بە ناڕاستەوخۆ لە واقیعەکەیدا رەنگ ئەداتەوە، بەبێ ئەوەی خۆی بیڵێ لەناوئاخنی یاساکانی شەرعدانان و دەستووردا بەرجەستە ئەبێت.

خۆ بێگومان ئەمەش نایەتەدی تا دەسەڵات و سەروەری ـ سیادە ـ نەگەڕێتەوە بۆ ئوممەت، نەك دەسەڵات بە دەستی سەرۆکێکی خۆسەپێن یان حیزب و لایەنێکی دیاریکراوەوە بێت لە جیاتی ئوممەتدا هەموو دەسەڵاتەکانی بۆ خۆی قۆرخ بکات.

---

[1] الرعد: ٤٠.

[2] الغاشیة: ٢١ـ ٢٢.

ئەمەش مانای ئەوە نییە ـ وەك هەندێك وا ئەزانن ـ گەل خاوەنی پێوانەی بنەماكانی بیروباوەڕ و بەها باڵاكان و رەوشتە.

نەخێر، بەڵكو پێوانەكە لە لایەنی زانستییەوەیە، واتە: رەنگدانەوەی ئەو بیروباوەڕەیە كە گەل باوەڕی پێیەتی، ئیتر جیاوازی نییە چ ئایینی بێ و چ بیروبۆچوونە مرۆڤ كردەكان بێت. بێگومان حەڵاڵ و حەرام لە ئیسلامدا هەرگیز لە رێگای راپرسی گەلەوە جێگیر نابێت، بەڵكو لە رێگای دوو سەرچاوە گرنگەكەی ئیسلامەوە دیاری دەكرێت، كە قورئان و سوننەتە.

هەموو زانایان و ژیرمەندان و فەیلەسوفەكان بەدرێژایی مێژوو هەر فیكرە و بنەمایەكیان هێنابێت وەك هەق و بەتاڵ، یان خێر و شەڕ، یان سوودبەخش و زیانبەخش، یان دادگەری و ستەمكاری، لە رێگای خستنە دەنگدان و گەڕانەوە بۆ رای زۆرینەوە نەیانهێناوە، بەڵكو خۆیان ئەو بیرە ناوازانەیان بۆ هاتووە و لە رێگەی قەناعەتی تەواویانەوە پێی و لە رێگەی ئەو پێگە زانستی و ئاینییانەوە لەناو كۆمەڵگەدا بەخشیان كردووە، كەواتە سەرشار ـ مرجعیة ـ فەرمانڕەوایە نەك گەل.

ئیشو كاری گەل ئەوە نییە فەیلەسوفی و مێزگرد و بەهانەی بەرزی و باشی بیروباوەڕو بەها رەوشتییەكان بهێنێتەوە ـ وەك هەندێك وا تێگەیشتوون ـ، بەڵكو ئیشی گەل ئەوەیە دەسەڵات و سەروەری بەسەر ئەو بیرو بەها و رەوشتانە لابات كە بەسەریانەوەیە، بەڵكو كاری ئەوەیە بیانگۆڕێت لە قەناعەتی دەروونی و رەوشتییەوە بۆ بە یاساكردنیان و بە دەستوور و شكۆداركردنیان بە مەبەستی جێبەجێ كردن.

بە مانایەكی تر، كار و پیشەی راپرسی بۆ ئەوەیە حوكمەكە بدەینە دەستی گەل لە حاڵەتێكدا كە بیروباوەڕ و بەها و رەوشتەكان دەكەونە

زۆرانبازیی. ئەم گەڕانەوە بۆ رای گەلە، بەشێوەیەکی ئاشتییانە ئەیخات بەلایەکدا. نەك لە رێگای جەنگو کوشتار و ترساندن و سەرکوتکردن و دوورخستنەوە و خوێنڕشتن و سنووربەزاندنەوە بێت وەك چۆن لە کۆندا وا بووە. بەشێوەیەك کە هەرکەسێ زۆری هەبوایە و سەرکەوتووبوایە لە جەنگدا ئیتر مافی ئەوەی هەبوو هەموو بیروبۆچوون و قەناعەت و ویستەکانی خۆی بسەپێنێ بەسەر گەلدا بەبێ گەڕانەوە بۆ رای ئەو گەلانە.

ئالێرەوەیە دەبێ گەل بالا دەست بێ پێش جێبەجێکردنی شەریعەت

سەروەری گەل ـ سیادة الشعب ـ مەبەستمان ئەوە نییە کە گەل دەستی بەسەر شەریعەتدا بڕوات و بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکو گەل لە جێبەجێکردن یان نەکردنی شەریعەتدا قسەی هەبێت، بێگومان جیاوازی هەیە لە نێوان شەریعەت و جێبەجێکردنی شەریعەتدا.

شەریعەت بریتییە لە بەخششی خودا لە رێگای نیگاوە ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی، لە کۆمەڵێ دەقی جێگیر ـ محکم ـ و بەڵگەنەویست ـ قطعي ـ و گشتی ـ كلّي ـ شەرعی پێکهاتووە. بەڵام جێبەجێکردنی شەریعەت واتە: رەنگدانەوەی ئەو بەخششە خواییە لە ژیانی مرۆڤەکاندا و لە رێگەی لێتێگەیشتنەوەیەکی مێژووییەوە جێبەجێ دەکرێت.

کەواتە دەبێ ئەوە بزانین جێبەجێکردنی شەریعەت خۆی بۆ خۆی ئایین نییە، بەڵکو دەرهاویشتەی ئاینە و دەبێ بە حیکمەت و ژیرانەوە جێبەجێ بکرێت. وەگەرنا لەوانەیە هەندێ جێبەجێکردنی شەریعەت پێچەوانەی ئایین بێت و جوانی و رەونەقی ئایین نەهێڵێ و هەندێ کاتیش ئەو مەبەستانە لە دەست ئەدات کە لە پێناویدا ئەو دەقانە هاتووە یان وادەبێ پێچەوانە بێت لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا.

ئەمەش مانای وایە کە (جێبەجێکردنی شەریعەت) هەندێ کات پێچەوانەی خودی شەریعەتە، دواتر رەخنەگرتن لەو جۆرە جێبەجێکردنەی شەریعەت و رەدکردنەوە و قبووڵ نەکردنی مانای ئەوە نییە شەریعەتی پێ قبووڵ نییە.

چونکە جێبەجێکردن پەیوەستە بەو دەقە گشتگیر و مەبەستەی خودی هاتنی شەریعەتەوە، خۆ هەموو جێبەجێکردنێکیش پڕاو پڕ لەگەڵ مەبەستەکانی شەریعەتدا نایەتەوە. هەروەك چۆن باس لە ـ سەروەری گەل ـ سيادة الأمة ـ لە سەرووی شەریعەتەوەیە.

لە لایەنی مەنتیقەوە دیارە ئەم پێشکەوتنەی ویست و دەسەڵاتی گەلە رێزێك نییە پێی درابێت، بەڵکو ئەم پێشکەوتنە لە لایەنی هۆکارەوەیە.

دەی پێشخستنی هۆ بەسەر هۆکاردا ئەوە ناگەیەنێ هۆکە لە پێش هۆکارەکەوەیە، خۆ ئەمەش لە مەسەلەی فەلسەفەی مەنتیقییەوە بەڵگەنەویستە. لەبەرئەوەش دەوترێت دەستنوێژ لەپێش نوێژەوەیە و ئاستی پارە ـ نصاب ـ لە پێش زەکاتدانەوەیە.

سەرەتا ـ ئەصڵی ئەم کتێبە ـ بابەتێکی کورت بوو لە ئەنتەرنێتدا بڵاومکردەوە پێش چەند مانگێك لەمەوبەر، دەمەقاڵە و گفتوگۆیەکی فیکری فراوانی دروست کرد، بەتایبەت لەناو جیلە ئیسلامییەکە و جیلی لیبراڵیدا لە وڵاتی سعودیە، خەڵکەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە لە نێوان لایەنگر و بەڵێ کردندا و لەنێوان نەیاری و نەخێرکردندا.

دوای ئەوە کۆمەڵێ بابەتی زۆر لەوبارەیەوە نووسرا و هەندێکیان پشتگیری نووسینەکەی من بوون و هەندێکیشیان بەپێچەوانەوە دژی بۆچوونەکانی من بوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆربەیان باش‌و

سوودمەند بوون و هەندێکیشیان تەواوکەر و ڕوونکەرەوەی فیکرەی بابەتەکەی من بوون.

دواتر هەندێ لە هاوڕێیانم ئامۆژگارییان کردم کە بیکەم بە کتێبێکی سەربەخۆ و درێژتر و قووڵتر فیکرەکە ڕوون بکەمەوە.

هەروەك کتێب لە بابەت باشترە و زیاتریش ئەمێنێتەوە، ئا بەو جۆرە ئەم کتێبە هاتە ئاراوە و لە خوا داواکارم سوودمەند بێت و پەیامی زانستی خۆی بگەیەنێت و بیخاتە سەر ملۆی چاکەکانم نەك بەپێچەوانەوە.


نووسەر

عبدالله المالکی

Malki98@gmail.com

# بەشی یەکەم

# ( ئەصڵی بیرۆکەکە )

ئەمەش لە چوار بەشدا خۆی دەبینێتەوە:

١ـ شەریعەتی ئیسلام باڵاترین سەرچاوەیە.

٢ـ مانای (جێبەجێکردن)ی شەریعەت.

٣ـ مانای سەروەری گەل ـ السیادة ـ.

٤ـ گەل ـ الأمة ـ ئەصڵە.

## یەکەم: شەریعەتی ئیسلام باڵاترین سەرچاوەیە

ـ ١ـ

حوکمکردن بە شەریعەتی ئیسلام و پابەندبوون بە سەرچاوەگرتنیەوە بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیسلام، یاساگەلێکی جێگیر و نەگۆڕی شەریعەتی ئیسلامە.

نەك ئەوەندە، بەڵکو جێبەجێکردنی بەشی دووەمی شایەتوومانە کە (أشهدُ أنَّ محمداً رسول الله)یە، ئەوەش مانای ئەوەیە کە واجبە لەسەرمان ملکەچ و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بین لە هەموو فەرمان و قەدەغە و هەواڵدانەکانی دا حوکم بە شەریعەتەکەی بکەین و باوەڕمان وابێت کە لە نهێنی و ئاشکرادا پابەندبین پێوەی.

ئەمەش بە بەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾[1]، واتە: پێغەمبەر هەر فەرمانێکتان بەسەردا ئەدات گوێڕایەڵ بن و هەر شتێکیشتان لەسەر قەدەغە ئەکات وازی لێ بهێنن و مەیکەن.

یان خوای عزوجل ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ * قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ

[1] الحشر: ٧.

فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾[1]، واتە: بە موسڵمانان بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ، شوێنی من بکەون، خوا خۆشی ئەوێن و لە تاوانەکانیشتان خۆش ئەبێت و خوا زۆر لێبوردەو بەبەزەییە، وە پێشیان بڵێ گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بن و ئەگەر وایان نەکرد و پشتیان هەڵکرد ئەوا خوا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.

کەسی موسڵمان ئەگەر فەرمانێك لەلای سەلمێنرا کە فەرمانی خوا و پێغەمبەرە، ئیتر هەڵبژاردنی بۆ نییە، کە مادەم موسڵمانە و شایەتی خوایەتی خوا و پێغەمبەرێتی موحەممەد دەدات، دەبێت گوێڕایەڵ بێت.

وەك پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً﴾[2]، واتە: سوێند بە پەروەردگارت، نەخێر باوەڕناهێنن هەتا هەموو ناکۆکییەکانیان نەگێڕنەوە بۆ لای تۆ، لەتۆ چارەسەر وەرنەگرن و پاشانیش لە ناخەوە بە حوکمەکەی تۆ رازی بن و ملکەچی فەرمانەکان بن.

یان ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾[3]، واتە: هیچ پیاوێکی باوەڕدار و هیچ ژنێکی باوەڕدار بۆیان نییە سەرپشك بن لە گوێڕایەڵیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەیدا کاتێ فەرمانێکیان دەکرد بۆیان.

پاشان شەریعەت وەك بیروباوەڕ پێویستە لەسەر تاکی باوەڕدار چ پیاو بن یا ژن گوێڕایەڵی بن و جێبەجێی بکەن، چ لەسەر ئاستی تایبەت: ئاستی

---

[1] آل عمران: ٣١ـ ٣٢.

[2] النساء: ٦٥.

[3] الأحزاب: ٣٦.

پابەندی خۆڕسکی تاکی موسڵمان، یان لەسەر ئاستی گشتی: ئاستی پابەندبوونی یاسایی لە فەزای گشتییدا، فەزای دەوڵەت لە کۆمەڵگەی موسڵماندا، بۆ تەئکیدکردن لەسەر ئەوەی کە ئەمە لە ئیسلامدا ئەصڵێکی گەورەیە، ئایەتی زۆر لە قورئاندا بەدی ئەکەین، وەك خوای عزوجل ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، گوێڕایەڵیی خوا بکەن، هەروەها گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەشی بکەن، دوای ئەویش بە قسەی فەرمانڕەواکانتان بکەن، ئەگەر لە شتێکیشدا ناکۆکیتان تێکەوت، بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی گەر باوەڕتان بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، ئەمەش بۆ ئێوە باشترە و جوانترین مانایە.

یان خوای گەورە لە سورەتی (النساء)دا ئەم راستییە دووپات ئەکاتەوە و لە سێ ئایەتی یەك لەدوای یەکدا وەسفی ئەوانە ئەکات کە بە شەرعی خوا حوکم ناکەن بەوەی کە کافرن، فاسقو لەسنوور دەرچوون و زاڵم و ستەمکاریشن، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ * وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ * وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعَيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ * وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ

[1] النساء: ٥٩.

الإِنجِيلِ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فِيهِ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[1].

یان له ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ﴾[2]، واته: له هەر حوکمێکدا جیاوازیی کەوتە نێوان رایەکانتان حوکمەکەی بگێڕنەوە بۆ لای خوا، واته وەڵامی گونجاوتان دەست ئەکەوێت.

یان ئەفەرموێت: ﴿أَفَغَيْرَ اللّهِ أَبْتَغِي حَكَماً وَهُوَ الَّذِي أَنَزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً﴾[3]، واته: ئایا ئەی بێ باوەڕان ئێوە ئەتانەوێ له من کە بێجگە له خوا کەسی تر بکەم بە حەکەم و داوەر و کێشەکانمی بخەمە بەردەست بۆ چارەسەری، لەکاتێکدا پەروەردگارتان کتێبێکی تێروتەسەلی بۆ ناردوون چارەسەری هەموو کێشەکانی تێدایە.

یان فەرموویەتی: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[4]، واته: ئایا ئەیانەوێ بەیاسا و حوکمی سەردەمی نەفامی حوکمیان بکرێت، دەی باشە کێ له خوای گەورە باشتر و جوانترە له دەرکردنی حوکمدا ئەگەر باوەڕیان بەخوا هەیە؟

یان فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً﴾[5]، واته: یا ئەو کەسانە نابینی کە خۆیان

---

[1] المائدة: ٤٤- ٤٧.

[2] الشورى: ١٠.

[3] الأنعام : ١١٤.

[4] المائدة: ٥٠.

[5] النساء: ٦٠.

به باوەڕدار دەزانن بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتووەتە خوارەوە، کەچی لە هەمانکاتدا ئەیانەوێت حوکم بە تاغووت بکەن ـ واتە غەیری بەرنامەکەی خوا ـ لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێکراوە، کە باوەڕیان پێی نەبێت و حوکمی پێ نەکەن، چونکە شەیتان ـ بە نەفرەت بێ ـ ئەیەوێ بە جۆرێ گومڕایان بکات ـ کە زۆر دووریان بخاتەوە لە بەرنامەی راستە رێگای پەروەردگار، ئەمەو چەندان دەقی تر.

کەواتە بەرنامەی جێبەجێکردنی شەرع و گەڕانەوە بۆ حوکمی شەرعی واجبە لەسەر یەکەیەکەی موسڵمانان و ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەنەویستەکان.

ئەمەش بە جۆرێکە کە پێچەوانەکەی جێگای قەبوڵ نییە لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا.

هەر بە موسڵمانبوونی موسڵمان واتە ملکەچبوون بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی کە پێکەوە شەریعەتی ئیسلام پێك ئەهێنن.

لە روانگەی عەقڵ و ژیریشەوە ناگونجێت موسڵمان خۆی بە موسڵمان بزانێت و لە هەمانکاتیشدا باوەڕی بە پابەندبوون نەبێت بە شەریعەتی ئیسلامەکەیەوە، مەگەر لەیەك حاڵەتدا نەبێت ئەویش نەشارەزایی رەها و دەربارەی ئیسلام لەو کەسەدا بێتەدی کە زاناکان ناویان ناوە ـ الجهل المطلق ـ.

-٢-

وەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، بنەمای ـ پابەندبوونی زۆرەملێ بە شەرعەوە پابەندبوونی تاکەکەسی دەگرێتەوە، کە بریتییە لە دەستگرتنی موسڵمان لە ژیانی رۆژانەیدا و لە هەموو تایبەتمەندی و گشتییەکانیدا بە شەرعەوە، بە پاڵنەری خۆیی و ئیمانی، بەبێ هیچ زۆر لێکردنێکی دەرەکی.

هەروەها لەگەڵ پابەندبوونی تاکەکەسیدا پابەندبوونی دەستەجەمعیش دەگرێتەوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە کۆمەڵی موسڵمانان ئیتر با لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی ئیسلامیدا بێت یان لە چوارچێوەی کرداری مەدەنی سەربەخۆ لە دەوڵەتدارییدا بێت.

ئەمەش پاڵپشتی سەرچاوەی بەها و بەرنامەی ئیسلامە لە هەموو یاسا جۆربەجۆرەکاندا: چ لە بواری سیاسی یان یاسادانان یان دادوەری یا ئابووری یان زانستی و رۆشنبیری و لەو جۆرانە.

کەواتە بنەمای ـ پابەندبوون بە شەرعەوە ـ لە دیدگای ئیسلامییەوە بنەمایەکی خۆیی و تاکە کەسی نییە کە لە چوارچێوەی تاك نەچێتە دەرەوە، هەروەك چۆن عەلمانییەکان وای بۆ ئەچن.[1]

بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا بەرنامەیەکی دەستەجەمعی و کۆمەڵگەییە و سەرجەم موسڵمانان پێکەوە بە رەوشتی رۆژانەی خۆیان بەرجەستەی

---

[1] لە کوردستانی باشووری خۆشماندا ـ بە داخەوە ـ هەوڵی زۆر دراوە تا ئیسلام لە جێبەجێکردنی چەند طقوساتێکدا تەسك بکرێتەوە و وتوویانە: (ئایین بۆ تاك بۆ دیموکراتی بۆ خەڵك).

ئەکەن. بە مانای ئەوەی کە ئیسلام تەنها کۆمەڵێ یاسا و ئەحکامی ئایینی ڕەوشتی نییە کە تاکەکان پابەندبن پێوەی.[1]

بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا هەروەها کۆمەڵێ حوکمی شەرعی یاسایی دیاریکردنی مافەکان کە پەیوەستە بە ئیشوکاری گشتییو بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەی بەشەرییەوە. کۆبوونەوەی سیاسی ئیسلامی، وەك هەموو کۆبوونەوەیەکی سیاسی دیکەی بەشەری پێویستی بە بوونی دەسەڵاتە، دەوڵەتە. بوونی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئیسلامدا داواکارییەکی پێویستی شەرعییە بنەمای کۆبوونەوەی سیاسی بەشەری ئەیسەپێنێ، چونکە بوونی دەسەڵات لقێکە لە وجودی کۆمەڵ بوونە بەشەرییەکە و ئەو ئەتوانێ هەوڵ بدات بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کۆمەڵە بەپێی ڕوانین و سەرچاوە و بەرژەوەندییەکانی.

کاتێ دەسەڵات دروست ئەبێت، لە ناوچەی کۆبوونەوەی سیاسی ئیسلامی، شتێکی سروشتییە کە بنەمای شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەی ئەو دەسەڵاتە بێت و دەوڵەت پشتی پێ ببەستێت، ئەمەش شتێکی ڕاستییە بەپێی کۆبوونەوەی بەشەری دەبێ وابێت.

"دەسەڵات بەپێی ئەم تێڕوانینە، ئیتر با بەشێك نەبێت لە فەرمانەکانی ئیسلام، فەرمانێکی بنەڕەتییە بۆ بەرپابوونی، ئەمەش دەچێتە ریزی هۆکارەکان نەك ریزی مەبەستە شەرعییەکان - المقاصد - و بەرپاکردنی دەوڵەت خۆی دروست دەبێت و پێویست ناکات دەقێك لەلایەن خوا و

---

[1] لەوانەیە ئەم قسەیە زۆرێك لە ئاینەکانی جیهان بگرێتەوە، بەڵام ئەوەی بچووکترین دراسەو خوێندنەوەی بۆ ئیسلام هەبێت ئەزانێ کە هاتووە هەموو جومگەکانی کۆمەڵگە ڕاست بکاتەوە و لە یاسای پڕ لە داددا ڕێکیان بخات.

پێغەمبەرەوە پشتگیریی بکات، چونکە سوننەتی کۆمەڵگە و کۆمەڵ بوون ئەوە پێویست ئەکات، بەڵکو ئەوەی پێویست بە بوونی دەق ئەکات گرەنتییە بنەڕەتییەکانە، لەوەی کە ئەو دەوڵەتە لە ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی لانەدات: کە (بەرپاکردنی دادپەروەری)یە وەك فەرمانکردن بە راوێژکردن ـ شورا ـ و یەکسانی و بڵاوکردنەوەی سامان و رێگرتن لە دەسەڵاتداران کە سامانی گشتی بە ناڕەوا بخۆن و ناچارکردنی هەموو گەل ـ ئوممەت ـ بەتایبەت زاناکانیان ـ کە لەبەر رەزامەندیی خوا چاودێر بن بە بنەمای (الحسبة) کار بکەن". [1]

ئەم تێڕوانینە بۆ دەسەڵات لە ئیسلامدا، بەوەی کە فەرمانێکی کۆمەڵایەتی پێویستە، هەڵوێستی مامناوەندەو گونجاوە لە نێوان رای عەلمانییە سیکۆلارەکان کە رەدی ئەکەنەوە ئیسلام هیچ پەیوەندییەکی بە دەوڵەت و حوکمڕانییەوە هەبێت و لە نێوان رای تاقمێك لە موسڵمانان کە ریزپەڕانە بۆی چوون ـ غلو ـ ئەڵێن بوونی دەسەڵات لە ئیسلامدا فەرمانێکی ئایینییە وەك نوێژ و رۆژوو و نیگایش لەسەر ئەمە هاتووە.

بەڵکو رای دروست و مامناوەند ئەوەیە کە جمهوری زانایانی موسڵمان لە کۆن و نوێدا بۆی چوون، کە ئەڵێن بوونی دەسەڵات فەرمانێکی کۆمەڵایەتییە بۆ پاراستنی ئایین و چاودێری کاروباری دنیایە. [2]

لەبەر ئەم هۆیەشە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئان هاتووە، فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هەموو موسڵمانان کە دەبێت پابەندی نیگا ـ وەحی ـ بن لە هەموو کاروبارێکی ژیانیاندا.

---

[1] راشد الغنوشي، الحريات العامة في الدولة الاسلامية، ص٩٢.

[2] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

ئەی ئایا قورئان بۆ ئەم مەبەستە نەهاتووە؟ ئەی ئایا سوننەت و ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵگەیەکی تیۆری و پراکتیکی نییە بۆ ژیان لە ژێر سایەی شەریعەتدا؟

ئەی ئایا چ مانایەك ئەمێنێتەوە بۆ وەحی پەروەردگار کە قورئانی کەریمە ئەگەر دووربخرێتەوە لە رێکخستنی ژیانی رۆژانەی خەڵکی و بەڵکو تەنها ئامادەییەکی رەمزی لە ناو دڵەکاندا و رەوشتی تاکەکاندا هەبێتو بەس؟

ئەی ئایا چ مانایەك ئەمێنێتەوە بۆ موسڵمانەتی موسڵمانان، ئەگەر لەناو دڵو دەروونیاندا سەرچاوە ئاینییەکان یان خۆش بوێت، بەڵام لە ژیانی رۆژانەیدا حوکم بە سەرچاوەگەلێکی تر بکەن، کە لە زۆر رووەوە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە؟

جیاوازی خستنە نێوان ئاستی تاك و ئاستی کۆمەڵگە لە مەسەلەی پابەندبوون بە شەرعەوە، وتەیەکە دژە لەگەڵ مەنتیقی کۆمەڵگەی بەشەری، چونکە ئەو کۆمەڵە مرۆڤە پێکەوە ژیان بەسەر ئەبەن ـ ئیتر با هەر پێناس و فەلسەفە و جۆرە بەها و رەوشتێکیان هەڵگرتبێت ـ لە کۆتاییدا بریتییە لە لە پێکهاتەیەکی ئەو تاکانە. ئەو تاکانە ـ گریمان ـ هەموو تاکێك لەوانە ماڤی ئەوەی هەبێت لەلایەنی تاکەکەسییەوە دەست بگرێت بەو رێگا و رێبازانەی باوەڕی پێیەتی، لە ئاکامدا ئەم پابەندبوونە پێچەوانە ئەبێتەوە و کار لە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکە ئەکات، کە لە کۆی تاکەکان دروست بووە. ئەوانەی کە هەمان بۆچوون و بیرکردنەوەیان هەیە بۆ ژیانو بوون و کاری مرۆڤ.

ئەمە مانای ئەوەیە ئەو یاسا و بەرنامەیەی کە کۆمەڵگە پەیڕەوی ئەکات لە ئاکامدا ئەگەر شیی بکرێتەوە تەنها ئەو یاسا و بەرنامانەیە کە تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە باوەڕیان پێیەتی، ئیتر با تاکەکانی خاوەنی جۆرەها

سەرچاوە و پاشخانی ئایینی، یان هەر شتێکی تر بن، ئەو هەمەڕەنگی و هەمە جۆرییەیان لە بیرکردنەوە و یاسا و رەوشتییان دا ـ شتێکی سروشتییە ـ کاریگەریی هەیە لەسەر پێناسی ئەو کۆمەڵگەیە.

ئەمە بێگومان لەکاتێکدایە (کە ئەو کۆمەڵگەیە ئازاد بن و خاوەنی ئیرادەی سەربەخۆی خۆیان بن). بە مانایەکی تر، هەندێ کۆلکەی هاوبەش لە رەوشت و بەها هەیە لەنێوان تاکەکانی هەر کۆمەڵگەیەك و لەو روانگەیەوە پێکەوە ئەتوانن بگەنە رێککەوتنێکی سیاسی نێوان خۆیان کە ژیانو بەرژەوەندی و پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانیان بەڕێوەبەرێت.

دەی شەریعەتی ئیسلامی و جێبەجێکردنی هەر ئەم رێڕەوە پیادە ئەکات ئیتر با ئەو کۆمەڵگەیە خاوەنی پێناسی جیاجیاو کەلتووری خۆیان بن و دواتر روونتری ئەکەینەوە. مەبەست لە ئەو جیاکردنەوە توندەی نێوان تاك و کۆمەڵگە لە بواری پابەندبوون بە بەها و رەوشتەوە ـ وەك چۆن لە ئەدەبیاتی عەلمانیەکاندا هاتووە ـ زیاتر لە خورافە ـ دەچێت، چونکە لە روانگەی سایکۆلۆژییەوە ناکرێت کەسێك بکەین بە دوولەتەوە، لەتێکی لە بۆشایی تایبەتدا بێتو لەتێکی تری لە بۆشایی گشتییدا بێت.

بەجۆرێ لەتی یەکەمی دەست لە ملی بەها و رەوشت و بیروباوەڕێك بێت، وە لەتەکەی تری دژ و پێچەوانەی ئەم بەها و بیروباوەڕانە بێت. چونکە مرۆڤ هیچ کات ئەو قەناعەت و بیروباوەڕ و قیەمانەی باوەڕی پێیەتی لێی جیانابێتەوە و بەردەوام لەگەڵیدایە چ لە ناخی تاکەکەدا یان لەناو کۆمەڵگەدا. لەبەرئەمەیە لە هەموو وڵاتانی دونیادا نابینی لە فەزای کۆمەڵایەتیدا یاساکانی خاڵی بن لە بەها و بیروباوەڕی ئەو نەتەوەیە، تەنانەت لە وڵاتە عەلمانییە توندڕەوەکانیشدا قیەم و بەهاکان ئەمێننەوە و

له کۆتاییدا تەعبیر له پێناسی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە ئەکات ئیتر با ئەو قیەمانە ئاینی بێ یان مرۆڤایەتی بێ یان کەلتووری ناوخۆیی بێت.

لەوانە کەسێك بپرسێت: ئەی ئەوە تا وڵات هەیە بە تەواوەتی سونبولە ئاینییەکانی پشتگوێ خستووە، یان هەوڵی داوە وڵات لە ئاین و ئایندارى رووت بکاتەوە؟

وەڵام: بەڵێ، چونکە حاڵەتێکی عەلمانی خەس لە تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا رەنگی داوەتەوە و شتێکی سروشتیی و کە لە دەوڵەتەکەشدا رەنگ بداتەوە. ئەمە بە مانای ئەوەی ناگونجێت کۆمەڵگەیەك کۆمەڵگەیەکی ئایینی بێت، لە هەمانکاتدا وڵات و دەستووری وڵات دوور بێت لە سونبولی ئایینی، ئەمە ئەگەر وڵاتێکی وا هەبێت کە بە تەواوەتی لە رەمزە ئایینەکان رووت کرابێتەوە. جارێکی تریش ئەمەوێ ئەو بڵێمەوە کە ئەم وتانەی من لێرەدا باسی ئەکەم بەسەر کۆمەڵگەیەکی ئازاددا دەچەسپێت کە دوارۆژی لەدەستی خۆیدا بێت بە پێچەوانەی کۆمەڵگە فەرامۆشکراوەکان، کە لە ژێر پێی ستەمکاراندا پلیشاوەتەوە و دووریش خراوەتەوە لە گۆڕەپانی سیاسی.

کە لەم کۆمەڵگەیەدا چینی زۆردار و حاکمی خۆسەپێن دەستی ئەڕوات و هەرئەویش پێناس و دەستووری وڵات دیاری ئەکات دوور لە ئەندامانی تری کۆمەڵگەکە.

هەندێك وا بیر ئەكەنەوە كە ئەم راپۆرتە رێگە خۆش ئەكات بۆ زۆرینە كە دەستەڵات قۆرخ كات بۆ خۆی لەسەر حسابی مافی كەمینەكان.

كە گوایە فەزای گشتی لە دەستوور و بەهاكاندا ناچەسپێت تەنها لەلای زۆرینەوە نەبێت، تەنها زۆرینە و بەس، گوایە ئەمەش سەرئەكێشێ بۆ كەنارگیركردنی پیناسی كەمینەكان و دان نەنان بە بوونی خۆی و مافەكانی و قەناعەتە قەومییەكانی. ئەمەش راست نییە، چونكە كەمینە لە كۆتایی شیكارییەكەدا پێكهاتەیەكە لە پێكهاتە جیاجیاكانی كۆمەڵگە، ئێ بەم پێیە دواتریش رۆڵێكی كاریگەر و بەرچاوی دەبێت لە دروستكردنی پێناسی كۆمەڵگەدا، بەڵام ئامادەگی و كاریگەرییەكەی لەلایەنی سۆسیۆلۆجییەوە بێگومان ناگاتە ئەوەی لە زۆرینە زیاتر یان هیچ نەبێت ئەوەندەی ئەو دەستی هەبێتو كاریگەریی هەبێت، ئەمەش شتێكی سروشتییە و بەشێكە لە سوننەتی كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. ئەوجا ئەوەش بزانین كە كاریگەریی و چالاكی مانای ئەوە نییە چەوسانەوە و دورخستنەوە و ستەمو بێبەشكردن لە مافە بنەڕەتییەكاندا بێت، یان دەستدرێژی بكاتە سەر تایبەتمەندییە تاكەكەسییەكان، بەڵكو مانای ئەوەیە دادپەروەری و یەكسانی لە نێوان پێكهاتەكانی كۆمەڵگەدا بەرجەستە بكەین بەپێی قەبارە و بوونیانەوە.

ئەوە ماوە بگووترێت كە هاوكاری و كۆبوونەوەی مرۆڤەكان لە كۆتاییدا نایەتەدی مەگەر لە داننان بە رژێمێكی یاسایی دیاریكراودا، ئەمەش لە ژێر رۆشنایی یاسایەكی دیاریكراودا لە ژێر رۆشنایی ئەو بەرنامە و بەها هاوبەشەدا و بۆ ئامانج و مەبەستێكی مرۆڤایەتی و هاوكاری كۆمەڵایەتی، لە

پاش ئەمە ژیانێکی ئیسلامی کە تیایدا فیکر و کردەوە یەکبگرن، یان بیردۆزە و پراکتیزە پێکەوە بن، ئەو کاتە پێویست دەکات دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی لە کردار و گوفتاردا حوکم بە کۆمەڵی بیروباوەڕ و بەهایەك بکات کە نیگای خوایی دەستنیشانی کردبێت.[1]

ئالێرەوە کۆچکردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگەی ئیسلامی هاتە کایەوە، لەسەر بنەماو مەبەستگەلێك کە ئەو کۆمەڵگەیە باوەڕی پێیەتی، ئەو ئامانج و مەبەستە سەرەتایی و ئەو قیەم و بەهایانە کرداری سیاسی بەرهەم هێنا، کە پێشتر تا ئەو کاتە مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیبوو.

لەسەر بنەمای گرێبەست و پێکەوەژیان و لێبوردنی ئاینی بەرپا کرا، ئەمەش لەسەر بناغەی سەربەستی دەستنیشانکردنی بیروباوەڕ و ڕێزگرتنی تایبەتمەندییەکانیان و پاراستنی مافەکانیان، بەجۆرێ کە سەربەستی ئاینی بەخشی بە جوولەکەکانی مەدینە تا شوێن ڕێنمایی و فەرمانی ئاینی خۆیان بکەون. دانی بەوەدا نا کە جوولەکە ئاینێکە و تایبەتمەندی بیروباوەڕ و کلتووری خۆیەتی کە جیایە لە ئوممەتی موسڵمانان، بەڵام لە هەمانکاتدا گەلێکن لەو گەلە سیاسییە کە بازنەکەی بەرفراوانە و ناوی (گەلی دەوڵەتە) ـ أمة الدولة ـ.

بەمانای ئەوەی وڵاتێکی فرە ئاینییە و تێکەڵ بوون و هاوکاری لە وڵاتە سیاسییەکەدایە، وەك چۆن دەستووری مەدینە دانی پێدا ناوە و دەڵێ: "وأنّ لليهود بني عوف أمة مع المؤمنين، لليهود دينهم وللمسلمين دينهم"[2]،

---

[1] لؤي صافي (العقيدة والسياسة معالم نظرية عامة للدولة الاسلامية) ل١٠٠.

[2] (مجموعة الوثائق السياسية)ی محمد حميد الله، ل٣٩ ـ ٤٧.

واتە جولەکەکانی بەنی عەوف گەلێکن لەگەڵ گەلی موسڵماناندا، وە جوولەکە ئایینی خۆی هەیە و موسڵمانانیش ئاینی خۆیان هەیە، دواتر نووسرابوو: "لهم ما للمسلمین وعلیهم ما علی المسلمین"[1]. واتە: جولەکە هەموو مافێکی موسڵمانانیان هەیە و ئەرکیشیان لەسەرە وەك چۆن لەسەر موسڵمانان هەیە.

هەروەك چۆن ئەو کۆمەڵگە سیاسییەی مەدینە توانی لەگەڵ دەستە و نەیارەکانیدا پێکەوە بژین کە هەموویان دژبوون بە سیاسەتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەوانە دووڕووەکان و عەرەبە دەشتەکییە بێباوەڕەکان و کەسانی تریش، ئەم پێکەوەژیانەی دەوڵەتی ئیسلامی دایهێنا کە پێشتر هیچی لە دەوڵەتەکانی ڕۆمو فارسو تەنانەت فیرعەونییەکانیش قبوڵیان نەبوو نەیار و دوژمنەکانیان لە ژێر سایەی حکومەتەکانیاندا بژین وەك چۆن حکومەتەکەی مەدینەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قبوڵی کرد. کەواتە پابەندبوونی کۆمەڵگەی موسڵمان بە پرەنسیپو بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی، هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی لە دەسەڵاتدا، ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت ستەمکردن و دوورخستنەوە و ماف پێشێلکردن بەرامبەر کەمایەتییەکانی تر جگە لە موسڵمانان بێتەدی، یان بێبەش بکرێن لە مافەکانیان یان وەك هاوڵاتی پلە یەك مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێت.

شەریعەتی ئیسلامی بنەما گشتییەکانی و ئامانجە لەبەرچاوگیراوەکانی، پارێزگاری و زامنی هەموو مافێکی کەمایەتییەکانی تر دەکات، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بواریش ئەکاتەوە بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگە ئیسلامییەکە ـ ئیتر با موسڵمانیش نەبن ـ گەر بیانەوێت دابەزنە ناو کایەکانی کۆمەڵگە و

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٨٩.

بیانەویَ جیَدەستیَك بنەخشیَنن، بیانەویَت ولاَت بنیات بنیَن و پەرەی پیَ بدەن.

ئەمە بە مەرجیَك قەبولَیان بیَت بژین لە ژیَر سایەی دەولَەتی ئیسلامیدا و دان بنیَن بە یاساکاندا، ئەوکاتە چ مافیَك بۆ موسلَمانە بۆ ئەوانیش هەیە و چ ئەرکیَکیش لەسەر موسلَمانە لەسەر ئەوانیشە. ئەمەش بە روونی لە دەستووری مەدینەدا دیارە کە پیَغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ مەدینەییەکانی نووسی و تیایدا هاتووە: "وأن من تبعنا من یهود، فان له النصرة والاسوة غیر مظلومین ولا متناصرین علیهم... وأن یهود بني عوف أمة مع المؤمنین، للیهود دینهم وللمسلمین دینهم". واتە: ئەوانەی لەگەلَمان ئەژین لە جوولەکەکان، ئەبیَ سەریان بخەین و هاوکارییان بکەین و ستەمیان لیَ نەکریَت و گەلەکۆمەشیان لیَ نەکەین،....و هتد.

ئەمە بۆ کەسانیَك فەراهەمکراوە کە موسلَمانیش نین، ئەی چی دەلَیَی بە موسلَمانیَك کە پیَچەوانەی قەناعەت و بۆچوونەکانی زۆرینەن؟ گومانی تیَدا نییە ئەوان مافی سەربەستی و دادپەروەری و یەکسانیان هەیە.

کەواتەپابەندبوون بە شەریعەت و یاساکانی ئیسلامەوە و سەیرکردنیان وەك بالآترین سەرچاوە بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکە، نە تەنها فەرمانێکی ئایینیە و بیروباوەڕ فەرزی ئەکات، بەڵکو هەروەها کارێکی گونجاو و لەبارە لەگەڵ مەنتیقی کۆبوونەوەی سیاسی (الاجتماع السیاسی).

یەك پرسیار ئەمێنێتەوە:

ئایا هەموو ئەو فەرمانانەی شەرع کە لەسەر ئاستی تاکی موسڵمان پێویستە و دەبێت بیکات، ئایا لەسەر ئاستی دەسەڵات و دەوڵەتیش هەر فەرزە لەسەری واتە لەسەر ئاستی یاسا؟

پرسیارەکە بەجۆرێکی تر بکەین:

ئایا هەموو حوکمە شەرعییەکان مەرجە بوونی دەسەڵات فەرزی بکات لەسەر موسڵمانان، بەجۆرێ کە پێویست بێت لەسەر تاکە تاکەی کۆمەڵگە جێبەجێکردنی لەلایەن یاساییەوە؟

یان هەندێك فەرمان پەیوەندی بە تاکەکانەوە هەیە، دەسەڵات هەبێ یان نەبێت ئەو لە بەردەمی خوا بەرپرسە لە ئەنجامدانیان، بەبێ بوونی هێز و زۆری دەرەکی؟

ئەی ئەگەر وایە، ئەو بەشە شەریعەتە کامەیە کە پێویستە جێبەجێ بکرێت لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا؟ ئەی ئەو بەشە شەریعەتە کامەیە کە لەسەر تاکە تاکەکانە جێبەجێی بکەن و لەبەردەمی خوادا وەك تاك پرسیاریان لێ ئەکرێ لەسەریان؟

ئەی ئایا ئەگەر شەریعەتی ئیسلام واجب بێ حوکم پێکردنی و جێبەجێکردنی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا، ئەی ئایا هەموو ئەو پاشماوە فیقهییە زۆرە بە هەموو مەزهەب و قوتابخانە جیاجیاکانیەوە ناوی ئەنرێ شەریعەتی ئیسلامی؟ پێویستە خاڵ بە خاڵ جێبەجێ بکرێت؟ ئەی مەبەست لە جێبەجێکردن چییە؟ ئەم جێبەجێکردنە چۆن ئەبێت؟

بە مانایەکی تر: ئەوا لە شەریعەتی ئیسلامی گەیشتین ئەی فیقهی جێبەجێکردنەکەی چۆنە؟ هەموو ئەم پرسیارانە لەم بەشەی دووەمدا گفتوگۆی لەسەر دەکەین.

دەمەقاڵەیەکی زۆر و ململانێیەکی سەخت دروست بووە لەم رۆژگارەدا لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەربارەی شەریعەت و شێوازی (جێبەجێکردن)ی شەریعەت. بەشێك لەم دەمەقاڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دابەشبوونەی کەوتووەتە نێوان چینە رۆشنبیر و سیاسییەکان، کە بوون بە دوو بەشەوە و ئەتوانین بڵێین یەکەمیان چینە پابەندەکەیە بە ئیسلامەوە کە بە (ئیسلامییەکان) ناودەبرێن.

دووەمیان چینە عەلمانییەکەیە کە مەرجیش نییە پابەند نەبێت بە ئیسلامەوە بەڵام ئەو ئیسلام بە گشتگیر و شمولی نابینێت وەك چۆن ئیسلامییەکان بۆی دەڕوانن.

بەشێك لەم دەمەقاڵە و پێکدادانە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو خراپ حاڵیبوونە لە مانا و واتای شەریعەت و جێبەجێکردنی شەریعەت، ئیتر چ لەلای ئەوانەی بەرگریی لە شەریعەت ئەکەن و داوای جێبەجێکردنی ئەکەن، یان ئەوانەی کە دژی ئەم ئامانجەن و لێشی ئەترسن.

بەڕاستی لەم ناوەندەدا هەندێ بۆچوون و تێگەیشتن هەیە کە کورت بینە و شێواوە و بە هەڵە لە واتای شەریعەت و جێبەجێکردنی شەریعەت گەیشتوون، هەر لە ئاکامی ئەمەوەیە کۆمەڵێ کێشە و ململانێی زۆر دروست بووە، کە ئەتوانین لە رێگای تێگەیشتنمان بەشێوەیەکی دروست لە شەریعەت و ناوەرۆکی شەریعەت کاڵیان کەینەوە.

ئەمەی باسم کرد زانای گەورە و مەبەستگیر دکتۆر ئەحمەد رەیسوونی لە کتێبی (الفكر الاسلامي والقضايا المعاصرة)دا بە وردی باسی لێوە کردووە.

راستییەکەی ئەوەی بە دواداچوون بکات بۆ ئەو گووتارە پڕ لە ململانێیەی هەردوولا، کە دەربارەی داواکاری جێبەجێکردنی شەریعەت یان لە کارخستنی لە نیوەی سەدەی رابردووەوە تا ئێستا بۆی دەرئەکەوێت کە تێبینییەکەی رەیسوونی لە شوێنی خۆیدایەتی.

زۆرێ لە راوبۆچوونەکان دەربارەی واتای شەریعەت و چۆنیەتی جێبەجێکردنی لە ژێر سایەی دەوڵەتەکاندا شێواوە و بە هەڵە بەلاڕێدا براوە، هەرئەوەش وایکردووە گفتوگۆکان پەکیان کەوتووە و بازنەی ململانێکەش فراوان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەتوانرا بازنەکەی تەسك بکرێتەوە لە گوتار و بانگەشەیەکی دیاریکراودا، ئەویش ئەوەیە بۆیە بەهاکانی شەریعەتی ئیسلامی رەد ئەکاتەوە چونکە ئەو لە بنەڕەتەوە کێشەی لەگەڵ ئەسڵی ئاینەکەدا هەیە.

بەڵام ئەوەی بە وردی لەو گفتوگۆ و بێنەر وبەردە فراوانە ورد بێتەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئەنجامدراوە بۆی دەرئەکەوێت کە:

بەڵام چینێکی زۆر فراوانی کۆمەڵگە شەریعەتی ئیسلام ڕەدئەکەنەوە لەبەر باوەڕنەبوونیان بە ئەسڵی دینەکە نییە، بەلام تێگەیشتن و واتایەکی تایبەتی دەربارەی واتای شەریعە رەد ئەکەنەوە کە لەو باوەڕەدان هەڵەیە.

چۆنیەتیەکی دیاریکراو لە شێوازی جێبەجێکردنی شەریعەت رەد ئەکەنەوە کەوا گومان ئەبەن هەڵەیە و لەگەڵ دەوڵەتی شارستانی نوێدا یەك ناگرنەوە.

ئەم توێژەی دووەم رۆژ لە دوای رۆژ لە زیادبوون و فراوانبوونی بەردەوامدان، لە ژێر سایەی کرانەوە و پیاچوونەوەی بیروبۆچوونەکان و ئەو گۆڕانکارییە گەورە مێژووییانەی کە ناوچەکە پیایدا تێپەڕی.

ئا لێرەوە گرنگی زانینی واتای (جێبەجێکردن)ی شەریعەت و سەرلەنوێ پێداچوونەوە و دووبارە دارشتنەوەی بەپێی ئامانجەکانی وەحی و بەپێی دەقە گشتییە شەرعییە جێگیرەکانمان بۆ دەرئەکەوێت، بەتایبەت لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە ریشەیی و قووڵەی واتای دەوڵەتداری نوێ و دروستبوونی مانای کۆمەڵگەی مەدەنی ئازاد، وە هاتنە کایەی یاسای جیهانی و سروشتی یاسای نێودەوڵەتی، وە گۆڕانکارییە گەورە مێژووییەکان کە ناوچەکە پیایدا تێدەپەڕێت.

ئەمە و چەندان کێبەرکێی تر کە پێویست ئەکات سەرلەنوێ واتا و مەفهوومی (جێبەجێکردن)ی شەریعەت دابڕێژرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم واقیعە نوێیەدا یەکبگرنەوە و وەڵامی پرسیارەکانی سەردەم بداتەوە و ئەو گۆڕانکارییە گەورە جیهانییە مێژووییە لەخۆ بگرێت.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە چەمکی زاراوەی (جێبەجێکردن)ی شەریعەت، زاراوەیەکی شەرعی یان ناوێکی ئایینی نییە کە تێگەیشتنێکی دیاریکراوی لەلایەن وەحییەوە بۆ دانرا بێت، کە گوایە پێویست بێت پێوەی پابەند بین و نەتوانین لێی لابدەین، بەڵکو دروشمێکی مێژوویی دروستکراوە و بارێکی سیاسییە لە دوای نیوەی سەدەی بیستەم هاتۆتە کایەوە بەتایبەت دوای رمانی خەلافەتی عوسمانی و دەرچوونی داگیرکەران و دروستکردنی دەوڵەتە عەرەبییە نوێیەکان کە بوونە هۆی لابردن و سڕینەوەی هەندێ لە حوکمە شەرعییەکان.

- ٢ -

پێدەچێ زۆربەی ئەو هۆکارانەی بوون بە هۆی ئەم ناحاڵییبوون و لێتێکچوونە دەربارەی واتای (جێبەجێکردن)ی شەریعەت، لەنێو گوتاری ئەو ئیسلامیانەدا خۆی دەبینێتەوە کە دروشمی جێبەجێکردنی شەریعەتیان هەلگرتووە و مەبەستیان تەنها سزاکان و داری حەدە، یان پۆشتەیی و باڵاپۆشی سەپاندن بەسەر ئافرەتاندا، لەناو گووتارەکانیاندا ئەم دوو مەسەلەیە زۆر خەست ئەکەنەوە لەسەر حیسابی ناوەرۆکی مەزنی جێبەجێکردنی شەریعەت کە خۆی دەبینێتەوە لە ـ دادوەری کۆمەڵایەتی ـ کە لابردنی ستەم و سەرکەشی و ناڕەواییەکانە لەسەر کۆمەڵگا.

بینا لەسەر ئەم لادانە لە واتای (الشريعة)دا، هەر دەوڵەتێك هەستێ بە جێبەحێکردنی سزای حەدەکان، یان بە لایەنی کەمەوە پابەندبوونی بە شەریعەتەوە رابگەیەنێت بەبێ رەچاوکردنی ناوەرۆکی واتای شەریعەت، وە ئافرەت ناچار بکات بە جلو بەرگێکی تایبەت و هەندێ حوکمی ـ وەك لە ماڵ دەرنەچوون و هتد ـ کە زۆربەشیان کۆمەڵە مەسەلەیەکی فیقهی فەتوایین کە زۆر جێگای ڕای جیاواز و خیلافن لە ناو زانایانی موسڵماندا.

لەم حاڵەتەدا و بەم شێوە کەمو کوڕەی جێبەجێکردنی شەریعەت کەچی بەو دەوڵەتە ئەڵێن فلان ولات شەریعەت جێبەجێ ئەکات و ولاتێکی ئیسلامییە! ئیتر با ئەو ولاتە ستەمکار و گەندەڵیش بێت، دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەرپا نەکات و سەربەستی گشتی بۆ کۆمەڵگە فەراهەم نەهێنێت، ئیتر ئەو دەوڵەتە دیکتاتۆریەت و سەرکوتکردنی میللەت جێبەجێ بکات و دەستدرێژیی بکاتە سەر مافی تاکەکانی کۆمەڵگە و تایبەتمەندی و سەربەستییەکانیان قۆرخ بکات.

بەردەوام نەیارەکانی زیندانی دەکات و لەوانەشە بەپێی یاساش بۆ خۆی حەڵاڵ بکات و بیانکوژێت و خوێنیان بڕێژێت، هەروەها دەست بخاتە پارەی گشتی و دزی لێ بکات و لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەردەوام لە فەشەلی سیاسی و ئیداری و داراییدا بێت و هەوڵ بدات نەخوێندەواری بە بەرنامە لەناو گەلدا بڵاو بکاتەوە، ئیتر چ لە بوارەکانی زانست و ئابووری و خزمەتگوزارییەکان، کۆسپیش بخاتە رێگەی گەشە و ئاوەدانی وڵات لە بوارەکانی (هەستانەوە و گەشەسەندن و خۆشگوزەرانی) ئەمانە و هەتا پێشێلکارییەکان و ئەمەش لەکارخستن ولەباربردنی ئامانجی سەرەکی و گەورەی هاتنی شەریعەتی ئیسلامە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو وڵاتە ناوی دەنێن جێبەجێکاری شەریعەتی ئیسلامی، تەنها لەبەرئەوەیە کە هەندێ لە سزاکانی ئیسلام ـ بێگومان بە سەقەتی ـ جێبەجێ ئەکات و پۆشتەیی بەسەر ئافرەتاندا فەرز ئەکات!!

ئیتر گرنگ نییە کە ئەو هەموو پێشێلکارییە بکات و ئامانج و مەبەستە گەورەکەی کە ئیسلامی لە پێناودا هاتووە لەکاربخات، وەك: (دادپەروەری، دەستپاکی، پاراستنی مافەکان، دابینکردنی ئازادی و سەربەستییەکان، حیکمەت و لێزانی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات لە بواری سیاسەت و حوکمڕانیدا). ئەمانەی کە باسمکرد وەك سەر و دڵ و گیان وایە بۆ شەریعەتی ئیسلامی، ئیتر لای هەندێکیش پێیان وایە قەیناکا ئەم شتانە ئەنجام نەدات و نەکردنی ئەم کارانە تەنها کەمتەرخەمییە و هیچی تر!!

دەبێت رێگای ئامۆژگاری نهێنی و قسەی خێر و ئامۆژگاری سوڵتانەکان بگرینەبەر، لەلایەن میللەتیشەوە تەنها دەبێت ئارام بگرێت و چاوەڕوانی پاداشتی خوایی بکات لەسەر ئەو زوڵمانە و بیداتە دەستی خوا!!

دڵی خۆیشیان بەوە خۆش ئەکەن کە دەڵێن: "کما تکونوا یولی علیکم"، واتە: خۆتان چۆن بن سەرۆکەکانیشتان هەروا ئەبن. ئەمەش بەداخەوە گەورەترین خەلەلە لە تێگەیشتن لە چەمکی واتای (شەریعەت)!

بۆ ئەوەی گەورەیی و قوڵی ئەم ناتەواویی و خەلەلەمان بۆ روون ببێتەوە، با نموونەکەی پێشوو پێچەوانە بکەینەوە. با وا دابنێین وڵاتێکی تری موسڵمانان بە نموونە بێنینیەوە، ئەم وڵاتە سنوورەکانی شەرع جێبەجێ ناکات لەناو یاساکانی سزاداندا هەڵی گرتوون، ئافرەتیشی ناچاری باڵاپۆشی نەکردووە، بەڵام ئەم وڵاتە دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەرپا کردووە، گوێنەداتە جیاوازییە چینایەتی و رەگەزی و مەزهەبی و فیکرییەکان، یاسا بە جوانی باڵادەستە لەو وڵاتەدا، وە سەربەستییە گشتییەکان پارێزراوە، رێز لە شکۆی مرۆڤەکان گیراوە، تایبەتمەندیی تاکەکان پێشێل ناکرێت، هەروەك خاوەنی حکومەتێکی هەڵبژێرراوە لەلایەن گەلەوە و لە رێگەی شوورا و رەزامەندییەوە، گەلیش نوێنەریان هەیە (پەرلەمانتار) کە مومارەسەی چاودێری و لێپیچینەوە لە حکومەت ئەکات، ئەم دەوڵەتە وەك ئەرکی سەرشانی بەردەوام لە ئاوەدانکردنەوەی وڵاتدایە، گەشە و پێشکەوتن دەدات بە سەرجەم بوارەکانی زانست و تەندروستی و ئابووری و بەرزکردنەوەی دەستمایە ـ دخل ـ ی تاکەکانی کۆمەڵگا، لەگەڵ ئەمانەشدا بەردەوام بەرەوپێشچوون دەکات لە دەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و سەندیکا و رێکخراوەکان لە گشت بوار و تایبەتمەندییەکاندا، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە کۆمەڵگە بواری بەشدارییکردنی هەبێت و بە هەموو ئازادییەکەوە بەردەوام لە پێشخستنیدایە، ئەمەو سەرجەم ئەو داواکاریو ئامانجانەی ـ کە

شەریعەتی ئیسلام ـ لە پێناویدا هاتووە لەم وڵاتەدا هاتۆتەدی کە ئەمڕۆ بەو دەوڵەتانە ئەوترێ ـ کۆمەڵگەی گەشەسەندووی ئازاد ـ.

لە بەردەم ئەم دوو نموونەی دەوڵەت و کۆمەڵگەیەی باسمانکرد، بە ئارامی و لەسەرخۆییەوە ئەم پرسیارە ئەکەین: ئایا کام لەو دوو دەوڵەتە نزیکترە لە رۆحی (شەریعەت) لە بواری جێبەجێکردندا؟ ئایا کامیان شەریعەتیان لەکارخستووە؟ ئایا ئەو دەوڵەتەیان کە تەنها لە یاسای سزاکاندا حەدەکانی شەرع جێبەجێ ئەکات و باڵاپۆشی فەرز بکات، لە بەرامبەریشدا ستەمکارە، گەندەڵە، دواکەوتووە، نەخوێندەواری و زوڵم و ستەمکاریی تێدایە، کە بە هۆیەوە بەها باڵاکان و مەبەستەکانی شەرعی لەبار بردووە. یان ئەو وڵاتەی دووەم کە هەموو بەها باڵاکان و مەبەستە گەورەکانی شەریعەت تیایدا هاتۆتە دی تەنها ئەوەیە سزای حەدەکان جێبەجێ ناکات و باڵاپۆشی نەسەپاندووە بەسەر ئافرەتاندا؟ دەی زانا و پێشەوا (ئیبن تەیمیە) رەحمەتی خوای لێ بێت لە پێشتردا وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە و وتە بەناوبانگەکەی لەوبارەوە دەربڕیوە و دەڵێ: "کاروباری خەڵکی رێكو دروست ئەبێت لەگەڵ بوونی دادپەروەرییدا هەرچەندە تاوانباریشی تێدا بێت".

زیاتر لەو دەوڵەتەی کە بە زوڵم و ستەم بەڕێوە دەچێت هەرچەند تاوانباریشی تێدا بێت، لەبەرئەمەشە وتراوە: خوای پەروەردگار دەوڵەتی پڕ لە دادپەروەری بەرقەرار و راوەستاو ئەکات با بێباوەڕیش بێت، دەوڵەتی ستەمکار راوەستاو و بەرقەرار ناکات با موسڵمانیش بێت.

ئەشڵێن دەسەڵات بەردەوام دەبێت لەگەڵ دادپەروەری و بێ باوەڕی دا، بەڵام بەردەوام نابێت لەگەڵ ستەمکاری و ئیسلامەتیدا.

دادپەروەری بەرنامە و یاسای هەموو شتێکە، ئەگەر کاروباری دنیا دادپەروەری تێدا بەرقەرار بوو، ئەوە راوەستاو دەبێت ئەگەر لە قیامەتیشدا مایەپووچ و بێبەشیش بێت. وە هەرکاتێ لەسەر بنەمای دادپەروەری بەرقەرار نەبوو، ئەو دەوڵەتە راوەستاو نابێت ئیتر با خاوەنەکەی ئەوەندە باوەڕدار بێت کە قیامەتی مسۆگەر کردبێت".[1] بەدوای ئەویشدا قوتابییەکەشی (ئیبن قەییم) دێت ئەم راستییە دووپات ئەکاتەوە کاتێ دەڵێ هەموو سیاسەتێکی دادپەروەرانە لە شەریعەتەوەیە، ئیتر با شەرعیش باسی نەکردبێت و دەستکردی مرۆڤەکان بێت.

ئەو پیاوە (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەڵێ: "خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردووە و لەگەڵیشیاندا کتێبەکانی ناردووەتە خوارەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بە یەکسانی و دادپەروەری ژیان بەسەربەرن، ئەو دادپەروەرییەی کە زەوی و ئاسمانەکان بەهۆیانەوە راوەستاون، لە هەر جێگایەك نیشانەکانی فەرمانڕەوایی هەق‌و عەقڵ و ژیری دروست لەکاردا بوو، ئەو وڵاتە لەسەر هەر بەرنامە و رێگایەك رۆژ بکەنەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە شەرعی خوا و ئاینەکەی و رەزامەندییەتی"[2].

ئەم راستییە ـ لە مەبەستەکانی شەرع ـ پڕاوپڕ لەگەڵ مەبەستی ئەو ئایەتەی قورئاندا یەك ئەگرێتەوە کە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾[3]، واتە: ئێمە

---

[1] مجموع الفتاوى، ١٤٦/٢٨.

[2] إعلام الموقعين، ٢٧٣/٤.

[3] الحديد: ٢٥.

پێغەمبەرانمان بە بەڵگەی ڕۆشنەوە ناردووە و لەگەڵیشیاندا کتێبو کێشانەمان ناردووە تا خەڵکی بە عەدل و دادپەروەرییەوە حوکم بکەن".

حیکمەتی خوایی لە ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی کتێبەکان لەگەڵ کێشانە ـ میزان ـ ی عەقڵی بەشەرەکاندا ئەوەیە کە بەرپاکردنی دادپەروەرییە لە نێوان مرۆڤەکاندا، وشەی (القسط) وشەیەکی ناوەندی میحوەرییە و هەموو مەبەست و ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆی".[1] خەلەل و ناتەواوییەکە لێرەوە دروست دەبێت لە نێوان داواکارانی جێبەجێکردنی شەریعەت و نێوان ئەوانەی ڕێگرن لە جێبەجێکردنیدا. تەنانەت هەندێ لە ڕێگرو نەیارانی جێبەجێکردنی شەریعەت بەتایبەت توندڕەوەکانی ناو عەلمانییەکان، لەناو بەهەڵە تێگەیشتنێکی مەعریفی و شێواوی دەست ئەنقەست دان. بە جۆرێ کە ـ ڕۆژهەڵاتناسە ـ داخ لەدڵەکان ـ یش بەو جۆرە نەیانڕوانیوەتە شەریعەت، بەجۆرێ هێرش دەکەنە سەر شەریعەت کە بە کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی و دڕندەیی..و هتد... تۆمەتباری ئەکەن.

وا پێناسەی ئەکەن گوایە تەنها کوشتو بڕ و شمشێر و خوێنڕێژی و دارکاری پشتی جەماوەر و لەو شێوانەیە کە شەریعەتی بەرزی ئیسلام لەو پێناسە ناڕەوایانە بەرییە (وەك بەرائەتی گورگ لە خوێنی یوسف).

---

[1] تکا ئەکەم لە خوێنەران ئاگایان لەوە بێت، قسەکە ئەوە نییە کە جێبەجێکردنی یاسای حەددەکان و بالاپۆشی شەریعەت نییە، بەڵکو قسەکە لەسەر ئەوەیە وشەی (الشريعة) گشتگیرە و تەنها نابێ لە جێبەحێکردنی سزاکان و چەسپاندنی بالاپۆشی زۆرەملێدا تەسك بکرێتەوە.

## - ٣ -

کەواتە... ئەی شەریعەت چییە؟

با هەوڵ بدەین واتاکەی بخوێنینەوە و بەپێی توانا شیی بکەینەوە، تا لەو ڕێگایەوە پەیوەندی نێوان شەریعەت و تاك و کۆمەڵگا ئاشکرا بکەین لەلایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە پەیوەندی شەریعەت بەکاری سیاسی حوکمڕانییەوە.

من ناڵێم ئەم هەوڵەم چڵەپۆپەیەو یەکلاکەرەوەیە - بەتایبەت لەم لێکۆڵینەوەیە لەم چەند لاپەڕە کورتەدا - بەڵکو تەنها هەوڵێکە بۆ کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە و دووبارە خوێندنەوەی سەرلەنوێی ئەم واتایەیە، کەوا ئەزانم هێشتا ناحاڵێیبوونێکی تێدایە و بەشێوەیەکی ئاڵۆز!

سەرەتا وشەی (شەریعەت) وەك زاراوە، مانای: پرۆگرام و ڕێگا و ڕێڕەو لەو واتایانەیە.

عەرەب کاتی خۆی وشەی (الشريعة) و (الشرعة)یان لە پێش ئیسلامدا بەکارهێناوە بۆ سەرچاوەی ئاو واتە کانیاو کە خەڵکی بۆ ئاوخواردنەوە و بەکارهێنانی، رووی تێ دەکەن.

ئالێرەدا قورئانی پیرۆز هەمان مانای خواستووە بۆ هەردوو وشەی (الشريعة) و (الشِرعة)، بەڵام ئاوەکە گۆڕاوە بۆ هیدایەت و ڕێنموونی پەروەردگار کە باوەڕداران رووی تێ دەکەن)[1].

کەواتە شەریعەت ئەو سەرچاوەیەیە کە باوەڕداران رووی تێ ئەکەن بۆ دەستخستنی هیدایەت و ڕێنموونی خوایی، لە ژیانی دنیایاندا ئەمە للایەن مانا زاراوەییەکەیەوە.

---

[1] لسان العرب، ابن منظور، ل٢٢٣٨، ٢٢٣٩.

بەڵام لەلایەن واتاکەیەوە، وشەی (ش، ر، ع) لە چوار شوێنی قورئاندا هاتووە، بە دوو مانایش هاتووە:

یەکەم: واتای شەریعەت پڕاو پڕ هەموو ئایینەکە ئەگرێتەوە، لە بیروباوەڕ، حوکمە شەرعییەکان، وەك خوای (عزوجل) ئەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[1]، واتە: ئەی موسڵمانان ئێوە ئاینێکی واتان بۆ نێرراوە کە پوختەی هەمان بەرنامەیە کە پێشتر بۆ نووح و ئیبراهیم و موسا و عیسامان ناردووە کە تیایدا هاتووە ئایین بەرپا بکەن و جیاجیا و پەرتەوازە مەبن تیایدا.

(السديّ) ئەڵێ: شەرع واتە هەموو ئایین بە گشتی.

دووەم: واتای (شەریعەت) تایبەتە بە حوکمە کرداری و پراکتییەکان و دوور لە بیروباوەڕە زانستییەکان، وەك خوای (عزوجل) ئەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾[2]، واتە: بۆ هەر ئوممەتێك شەریعەت و پرۆگرامێکی تایبەتمان ناردووە.

ئیبن عەباس ئەفەرموێت: واتای (شرعە ومنهاجا) واتە رێگاو سوننەت.

قەتادەیش ئەڵێت: (شرعە ومنهاجا) واتە ئایین یەکە و شەریعەت جیاجیا.

ئەمە مانای ئەوەیە (شرعە ومنهاج) پەیوەندییان بە فەرمانە کردارییەکانەوە هەیە کە بە گۆڕینی زەمەن ئەگۆڕێن، بەپێچەوانەی بنچینەی تیۆری باوەڕیی. بنچینەی هەموو ئاینەکان لە ئەصڵدا یەکن و نەگۆڕن،

---

[1] الشورى: ١٣.

[2] المائدة: ٤٨.

هەرچەندە کە حوکمە شەرعییە کردارییەکاندا کە بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی هاتوون لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر جیاوازن.

کەواتە شەریعەت لە قورئاندا بە دوو مانا هاتووە:

یان بە مانای (هەموو ئایین دێت)، چ بیروباوەڕ بێت یان حوکمە شەرعییەکان.

یان: تەنها بە مانای حوکمە شەرعییە کردارییەکان و بەس.

لەسەر مانای یەکەم، زۆر لە زانایان کردوویانە بە ناونیشانی نووسینەکانیان، وەك:

پێشەوا ئاجووری ـ کە ساڵی ٣٦٠ی کۆچی لە دنیا دەرچووە ـ و کتێبەکەی ناوناوە (الشريعة) لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی بابەتەکانی بریتییە لە بابەتی بیروباوەڕ و پەروەردەی رەوشتی.

هەروەها پێشەوا راغبی ئەصفەهانی (ساڵی ٥٠٠) لە دنیا دەرچووە، کتێبەکەی ناوناوە (الذريعة إلى مكارم الشريعة)، کە کتێبەکە سەرتاپا باسی فەلسەفەی ئەخلاقی شەرعی ئەکات. شایانی باسە پێناسەی رەوشتە جوانەکانی کردووە بە پێناسەیەکی قووڵ کە رەهەندی ئامانجەکانی شەریعەتی لەخۆگرتووە. تیایدا دەڵێت: رەوشتە بەرزەکان بریتییە لە: حیکمەت و لێزانی، بەرپاکردنی دادپەروەری لە نێوان خەڵکیدا، نەرمونیانی و چاکەکردن و پیاوەتی، مەبەست لەم کارانەش دەستکەوتنی بەهەشتی نەبڕاوەیە و لە خزمەت خوای ـ عزوجل ـ دا.

پێش گەیشتن بە بەهەشتی رازاوە، شەریعەت پوختکراوە بۆ سێ مەبەستی سەرەکیی لە بوونی مرۆڤ ئەویش: (جێنشینی، بەندایەتیکردن بۆ خوا، ئاوەدانکردنەوەی زەوی).

راغیبی ئەصفەهانی لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (ومن لم يصلح لخلافة الله تعالى، ولا لعبادته، ولا لعمارة أرضه، فالبهيمة خيرٌ منه)[1]. واتە: هەرکەسێ بۆ جێنشینی خوای گەورە نەشێت و کەڵکی بەندایەتیشی پێوە نەبێت و سەرزەویش ئاوەدان نەکاتەوە، بە دڵنیاییەوە ئاژەڵ لەو باشترە.

کەواتە شەریعەت بەم مانا گشتییەی: واتە هەموو ئەو ڕێنموونی و هیدایەتەیە کە خوای پەروەردگار ناردوویە بۆ مرۆڤەکان، ئەمەش مانای ئەوەیە قورئانی پیرۆز و هەموو ناوئاخنەکەی و سوننەتی (صحيح)ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هەموو ناوئاخنەکەی بەیەکەوە (شەریعەتی ئیسلام) پێك ئەهێنن کە پێویستە لەسەر تاك و کۆمەڵ پابەندبن پێوەی.

باوەڕبوون بە خوای تەعالا و ترسان لێی، شەرمکردن لە خوا و تەقوا و لەخواترسان، بەشێکە لە شەریعەت، دەستگرتن بە ئاداب و ڕەوشتە جوانەکانەوە لە دادپەروەری و چاکەکردن و ڕاستگۆیی و بەوەفابوون و نەرمو نیانیو خۆبە بچووك زانین و هەروەها خۆبەدوورگرتن لە کردەوە ناشیرینو قێزەونەکان، بەشێکە لە واتای شەریعەت.

بەچاوی ڕێزەوە سەیرکردنی مافی خەڵکی ئیتر چ گیان یان ماڵ یان ناموس بێت، ئەسڵێکی ئەسڵە لە شەریعەت.

خۆپاراستن لە کارە زشت و حەرامەکان و دەستگرتن بە کارە شیاوو حەڵاڵەکان بەشێکە لە شەریعەت و جێبەجێکردنی شەریعەت.

گرنگییدان بە زانست ـ هەر زانستێ ببێ ـ بە مەرجێ سوودبەخش بێت ـ و بڵاوکردنەوەی و هاوکارییکردن لەسەری بەندایەتی و شەریعەتیشە.

---

[1] الفكر الاسلامى وقضايا السياسية المعاصرة، (الريسوني)، ل١١١.

ژن‌و ژنخوازی و گونجاوی و پێکەوەژیانی هاوسەرەکان و ئاسانکاریی پرۆسەکە بۆ گەنجان، خۆی بۆ خۆی جێبەجێکردنی شەریعەتە.

منداڵ بوون و پەروەردەکردن و فێرکردنیان و چاکبوون لەگەڵیاندا جێبەجێکردنی شەریعەتە.

ڕێزگرتنی ئافرەت و مافەکانی و ئازادی خوێندن و هاتوچۆ و گوێزانەوە و ساماندارى و بەشدارى کاراى لە کایەکانی ژیانی کۆمەڵگەدا، جێبەجێکردنی شەریعەتە. حوکمڕانیکردن بەپێی شەریعەت لەناو کرۆکی جێبەجێکردنی شەریعەتە. بەرپاکردنی دادپەروەری و دەستەبەرکردنی مافەڕەواکان، بەشێکی گەورەیە لە شەریعەتی پەروەردگار.

فەرمان بە چاکە و بەرگریی لە خراپە پایەیەکە لە پایەکانی شەریعەت.

هەروەك هەماهەنگی و هاوکاری لە کاری چاکە و لەخوا ترساندا، وە دەربڕینی وتەی ڕاست لە بەردەم بەرپرسە ستەمکارەکاندا، لەناو جەرگەی جێبەجێکردنی شەریعەتە. تەنانەت سوودگەیاندن و چاکە لەگەڵ گیانلەبەران و رووەك و پاراستنی ژینگە و سروشت و گرنگی پێدانی ئەو بوارە، بەشێکە لە جێبەجێکردنی شەریعەتە.

هەموو ئەو شتانەی ڕێزی مرۆڤ دەهێنن یان زیادی ئەکەن یان گرنگی پێ ئەدەن، لە روانگەی مادی و مەعنەوییەوە پەرەی پێ ئەدەن، بەجۆرێ ببێتە هۆی چاکسازیی و سوود بۆ هەموان لەسەر رووی زەوی، ئەوە لە جێبەجێکردنی شەریعەتە و بەرپاکردنیەتی.

هەموو هەوڵێك یان کارێك بە خەرج بدرێت لەپێناو لابردنی ستەم‌و زوڵم و ناڕەوایی و خۆسەپاندن و دیکتاتۆری بەسەر خەڵکەوە، یان لابردن و

پەکخستنی خراپە و گەندەڵی و زیان لەسەر زەوی ئەچێتە چوارچێوەی شەریعەتەوە[1].

جوانترین دەربڕین لە مانای شەریعەت و واتا فراوانەکەی شەریعەت، ئەو فەرموودەیەی ئەبوهورەیرەیە (رەزای خوای لیّ بێت) کە گێڕاویەتییەوە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: (الإيمان بضع وستون شعبة، أعلاها قول لا اله الا الله وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان)[2]. واتە: باوەڕ بریتییە لە شەستو شتێك بەش، کە بەرزترینیان وتەی (لا اله الا الله)یە، نزمترین بەشیش لابردنی رێگرێکە لەسەر رێگاکان، شەرمکردنیش بەشێکە لە باوەڕ.

دکتۆر ئەحمەد رەیسونی ـ کە ناسراوە بە زانای مەبەستەکان ـ فقيه المقاصدی ـ ئەڵێ: شایەتومانی (لا اله الا الله) وەك سەر وایە بۆ لاشەی باوەڕ و ئیسلام و لوتکەی ئەم بەشانەیە، هەر لەو بەشەوە بەشەکانی تر جیا ئەبێتەوە و لقی لیّ ئەبێتەوە، تا ئەگەینە دواترینیان کە (پاکردنەوەی رێگایە بۆ رێبواران) و بەشی شەرمکردن ئەکەوێتە ئەو دوو نێوانەوە.

بەم مانایە و بەشێوەکی گشتی ئەتوانین شەریعەت بکەین بە سێ بەشەوە:

١ـ بەشی بیروباوەڕ و بنچینەکان: کە سەرەتا لە (لا اله الا الله)وە دەست پیّ دەکات.

٢ـ بەشی ئەخلاقیات ـ رەوشتەکان ـ کە فەرموودە بە رەوشتێکی ناسكو فیتری نموونەی بۆ هێناوە کە شەرمکردنە.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٨.

[2] متفق عليه، واتە بوخاری و موسلیم پێکەوە بە صحیح دایاننناوە.

٣ـ بەشی خزمەتگوزاریی و کرداررییەکان و نموونەی بە خوارترینی هێناوەتەوە، کە لابردنی بەربەرستە لەسەر رێگاکان.

لە نێوان ئەم سێ بەشەدا هەموو ناو کرۆکەکانی شەریعەت و بەشەکانی باوەڕ دابەشبوون.[1]

کەواتە هەرکەسێ بەیەکێ لەم کارانە هەستێت یان بەهەر هەموویان ئەوە کاری بەشەریعەت کردووە و جێبەجێی کردووە، ئیتر جیاوازیی نییە تاکەکەسی بێت یان دەستەجەمعی و کۆمەڵ بێت، یان حکومەت و دەستەڵات بێت، یان سەرۆك بێت، یان ژێردەست، یان نەتەوەیەك یان کۆمەڵگەیەك بێ.

هەریەك لەوانە هەر بەشێك لەوانەی پێشتر باسمانکرد لە شەریعەت پەك بخات یان کاری پێ نەکات یان پێچەوانەکەی بکات، ئەوە بە ئەندازەی کارەکەی لە شەریعەت پەك ئەخات و جێبەجێی نەکردووە.

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

## ـ ٤ ـ

لەبەردەم ئەم مانا فراوانەی شەریعەتدا: ئەتوانین بگەینە ئەم راستییانەی خوارەوە:

راستی یەکەم: نابیّ بگوترێت جێبەجێکردنی شەریعەت یان لەکارخستنی بەدەستی دەسەڵاتەو لە تایبەتمەندیی وڵاتە.

یان پێویستی بەو دەوڵەتە هەیە کە ناوی (دەوڵەتی ئیسلامی)یە یان پێویستی بە بەرپابوونی (خلافة الاسلامیة)و لەم چەشنانەی دیکە.

فراوانی شەریعەت و فرە رەنگی ناوکرۆکەکەی، وامان لیّ ئەکات لەوە تیّ بگەین کە شەریعەت بەو تەسکیە نییە کە وەك ئەو کەسانە بۆی ئەچن کە ئەڵێن جێبەجێکردنی شەریعەت پێویستی بە بوونی دەسەڵاتی سیاسیی یان بە دەست دادوەر و کاربەدەستانەوەیە، یان بە دەست دادگا حکومەتەکانەوەیە، ئەگەر ئەوان جێبەجێی بکەن ئەوە زیندووە و جێبەجێکراوە و ئەگەر کەنارگیریان کرد، ئەوە لەکارکەوتووە و مردووە.

ئەو وتانەی کە دەڵێت: (لەکارخستنی شەریعەت، رەدکردنەوەی شەریعەت، یان داواکردنی جێبەجێکردنی شەریعەت) ئەمانە هەمووی بەرێژە راستی و ناڕاستییان تێدایە و تەنانەت کەمیشیان راستە)[1].

شەریعەت زۆر لەوە گەورەتر و بە قەدرترە لەوەی کە ئامرازێکی دەستی تاقمێك فەرمانڕەوا و کاربەدەستانەوە بێت، یان بکەوێتە ژێر رەحمەت و مەزاجی کۆمەڵیّ حوکمڕان.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣.

بەڵكو كۆمەڵگەی موسڵمان ـ میللەتی موسڵمان ـ ئەسڵەكەیە و ئەو لەسەریەتی لە رێگەی چالاكی مەدەنی و پەیوەندی و شایستەیی و ئاوێتە مرۆڤایەتییەكەیەوە و لە ناوچەكەدا بەپێی زەمان و شوێن جێبەجێ بكات.

دەوڵەت و دەسەلاّت تەنها دەزگایەكە و لە سەروەری نەتەوەی سەربەخۆ و تەعبیر لە ویستی سەربەستانەی دەكات.

كۆمەڵگەی موسڵمان ولاّتی لێ دروست ئەبێت، نەك ولاّت بتوانێت كۆمەڵگەی موسڵمان بەرهەم بێنێت، وەك هەندێ لەوانە بۆی ئەچن كە ئەڵێن دەبێ دەسەلاّتی سیاسی بەدەست بێنین تا بتوانین كۆمەڵگەی موسڵمان بەرهەم بێنین، دەی دەسەلاّتی سیاسی ناتوانێ كۆمەڵگەی ئیسلامی بێنێتە كایەوە. كاری دەسەلاّتی سیاسی ئەوەیە كەشێكی چاكو پاك فەراهەم بێنێ بۆ گەل تا كۆمەڵگە تیایدا بە ئازادی تەعبیر لە ناخ و شووناس و بەها و بەرژەندیی و ئاواتەكانی خۆی بكات.

نەتەوە ـ الأمة ـ ئەسڵە و دەسەلاّت لقە، كۆمەڵگە ئەساسو بنچینەیە و دەوڵەت دەرهاویشتەی ئەو كۆمەڵگەیەیە. گەل دەسەلاّتداری راستەقینەیە و هەر ئەویشە سەرچاوەی دەسەلاّتەكان، ئەمیر و حوكمڕان و سەرۆكەكانیش بریكار و كرێگرتەی گەلن. ئەم چەمكە مەزنانە وامان لێ ئەكات دووبارە دراشتنەوەی واتای (جێبەجێكردنی شەریعەت) بنووسینەوە، بەجۆرێك كە جیاواز بێ لەو وێنە كۆنە تەقلیدییەی كە بلاّوە لە هەندێ لە گوتاری ئیسلامییە پارێزگارەكان، كە گوایە سەرۆك بە تەنها خۆی چەقی بینای رژێمی سیاسی ولاّتە.

ئەمەش درێژكراوەی ئەو تێگەیشتنە كۆنە سوڵتەویەیە، كە پێی وایە شەریعەت بەستراوە بە پیاوچاكی ئەو دەسەلاّتدارە تاكانەیەوە.

خۆئەمەش مانای ئەوە نییە لە پلە و مەقامی دەسەڵات و حکومەت و دەوڵەت کەمبکرێتەوە، بەڵکو بوونی حکومەت و دەسەڵات داوایەکی زۆر پێویستی مرۆڤەکانە بۆ هەر کۆمەڵگەیەك، چ جای کۆمەڵگەی موسڵمان.

نەك هەر ئەوە بەڵکو زۆر حوکمی شەرعی هەیە کە جێبەجێکردنەکەی لەسەر بوونی دەسەڵات و دەزگای دەوڵەت وەستاوە، وەك یاسای دادگا و بەشەکانی تری کە پێویستیان بە رێکخستن هەیە، پێویستیان بە بەرپاکردن و زۆرلێکردن هەیە لە جێبەجێکردنیاندا، بەتایبەت یاسای سزاکان.

بەڵام لە بەرامبەریشدا ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە دەسەڵات ئەصڵی مەسەلەکەیە، یان ئەو پێویستییەکی بنەڕەتییە بۆ کرداری جێبەجێکردنی شەریعەت، یان گوایە شەریعەت بەرپا ناکرێت مەگەر لە رێگای دەسەڵاتی پابەندکەر و زۆردارەوە نەبێت، بەڵکو میللەت ـ وەك دیاردەیەکی بەشەری ـ لە ئەسڵدا لەسەریەتی شەریعەت جێبەجێ بکات ئەمەش لە رێگای دەزگا جۆراوجۆر و جیاجیاکانیەوە، کە حکومەتیش یەکێکە لە لەو دەزگایانە، ئەو بەشێکی دیاریکراوی شەریعەت جێبەجێ ئەکات لە یاسا گشتییەکەی شەریعەتی ئیسلامی و نەك هەموو شەریعەت.

کەواتە شەریعەت وەك باسمانکرد بەو تەسکییە نییە کە پەیوەستی بکەین بە بوونی دەسەڵاتی جێبەجێکارەوە.

زانای ئامانج زان ـ ئەحمەد ریسیونی ـ ئەڵێت: دەسەڵات با ئەوپەڕی گرنگی هەبێت لە بەرپاکردنی ئایین و جێبەجێکردنی شەریعەت، بەڵام گرنگییەکەی ناگاتە گرنگی گەل و کۆمەڵگە و ئەمەش لەبەر چەند هەنگاوێك:

یەکەم: ئەو ئاینەکە جێبەجێ ئەکرێت بەبێ زۆرلێکردن و تەنگ پێ هەڵچنین، ئەوە ئەو ئایینە راستە وەرگیراوەیە لەلای خوای تەعالا.

دووەم: چونکە جێبەجێ دەکرێت لەحەز و ئارەزو و رەغبەتەوە، زۆر باشترو درێژخایەنترە، بەپێچەوانەی ئەوەی بە سەپاندن و زۆری قەمچی جێبەجێ بکرێت شتێکی خراپ و کاتییە، لە نزیکترین بۆ لواندا سەرپێچی دەکرێتەوە.

سێیەم: ئەوەی لەسەر خواستی تاکەکان یان بەهۆی داوا و جموجوڵی میللەت جێبەجێ دەکرێت، بەرزی و بڵندی و گەشەکردنی زیاتری هۆشیاری کۆمەڵگە و چالاکبوونی لێ دەکەوێتەوە، کە لەو رێگایەوە نەبێت هەرگیز ئەوە نایەتە دی. پاشان مامۆستا رەیسونی بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە و روون فیکرەکەی دووپات ئەکاتەوە و ئەڵێ: "هەرکەسێ ئەیەوێت دڵنیا بێت لەو رووبەرەی دەوڵەت و لەو رووبەرەی میللەت لە جێبەجێکردنی شەریعەتدا، با قورئان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بخوێنێتەوە، وە لە دوو شوێنی جیادا بیان نووسێتەوە:

١ـ ئەوەی لەسەر شانی دەوڵەتە و بەبێ ئەو فەراهەم نایەت، کامانەن بیانوسێت.

٢ـ ئەوەی پێویستی بە دەوڵەت نییە و ئوممەت بەخۆی جێبەجێی ئەکات.

پاشان با حسێبیان بکات، سەیری ئەنجامەکەی بکات.."[1].

وەڵامەکەی: بێگومان، بۆمان دەرئەکەوێ کە فەرمانە شەرعییەکانن کە لەسەر تاکی موسڵمانە جێبەجێی بکات و پێویست بە بوونی دەوڵەت نەکات، زۆر زۆرن و زۆرینەی فەرمانە شەرعییەکانە، نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەوەش ئەسڵە.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٢٨.

راستی دووەم: لە ژێر سێبەری ئەم واتا فراوانەی شەریعەتدا کە لە شایەتومانی (لا اله الا الله)وە بۆ رەوشتی شەرمکردن و تا کۆتایی بە (لابردنی کۆسپی سەر رێگا)، ئیتر ئەمڕۆ کەس ناتوانێت بڵێت: شەریعەت بە تەواوی لەکارخراوە، تەنها لەبەرئەوەی سزای حەدەکان جێبەجێ ناکرێت، لەکارخرانی شەریعەت مانایەکی فراوانی هەیە، ئەمەش لە ئەنجامی فراوانی شەریعەت خۆی، وەك چۆن پێشتر باسمانکرد.

کەواتە راست نییە ئەگەر لەکارخرانی شەریعەت لەکارنەکردنی بە سزا شەرعییەکان بێت و بەس، یان ئەوە بکەین بە پێوانەی جێبەجێکردن یان لەکارخستنی، کە لە بەرامبەریشدا لە بنەما شەرعییەکان و بنەما گشتییەکاندا زۆر شتی گەورەتر و ترسناکتر هەیە لە (سزای حەدەکان) کە ئەمڕۆ پشتگوێ و لەکارخراون.

بۆ نموونە، نەمانی دادپەروەری و بەکارهێنانی هەموو جۆرەکانی ستەم، گەورەترین لەکارخستنی شەریعەت کە لە ئەلفەوە بۆ یای شەریعەت داوای بەرپاکردنی دادپەروەری و دوورکەوتنەوە لە ستەم دەکات، وەك چۆن ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێ: "جماع الحسنات العدل، وجِماع السيئات الظلم، وهذا أصل عظيم"، واتە کۆی هەموو چاکەکان دادپەروەرییە، کۆی هەموو خراپەکان ستەمکارییە، ئەمەش ئەسڵێکی گەورەیە.

بۆیە دەستدرێژیکردنە سەر خەڵکی بە کوشتن و زیندانی و سەرکوتکردن و زەوتکردنی مافەکان لەکارخستنی شەریعەت، ستەمکاریی و زەوتکردنی

مافی میللەت لە بەشداریی سیاسییانەی بەڕێوەبردنی وڵات لەکارخستنی شەریعەتە.

ناپاکی و گەندەڵی و دزینی سامانی گشتیی، لەکارخستنی شەریعەتە، یەکسانیی نەکردن لە نێوان خەڵکیدا لە ژێر رۆشنایی فەرموودەکەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) کە ئەفەرمویَ: (لهم ما لنا وعلیهم ما علینا)، واتە: ئەوەی لەسەر موسڵمانە لەسەر هەموو هاوئاینەکانی تریشە و ئەو مافەیشی بۆ موسڵمانە هەمان ماف بۆ سەرجەم کەمایەتییەکانی تری ناو موسڵمانانە، ئەمەش پەکخستنی شەریعەتە.

ستەمکردن لە ئافرەتان و بێبەشکردنیان لە خوێندن و میراتگری و هاتوچۆی ئازاد و جموجۆڵ و بەشداری کار لە ژیانی رۆژانەدا، لەکارخستنی شەریعەتە. هەروەك بڵاوبوونەوەی بەدرەوشتی و ناپاکی لە شوێنە گشتییەکانی کۆمەڵگەی موسڵماناندا، پەکخستنی شەریعەتە.

هەڵنەسان بە ئاوەدانکردنەوەی وڵات لە (گەشەپێدان و هەستانەوە و خۆشگوزەرانی) لەکارخستنی شەریعەتە.

گزی و ناپاکی لە پرۆسەی خوێندن، کەرتی پیشەسازی و بازرگانی یان هەر خزمەتگوزارییەکی تر یان لە پرۆسەکانی هەڵبژاردندا لەکارخستنی شەریعەتە.

هەروەك دڵسۆزی نەنواندن لە کارکردن و تەواونەکردنی بە دڵسۆزی و چاکی لەکارخستنی شەریعەتە.

کەواتە ئێمە ئێستا لەبەردەم واتایەکی زۆر فراوانی شەریعەتداین، هەست بە ترسناکی و کارەساتی ئەو هەڵەیە ئەکەین کە تێی کەوتووین، ئەویش

ئەوەیە مەسەلەی ـ سزاكان ـ الحدود ـ گەورە ئەكەین و كردوومانە بە سونبول و پێوانەی جێبەجێكردنی شەریعەت یان لەكارخستنی!!

بەڵێ، سڕینەوەی ئەو حوكمانەی تایبەتە بە لایەنی سزای تاوان و تاوانبارییەوە لە ئیسلامدا لەكارخستنی بەشێكی شەریعەتە، شەریعەتی ئیسلامی یاسایەكی گشتی و تەواوە و پێویستە لەسەر موسڵمانان وەریبگرن و كاری پێ بكەن، نابێت جیاوازی بكرێت لە نێوان حوكمە شەرعییەكاندا، بە جۆرێ بە هەندێكیان كار بكەن و هەندێكیشیان لەكار بخەن، ئەوكاتە ئەكەونە بەر هەڕەشەی پەروەردگار كە زەمی ئەو كەسانە ئەكات كە باوەڕیان بە هەندێ ئایەتی قورئان هەبێت و باوەڕیان بە هەندێكی تری نەبێت، وەك ئەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾[1]، ئەمە لەبەرئەوەیە كە سزای حەددە شەرعییەكان بەشێكی گرنگ و دانەبڕاوە لە شەریعەتی ئیسلام و لەبەرئەوەی لەبەر چەندان حیكمەت و مەبەستی مەزن دانراون.

بەڵام پرسیارەكە لێرەدایە:

ئایا پلەوپایەی سزای ـ حدود ـ ەكان لە شەریعەتی ئیسلامدا لە كوێدایە؟

بەڵكو ئایا پێگە و پلەوپایەی لایەنی سزاكان لەهەر پرۆگرامێكی قانونی دا لەسەر رووی زەوی لەكوێدایە؟ ئایا ئەمە ئەو پرسیارەیە كاتێ ئەمانەوێت یاسای سزاكانی شەریعەت جێبەجێ بكرێت، دەبێت لە خۆمانی بكەین.

---

[1] البقرة: ٨٥.

(ئامانجی یەکەم و مەبەستی گەورەی هەر بەرنامەیەکی قانوونی ئەوەیە کە پێناسی مافەکان و ئەرکەکان بکرێت لەپێناو هێنانە دی ئاسایش و شکۆ و دادپەروەری لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا).[1]

پاشان لایەنی پاداشت و سزا دێتە پێشەوە لەپێناو پاراستنی ئەو مافانە و ڕێگەنەدان بە بەزاندنیان، لایەنی سزا لە دوای دەستەبەرکردن و بەرجەستەکردنی مافەکان دێت، بەمانای ئەوەی حاڵەتێکی یەك لە دوای یەکە و کە دوایی دێت بۆ تەمێکردن و پارێزگارییە، ئەو ناوکرۆکی یاسا و جەوهەرەکەی نییە.

ئەوەی ئەمە دووپات ئەکاتەوە ئەوەیە کە ئایەتەکانی سزاکان (الحدود) لە دوای ئایەتەکانی تر هاتۆتە خوارەوە و با ئەوەش بزانین کە لە (١٠) ئایەتێ ناپەڕێت، لەبەرامبەردا شەش هەزار ئایەتی تر هەیە.

دەی ئایا ڕاستە وەك دکتۆر (القرضاوی) دەڵێ: تیشك بخەینە سەر دە ئایەتی قورئان و بیکەین بە ڕەمز و پێوانە بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت، شەش هەزار ئایەتی تر پشتگوێ بخەین؟.[2]

هەروەها ئەوەی ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە سزاکان حاڵەتێکی بەدواهاتنە بۆ جێبەجێکردنی شەریعەت، ئەو خۆی جەوهەر و ناوکرۆکی جێبەجێکردنی شەریعەت نییە.

سزادان ـ لەڕاستییدا ـ ئەچێتە ڕیزی تاوان و خراپەوە، بەڵام بەناچاری دانراوە بۆ پارێزگاری لە شتانێك کە ڕوودانیان زیانی زیاترە لە خودی سزاکان.

---

[1] المدخل الی القانون، نظریة القانون، ل٣٣ی همام محمد محمود.

[2] الدکتور یوسف القرضاوی، لە بەرنامەی (الشریعة والحیاة)ی کەناڵی (الجزیرة).

ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە كاتی خۆیدا ئاماژەی كردووە بۆ ئامانجە گەورە و قووڵەكانی دانانی یاسای سزاكان لە ئیسلامدا، دەڵێ:

"گشت ئەو سزایانەی كە فەرمانیان پێكراوە ـ خۆیان لە بنچینەدا خراپن و بەزیانن ـ بەڵام دانراون بۆ ئەوەی زیانێكی زۆر گەورەتر لە مرۆڤەكان دوور بخەنەوە ـ كە خودی تاوانەكانە ـ كە ناكرێ رێگە بگیرێت لە خراپەیەكی گەورە مەگەر بەم خراپە بچووكە نەبێت).[١]

دەی ئایا راستە سزاكان بەم مانایەی كە (خراپ و زیانبەخش)ن بكرێتە بنچینەی حوكمڕانی؟ ئەی ئایا راستە ئەم رووبەرە ئامانجییە لا ببرێت لە واتای جێبەجێكردنی شەریعەت؟

یاسای شەریعەت ـ وەك هەموو یاسایەكی تر ـ نابێت پێناسەی بكەین بە چەند سزایەكی تەمێكار و وازهێنەر ـ رادع ـ؟

بەڵكو ئەبێت پێناسە بكرێت بە ئامانجە گەورەكان و پرۆگرام و كۆمەڵە بەهایەك كە بە هۆیانەوە كۆمەڵگە سەقامگیر بێت، بەختەوەری و رێز و شكۆ بۆ مرۆڤ لە دنیا فەراهەم دێنێت و لە قیامەتیشدا سەرفەرزای و رزگاری پێ دەبەخشێت.[٢]

شەریعەتیش مەبەست و ئامانجەكانی نایەتەدی مەگەر لە رێگای جێبەجێكردنیەوە بەشێوەیەكی گشتگیر و تەواو، نەتەنها هەڵبژاردنی لایەنی سزایەكەی و بكرێت بە رەمزی جێبەجێكردنی شەریعەت لەكاتێكدا كە مەبەستە گەورە و گرانەكانی شەریعەت نادیارە و شاراوەتەوە و لەكاركەوتووە.

---

١ مجموع الفتاوى، ٤٨/٢٠.

٢ مقاصد العقوبة في الاسلام، إيهاب فاروق، ل٥٤.

ئەمەش ئەچێتە ناوئاخنی وتەی پەروەردگار کە فەرموویەتی: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾[1]، کەواتە سزاکان ـ الحدود ـ و تەمێکارییەکان جێبەجێ ناکرێن بە تەنها مەگەر لەگەڵ جێبەجێکردنی بەرنامە و شەریعەتی ئیسلام بەشێوازە گشتگیر و تەواوەکەیەوە، بە مانای ئەوەی کە دووتوێی بەرنامەکە بەگشتی و ئامانجە مەزنەکانی و قیەم و بەها باڵاکان کە لە زەمەنێکدا لە واقیعی حوکمڕانیدا بەرجەستەکراوە.

با لێرەدا نموونەیەکی ئاشکرا وەرگرین، ئەویش سزای دز و بڕینی دەستی دزە، لە دوای هاتنەدی هەموو مەرجەکان و وەسفە شەرعییەکان، لێکۆڵەرە فیقهییەکان پێیان وایە هێشتا هەر سزای دزیی بەسەردا جێبەجێ ناکرێ هەتا ژیانێکی شایستە و وەزعێکی دارایی ماقووڵ بۆ دەستەبەر نەکرێت کە پێویستی بەوە نەبێت دەست پان بکاتەوە لە کەس یان دەست بەرێت بۆ سامانی خەڵکی.

پێشەوامان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) هەمان کاری کرد لە سەردەمی ساڵە گرانی و قاتو قڕییەکەدا، چونکە پێی وابوو مەرجەکانی جێبەجێکردنی سزای دەستبڕینی تیادا نەهاتۆتە دی، دادپەروەرانە نییە لە کاتی برسێتی و نەبوونیدا لێپرسینەوە لەگەڵ کەسێکدا بکرێت کە نەبوونی ناچاری کردبێت دەست بەرێت بۆ ماڵی خەڵکی تا خۆی یان خێزانەکەی لە برسێتی ڕزگار بکات.[2]

---

[1] البقرة: ٨٥.

[2] راوه ابن أبي شيبة في مصنفه، ٢٧/١٠، وعبدالرزاق في مصنفه رقم ١٨٩٩٠، وقد ضعف الألباني أسانيدهما في ارواء الغليل ٢٤٢٨ وأخرجه ابن حزم في كتابه الايصال بسند صحيح.

کاتیَ کە خزمەتکارەکانی حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە (ڕەزای خوای لیَ بیَت) حوشتری پیاویَکی خەڵکی موزەینەیان دزی و سەریانبڕی و تیَرو پڕ گۆشتیان لیَ خوارد و کاتیَ هیَنران بۆ لای خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لیَ بیَت) ئەو سزای (حەدی) بەسەردا جیَبەجیَ نەکردن و دەستی نەبڕین، بە حاتەبی گەورەیانی وت: (بەخوا من وا ئەزانم تۆ ئیشی زۆریان پیَ ئەکەیت و پاشان برسیشیان ئەکەیت و خراپی لەگەڵیان، تا وات لیَکردوون حەرامی خوایشیان دەست بکەویَت بۆ خۆیان حەڵاڵی بکەن و بیخۆن، پاشان بە خاوەنی حوشترەکەی وت: حوشترەکەت بایی چەند بوو؟ پیاوەکە وتی: ٤٠٠ درهەم، عومەر بە گەورەکەیانی وت: ٨٠٠ درهەمی زیانی خزمەتکارەکانت بدە بەو پیاوە).[1]

ئا لیَرەوە شەرعزانەکان ـ فقهاء ـ چەند مافیَکی بنەڕەتییان دیاریی کردووە بۆ مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگەی موسڵماندا کە پیَویستە بیَنەدی پیَش جیَبەجیَکردنی سزا شەرعییەکان ـ الحدود ـ، (دەبیَ مرۆڤ خانوویەکی هەبیَت تیایدا بژی، خواردن و خواردنەوەی شایستە، جلو بەرگیَك لە سەرماو گەرما بیپاریَزیَت و خزمەتکاریَك هاوکاری بیَت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، ولاَخیَکیش ـ ئۆتۆمبیلی ئەمڕۆ ـ سواری ببیَت و کارەکانی ڕاپەڕیَنیَ دوای هەموو ئەمانە ئەگەر موسڵمان دزی کرد سزای شەرعی بەسەردا جیَبەجیَ ئەکریَت و

---

[1] رواه مالك في الموطأ، كتاب الأقضية، ل١٢٣، وعبدالرزاق في المصنف، ١٨٩٨٧، شافعی لە الأم دا ئەڵیَ ٢٣١/٧، : ئەم فەرموودەیە سابت بووە لە عومەرەوە کە بەو جۆرە حوکمی کردووە لەنیَوان کۆچەریان و پشتیوانان، ئیبن حەزمیش لە (محلی) ٣٢٥/١١دا ئەڵیَ: ئەمە وەك خۆر ئاشکرایە لە عومەرەوە.

دەستی ئەبڕڕێت).[1] ئەم مەرجەش مافێكی سەرەتایی مرۆڤە، زاناكان ناویان ناوە ئاستی دەوڵەمەندی.

بەكورتی، بەرپاكردنی كۆمەڵگەیەكی موسڵمان لە هەموو لایەنەكانەوە تەواو و تێروتەسەل بن چ لە لایەنی ئابووری، سیاسی، كۆمەڵایەتییەوە بێت، بەجۆرێك تاك لەناو كۆمەڵگە موسڵمانەكەیدا هەست بكات بە ئاشتی و ئارامیی، ئەمەش بەبێ خۆڕەنجاندن و گەڕان بە دوای ئیشو كارو خانوو و شتی تردا، كە لەو ڕێگایەوە ژیانێكی ئاسوودە و پڕ لە ڕێز و كەرامەت بەسەربەرێت، ئەوكات ناچار نابێت دزیی بكات بەهۆی هەژاری و دەستكورتییەوە، یان ناچاری داوێنپیسییكردن نابێت، بە هۆی نەتوانینی ژنهێنانەوە، ئافرەتانیش ناچار نابن لادانی رەوشتی ئەنجام بدەن تا پارووە نانێك بۆ خۆیان و خانەوادەكانیان پەیدا بكەن.

هەندێ لە زاناكانی شەرع، نموونەیەكی تریش ئەهێننەوە بۆ جێبەجێنەكردنی سزای شەرعی، دەڵێن ئەگەر ئافرەتێك لە زستاندا سەرمای بێت و هیچی نەبێت خۆی پێ گەرم بكاتەوە، بترسێت لە سەرماندا رەق ببێتەوە، یا نەخۆش بكەوێت، ئەگەر ناچاری زینا بوو، ئەوە حوكمی حەدی زیناكەری بەسەردا جێبەجێ ناكرێت و بە ـ موكرەهـ ـ زۆرلێكراو دادەنرێت.[2]

بێگومان ـ ئەبێ ئەوەش بزانین ـ كە نموونەكانی زۆرلێكردن و ئەو هۆیانەی مرۆڤ ناچار ئەكات ئەو تاوانە قێزەونانە ئەنجام بدات، تەنها ئەو نموونەیەی پێشوو نییە و بەڵكو ئەو نموونەیەك بوو.

---

[1] ابن حزم (المحلی) ١٤٨/٦.

[2] الحجاری، كشف القناع، ٥٧/٦.

ئەمەیە بەرنامە گشتیگر و تەواوەکەی شەریعەتی ئیسلام، کە تیایدا سزا شەرعییەکان جێبەجێ دەکرێت، ئیتر تێناگەم بۆچی ئەو کەسانەی بانگەشەی جێبەجێکردنی شەریعەت ئەکەن و داوا ئەکەن دز و زیناکارەکان سزا شەرعییەکانیان بەسەردا جێبەجێ بکرێت، کەچی هەوڵ نادەن جەنگی ئەوە بکەن دادوەری کۆمەڵایەتی بێتە کایەوە و ژیانێکی شایستە بۆ مرۆڤەکان بێتە کایەوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

ئایا شەریعەت بۆ ئەوە هاتووە دەست بقرتێنێ و مل بپەڕێنێ و بە جەڵد پشت شینو کەوە بکاتەوە؟ یان بۆ ئەوە هاتووە کە دادپەروەری لە ناو خەڵکدا بەرپا بکات و ژیانی کامەران و شایستە بە مرۆڤ بێنێتە کایەوە؟

لە پلەبەندی شەریعەتدا کامیان لەپێشترە: هەموو هەوڵەکانمان بۆ ئەوە بێت کە سزا شەرعییەکان جێبەجێ بکرێت لە وڵاتێکدا زۆرداری و چەوسانەوە و گەندەڵی و ستەمی سیاسی بەکارە.

هەموو ئەوە باش ئەزانین و دڵنیایین کە تەنها بەسەر هەژاران و برسییەکان و نەداراندا جێبەجێ ئەکرێت، یان شایانترە بۆمان بۆ ئامانجە گەورە و مەزنەکانی شەریعەت هەوڵ بدەین کە ئەویش هەوڵ و تێکۆشانی هێنانە کایەی دادپەروەری کۆمەڵایەتییە و سەروەری یاسا و پاراستنی مافی مرۆڤە؟ بەداخەوە، ئەم راستییانە گومبوون و دیار نین لە سایەی جەنگی دروشمی (جێبەجێکردنی شەریعەت) بەبێ جیاوازی چ ئەوانەی بەردەوام داوای دەکەن و چ ئەوانەشی کە بەرگری دەکەن لە جێبەجێکردنی و رێگرن لێی.

لەگەڵ فراوانبوونی زانست و جیابوونەوەی بەشە پسپۆڕییەکان، وای لێهاتووە زاراوەی (شەریعە) تەنها بۆ حوکمە کردەییەکان بەکاردێت.

بە مانای هەموو ئەو ئەحکامانە ئەگرێتەوە جگە لە (بیروباوەڕ) کە ئەحکامە پەرستشییەکان و کردارییەکان و باری کەسێتی و سزاکان و رەوشت و ئادابەکان و... هتد.

ئالێرەوە ئەو دەستەواژە بەناوبانگە وتراوە کە دەڵێ: (ئیسلام بیروباوەڕ و شەریعەتە)، لەسەر ئەو رایەی کە دەڵێ بیروباوەڕ لە شەریعەت جیایە.

لە راڤەکردنی پەیوەندی نێوان بیروباوەڕ و شەریعەتدا شێخی ئەزهەر (مەحمود شەلتوت) ـ بەر رەحمەتی خوا کەوێت ـ دەڵێ: "شەریعەت ناوێکە بۆ ئەو سیستەم و ئەحکامانەی خوای پەروەردگار دایڕشتووە یان بنچینەکەی داڕشتووە، وە فەرزی کردووە لەسەر موسڵمانان کە کاری پێ بکەن و پابەند بن پێوەی.

بۆ ئەوەی لە پەیوەندییەکانیان چ لەگەڵ خوا یان لەگەڵ مرۆڤەکان دەستی پێوە بگرن، ئەو حوکمانە لەگەڵ ئەو زۆریەیاندا ئەگەڕێتەوە بۆ دوو لایەنی سەرەکی:

یەکەم: لایەنی کردەوەیی، کە موسڵمانان بە هۆیەوە خۆیان لە خوای گەورە نزیك ئەکەنەوە و لەو رێگایەوە خوا بە گەورە سەیر دەکرێت، کە بوونەتە نیشانەی راستگۆیی باوەڕەکەی و چاودێری خوایی و رووتێکردنی.

ئەم لایەنە لە ئیسلامدا ناسراوە بە ناوی (پەرستشەکان)، کە نوێژ و رۆژوو و حەج و زەکات ئەگرێتەوە.

دووەم: لایەنی کردارییە بۆ ئەوەی موسڵمانان لە ڕێگایەوە بەرژەوەندییەکانیان پارێزراو بێت و لە زیانیش بەدورو بن چ لە نێوان خۆی و دەروونیدا یان خۆی و خەڵکیدا، وە بە جۆرێك ڕێگر بێت لە ستەمو هەروەك ئاسایش و ئارامی باڵ بکێشێت، ئەم لایەنە پێی دەگووترێت کردارییە مامەڵەییەکان ـ المعاملات ـ.

ئەمەش هەموو ئەو مەسەلانە ئەگرێتەوە کە پەیوەندی هەیە بە خێزان و میراتەوە، یان بە ئاڵوگۆڕکردنەکانەوە و هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەندن بە سزا شەرعییەکانەوە و یان پەیوەندی موسڵمانان لەناو خۆیاندا و یان پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی تردا).[1]

بەم مانایە شەریعەت هەموو ئایین ئەگرێتەوە جگە لە بیروباوەڕ نەبێت، لەڕاستییدا ئەم مانایە زۆر باو و بڵاوە و زیاتر لەلایەن زاناکانی ئیسلامەوە لە کۆندا بەکارهێنراوە، بەڵام ماناکەی یەکەمی کە گشتی و فراوانترە بۆ وشەی شەرع کە بیروباوەڕە نەسڕراوەتەوە.

ئەگەر ئیسلام (بیروباوەڕو شەریعەت) بێت، وە شەریعەتیش جگە لە بیروباوەڕ بێت، دەی کەواتە پەیوەندی چییە لەنێوان بیروباوەڕ و شەریعەتدا؟

ئیمام (مەحمود شەلتوت) بە وشەیەکی راستو گرنگ لە دووتوێی بنەمای (سەروەری ئوممەت)دا دەڵێت: "بیروباوەڕ ئەسڵە و شەریعەت لقە، بیروباوەڕ لە ئیسلامدا ئەسڵو بناغەیە و شەریعەتی لەسەر بنیاتنراوە، شەریعەتیش پاشماوەیەکە و بەدوای بیروباوەڕدا دێت، شەریعەت لە ئیسلامدا هیچ مانایەکی نییە بەبێ بوونی بیروباوەڕ، هەروەك چۆن شەریعەت چۆن گەشە و

---

[1] الاسلام عقيدة وشريعة، شيخ محمود شلتوت، ل٧٣.

نما ناكات لەژێر سایەی بوونی بیروباوەڕدا نەبێت، چونكە شەریعەت بەبێ بیروباوەڕ لوتكەیەكە بەبێ بوونی بناغە و هێزێكی مەعنەوی پشتگیریی ناكرێت، كە ڕێز ببەخشێتە شەریعەت و ڕەچاوی یاساكانی بكرێت، بەجۆرێ كە جێبەجێ دەكرێت بەبێ بوونی هێز و دەسەڵات و زۆرێك.

كەواتە لە ئیسلامدا حەتمییە و دەبێ شەریعەت و بیروباوەڕ دەست لەملی یەكتری بن، بەجۆرێ نابێ یەكێكیان بەبێ ئەویتر بوونی هەبێت.

كەواتە هەركەسێ لایەنی بیروباوەڕەكە بگرێت و لایەنی شەریعەت بەربدات، یان شەریعەت جێبەجێ بكات و گوێ نەدات بە بیروباوەڕ، لەلای خوای تەعالا بە موسڵمان دانانرێت و لە حوكمی ئیسلامدا ڕێگای ڕزگاربوانی نەگرتووە".[1]

كەواتە بەپێی شەرع نابێ داوا بكەین لە كەسێك شەریعەت جێبەجێ بكات لەكاتێكدا ئەسڵ و بناغەكە، كە عەقیدەیە تیایدا نەهاتووەتە دی، ئەو بەو مانایە هێشتا نەهاتۆتە ناو ئیسلام، جێبەجێكردنی شەریعەتیش وەك بەروبوومێكی باوەڕی موسڵمانە و هەڵقوڵاوی قەناعەتیەتی كە ئیسلامەكەی (شەریعەتە و بیروباوەڕ)ە، ئەگەرهاتو بە ئارەزووی خۆی و دوور لە هیچ هەڕەشە و زۆرلێكردنێك ئیسلامی هەڵبژارد، دوای ئەوە لەسەریەتی بەپێی ئیمانەكەی شەریعەت و بیروباوەڕ پێكەوە جێبەجێ بكات.

پڕاوپڕ ئەمە ڕاستییەكە لەو ئامۆژگارییەدا دەركەوتووە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەعازی كوڕی جەبەلی كرد ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ و پێی فەرموو: (أنت تأتي قوماً من أهل الكتاب، فليكن أول ماتدعوهم إليه شهادة أن لا إله إلا الله، ـ وفي رواية: الى أن يوحدوا الله ـ وأني رسول الله،

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٧.

فإن هم أطاعوا لذلك "تأمل فإن هم أطاعوك لذلك) أي إذا آمنوا وامتثلوا عن إرادة وحرية واقتناع... حينها) فأعلمهم أن الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فإن هم أطاعوا لذلك، فأعلمهم أن الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيائهم وترد على فقرائهم، فإن هم أطاعوا لذلك، فإياك وكرائم أموالهم، واتق دعوة المظلوم، فإنه ليس بينها وبين الله حجاب).[1]

واته: ئەی موعاز تۆ ـ كە دەڕۆیت بۆ یەمەن ـ دەڕۆیتە ناو گەلێك كە ئەهلی كیتابن، ـ گاورو جولەكەن ـ یەكەمجار بانگیان بكە بۆ شایەتومانی لا اله الا الله، محمد رسول الله، لە ریوایەتێكدا هاتووە، بۆ ئەوە خوا بەتاك و تەنها بناسن، ئەگەر لەوەدا بە قسەیان كردیت (خوێنەری بەڕێز وردبەرەوە لەوەی پێی فەرموو ـ ئەگەر لەوەدا بە قسەیان كردیت ـ واتە باوەڕیان هێنا و بە هەموو ئازادی و ویست و قەناعەتی خۆیان، ئەوكاتە ـ ئاگاداریان بكە كە خوا لە شەووڕۆژێكدا پێنج نوێژی لەسەر داناون، ئەگەر ئەوەشیان كرد، ئاگاداریان بكە كە خوا زەكاتی لەسەر داناون و لە دەوڵەمەندەكانیان ئەسەندرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەكانیان، ئەگەر بەقسەیان كردی لەوەشدا، ماڵە جوان و چاكەكانیان هەڵنەبژێری و بیكەی بە زەكات، لە دوعای ستەملێكراوان خۆت بپارێزە، چونكە لە نێوان ستەملێكراو و خوادا پەردە نییە).

مەعاز نەچوو بۆ یەمەن تا رێكخستنی نهێنی دروست بكات، لەو رێگایەوە كودەتایەكی سەربازی بكات و دەسەڵات بۆ خۆی بفڕێنێ، ئیتر پاش ئەوە شەریعەت بە زۆر بسەپێنێت بەسەر دانیشتوانەكەیدا، بەڵكو وەك بانگخواز و رێنموونیكار رۆیشت بۆ ئەوێ، بە بەرنامە ـ ئەگەرهاتوو بە قسەیان كردی

---

[1] رواه البخاري ومسلم.

لەوەدا ـ چووە ناویان، بۆیە خەڵکی یەمەن بە هەموو حەزو ویستێکی خۆیانەوە بەبێ زۆرکاری هاتنە ریزی موسڵمانان، بەڵکو پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بانگەوازەکەی دەستپێنەکرد لە مەککەدا و رێکخستنی نهێنی بۆ ئەوە دروست نەکرد کە هەستێ بە کودەتایەکی سیاسی بەسەر (دار الندوة)دا و دواتر دەسەڵاتێکی دەسترۆیشتوو دروست بکات و لەرێگەی سەرکوتکردن و چەوسانەوە و چاو سوورکردنەوەوە ئیسلام و ئەحکامە شەرعییەکانی بسەپێنێ بەسەریاندا، بەڵکو هاتە ناو خەڵکی بە موژدەدەر و ترسێنەر و خەڵکی بۆ لای خوا بانگ کرد، بەتەمای دەستکەوتی سیاسیی نەبوو، تەنها ئەوەی ئەویست ئازادی پێ ببەخشن، تا سەربەستانە بانگەوازەکەی بگەیەنێت بە خەڵکی دوور لە رێگری و سەرکوتکردن و سزادان، هەروەك لە رێککەوتنی حودەیبیەدا فەرمووی: (ماذا علیهم لو حلّو بیني وبین الناس)[1]، واتە: چی دەبوو، یان چییان زەرەر ئەکرد ئەگەر وازیان بهێنایە لەوەی بانگەوازەکەم بگەیەنمە خەڵکی.

هەروەها کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) چووە مەدینە، بە شێوەی داگیرکەر، یان رزگارکەر نەچووە ناویەوە، بەڵکو لەسەر (پەیمان) بەستن لەگەڵ خەڵکەکەی لە بەیعەتی عەقەبەی یەکەم و عەقەبەی دووەمدا، پاشان لەسەر بنەما و دەستوورێکی روون کە دەستووری مەدینە بوو.

بە بەرنامەی خۆزاڵکردن خۆی پێدا نەکرد، بەڵکو پێشتر موصعەبی کوڕی عومەیری ـ خودا لێ ڕازی بێ ـ وەك یەکەم سەفیری ئیسلام ناردە ناویانەوە و هەموو ئەرك‌و ئامانجێکی بانگەوازی خەڵکی بۆ ئیسلام‌و فێرکردنی بنەماو رێنموونییەکانی بۆ رۆشنکردنەوە.

---

[1] رواه احمد في مسنده رقم ١٨٥٢٨، قال المحقق الأرناؤوط: (إسناده حسن).

نەك نەخشە و پلان و ڕێكخستنی نهێنی و دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا، پاشان سەپاندنی شەریعەت بەسەر خەڵكەكەیدا لە ڕێگەی زۆر و زەبر و زەنگەوە، وەك هەندێك بۆچوونیان وایە، دەسەڵاتی حكومەتەكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەر سیستەمی كودەتا دانەمەزراو دروست نەبوو.

مەبەستمان ئەوەیە كە بیروباوەڕ چەسپاندن گەورەترین زەمینەسازییە ـ دەبێ پێش بخرێت ـ لە پێناو چاندنی تۆوی شەریعەت و ڕواندنی درەختەكەی لەناو دەروونی باوەڕداراندا، ئەگەر وانەكرێت جێبەجێكردنی شەریعەت لە زەمینەیەكی وشكو بێ ئاو و بیاباندا هیچ سەوز ناكات.

ئالێرەوە لەو فەرموودەیەی دایكمان عائیشە ـ خودا لێ ڕازی بێ ـ تێ دەگەین كە وتوویەتی: (إنما نزل أول ما نزل منه ـ أي القرآن ـ سورة من المفصَّل، فيها ذكر الجنة والنار، حتى إذا ثاب الناس إلى الإسلام نزل الحلال والحرام، ولو نزل أول شيء: لا تشربوا الخمر" لقالوا لا ندع الخمر أبدا. ولو نزل لا تزنوا، لقالوا: لا ندع الزنا أبداً).[1] واتە: كاتێ سەرەتا قورئان دابەزیە خوارەوە سورەتێكی دورودرێژ دەهاتە خوارەوە باسی بەهەشت و دۆزەخی تێدا بوو، تا وای لێهات خەڵكی لەسەر ئیسلام سەقامگیر بوون، پاشان ئایەتی حەڵاڵ و حەرام دابەزی، ئەگەر سەرەتا بیگوتایە مەی مەخۆنەوە حەرامە، خەڵكی دەیانگوت: قەت وازی لێ ناهێنین، یان بیگوتایە زینا و داوێنپیسی مەكەن، خەڵكی دەیانگوت: هەرگیز وازی لێ ناهێنین.

كەواتە باوەڕ ـ كە لە قەناعەتی دڵ و ویستنی ئازادەوە ـ بێت ئەوە سەرەتایەكی زۆر پێویستە تا بە دڵ و گیان دەست بگرن بە شەریعەتەوە و باقی داواكانی تریش.

---

[1] رواه البخاري.

ئەمەش پێچەوانە نییە لەگەڵ قبووڵکردن و پابەندبوونی سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگەی موسڵماندا، لەگەڵ پەیڕەو پرۆگرامی سیستەمی ئیسلامیدا لە شوێنە گشتییەکاندا.

تەنانەت ئەگەر ئەو ئەندامەش موسڵمان نەبێت، چونکە با هەر بیروبۆچوون و قەناعەتێکی خۆی هەبێت ئەگەر بوو بە ئەندامی کۆمەڵگەیەکی تر.

ئەو بەئەندامبوونەی وا پێویستەکا لەسەر بنەما و پەیڕەو و پرۆگرامی ئەو کۆمەڵگەیە بڕوات و قبوڵی بێت، بەتایبەت ئەگەر ئەو سیستەمە ڕێزی گرتبێت لە تایبەتمەندییە سەربەخۆکانی ئەو کەسە، ئەو کاتە ملکەچکردن و گوێڕایەڵی ئەو تاکە لە ویستێکی سەربەخۆ و حەزێکی دەروونییەوە دەبێت بە دوور دەبێت لە زۆرلێکردن و مل قەوچاندنەوە.

دواتریش بە درێژتر لەسەر ئەم باسە ئەدوێین.

ـ ٧ ـ

## شەریعەت لە خواوەیە و جێبەجێکردن لە مرۆڤەکانەوە

هەروەها ئەوەی پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین لە بابەتی واتاکانی (شەریعەت) و چۆنێتی لە جێبەجێکردنەیدا، ئەبێت جیاوازیی بکەین لە نێوان شەریعەت و جێبەجێ کردندا.

شەریعەت : (وەك پێشتر پێناسەمان کردووە) بریتییە لە بەخششێکی خوایی لە ڕێگای وەحییەوە دابەزیوە و لە کۆمەڵێك ئەحکامی گشتگیر و بەڵگەنەویستی گشتیی پێکهاتووە.

بەڵام (جێبەجێکردن): کردەیەکی بەشەرییە، هەوڵو تێکۆشانی مێژوویی ئەو بەخششە خواییەیە.

جێبەجێکردن، معسوم و بێ هەڵە و پەڵە نییە ـ مەرجیش نییە خودی ئایین بێت، جاری وا هەیە جێبەجێکردن پێچەوانەی ئایینە، یان جاری وا هەیە جێبەجێکردن مەبەستە باڵاکانی ئایینی ئیسلام ئەشێوێنێ و پێچەوانەی مەبەستەکانیەتی، ئەمەش مانای ئەوەیە کە (جێبەجێکردنی شەریعەت) وا دەبێت پڕاوپڕ پێچەوانە بێت لەگەڵ (شەریعەت) خۆی.

کەواتە ڕەخنەگرتن لە جێبەجێکردنی شەریعەت و ڕەدکردنەوە و نەهێڵانی جێبەجێکردنی مانای ئەوە نییە کە دژایەتی و پێچەوانەی شەریعەتکردنە.

جێبەجێکردنی شەریعەت بەندە بە بنەما و دەقە گشتییەکانی شەریعەت و هەموو جێبەجێکردنێك مەرج نییە پڕاوپڕ گونجاو بێت لەگەڵ مەبەستە باڵاکانی شەریعەتدا.

شەریعەت: کردەیەکی خواییە و جێبەجێکردن کردەی بەشەرەکانە، شەریعەت بێ هەڵە و پەڵە و پیرۆزە، بەڵام جێبەجێکردن بێ هەڵە و پەڵە نییە و پیرۆزیش نییە. شەریعەت لایەنێکی بابەتییە و جێبەجێکردنیش لایەنێکی خۆیی و رێژەییە، شەریعەت شوێن و کاتی بۆ نییە و بۆ هەموو شوێنو سەردەمێك گونجاوە، چونکە چەند بەها و بنەمایەکی بەرزی خوایین و بەو پێیە لە سەرووی مێژووەوەیە.

بەڵام جێبەجێکردن کردەیەکە بە چواردەورە کاتی و شوێنییەکەیەوە و توانای گونجانی نییە لەگەڵ هەموو شوێن و سەردەمێکدا و بەو پێیە جێبەجێکردن بەندە بە مەرجی مێژووەوە.

ئالێرەدا ئەڵێین: زانایانی شەریعەت لە سەردەمەکانی رابردوودا بە جۆرێ شەریعەتیان جێبەجێکردووە کە زۆر جیاواز بووە لەم سەردەمە هاوچەرخەی ئێستا لە هەموو روویەکەوە و پێویست نییە و ناچارنیین ئێمە بەدوای ئەواندا برۆین و دەقاودەق جێبەجێی بکەین.

نەك ئەوەندە بەڵکو هەموو کۆمەڵگەیەك ـ بەپێی قۆناغە مێژووییەکانی ـ پێویستی بە جێبەجێکردنێکی نوێ هەیە بۆ شەریعەت کە بگونجێت و وەڵامی واقیع و سەردەمە نوێیەکە بداتەوە، بەپێی بنەما و یاساو مەبەستە باڵاکانی شەریعەت. "ئیسلام وەك ئایینێکی خوایی نموونەیەکی باڵایە (مثالی)، بەڵام هەستانی مرۆڤەکان بە بەرپاکردنی ئایین و جێبەجێکردنی واقیعەکەیە.

بەردەوام مەودایەك هەیە لە نێوان نموونە و واقیعدا، لەگەڵ بوونی ئەم مەسافەیەدا مرۆڤەکان هەوڵی زیاتر ئەدەن بۆ بەرەوپێشچوون و زیاتر نزیك کردنەوە و گۆڕینی واقیعەکە ـ لەو نموونە باڵایە، ئەگەر ئەم بەردەوامییە

نەبوایە ئەوا ژیان خاڵیی دەبوو لە خشتەی کارەکانی و هەموو زیندووەکانیش نائومێد و بیٚ هیوا دەبوون". [1]

حەزئەکەم لێرەدا ئاگادارییەك بدەم، تا خەڵكی لێیان تێك نەچێت، چونکە من ئەم قسانەم لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەت نییە وەك بەرنامە و پەیڕەو، پەیڕەوکردنی شەریعەت لە لایەن موسڵمانانەوە ـ قسەی تێدا نییە کە ـ فەرزە. بەڵام قسەمان لەسەر شێوازی (جێبەجێکردنەکەی) شەریعەتە، وەك کردە و هەڵسوکەوتی بەشەری، چونکە جێبەجێکردن هەرگیز نەبووە بە بەشێك لە شەریعەتەکە خۆی، چونکە بیٚ هەڵە و پەڵە ـ معصوم ـ نییە.

لەبەر ئەو هۆیەیە کە دەبێت بەردەوام جێگای رەخنە و پێداچوونەوەی بەردەوام بێت.

---

[1] صحيفة الحياة، محمد عمارة، العدد ١٠٨٦.

-٨-

## شەریعەت هەمووی یەکلاکراوە ـ قگعی ـ نییە

هەروەها.. ئەوەی لە بابەتی واتای شەریعەتدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین، ئەوەیە کە جیاوازیی بکەین لە نێوان دەقەکانی شەریعەتدا و ئەوەی لە ئاستی یەکلاکراوە ـ قطعي ـ دایە، جیای بکەینەوە لەوەی لە ئاستی یەکلانەکراوە و ـ ظني ـ دایە.

ئەوانەی کە دەقی گومان هەڵنەگرن چەند دەقێکی دیاریی و کەمن، بەڵام دەقە لاواز و یەکلانەکراوەکان زۆرتر و زیاترن.

یان لەسەر زمانی فیقهزانە هاوچەرخەکان: ئەبێ جیاوازیی بکرێت لە نێوان شەریعەت و فیقهی شەریعەتدا، شەریعەت خۆی چەند ئەحکام و حوکمێکی بێگومان و قەتعین، بەڵام ئەحکامە فیقهییەکان چەند حوکمێکی وەرگیراو و یەکلانەکراوەن ـ ظني ـ.

پێناسەی شەریعەتیان کردووە بەوەی کە: کۆمەڵە حوکمێکی خوایین و خراونەتە دووتوێی چەند دەقێکەوە. بەڵام فیقه بریتییە لە: دەرهێنان و هەڵهێنجانی کۆمەڵە حوکمێك لەو بەڵگە گشیتیانەی شەریعەت لە رێگەی هەوڵێکی بەشەری نامەعصووم.

ئەمەش مانای ئەوە ناگەیێنێت کە هەموو کتێب و نووسراوە فیقهییەکانی سەردەمەکانی پێشوو هەموویان فەرمانو ئەحکامی گوماناوین و هەوڵێکی زاناکانە و بەس، نەخێر، بەڵکو بەشێکی یەکلاکراوە و قەتعییە و بەشێکیشی یەکلانەکراوەن و ظنییە، بە مانای ئەوەی ئەم ئەحکامە خواییە دابەزیوە و ئەو ئەحکامە بەشەرییەکانە کە ئاکامی هەڵگۆزینی زاناکانە لە ئەحکامە یەکلاکراوەکان.

بەڵام لێرەدا قسەمان لەسەر ئەو پاشماوە فیقهییانە نییە کە لە ڕێگای مەزهەبە فیقهییەکانەوە پێمان گەیشتوون، بەڵکو قسەکە لەسەر خودی فیقهەکەیە وەك کارو پیشەیەکی بەشەری، کە کردارێکی نێوانگیرییە لە نێوان نیگای خوا و واقیعەکە.

وەحی و نیگای خوایی، نەگۆڕ و جێگیرن، واقیعیش بەردەوام لە گۆڕاندایە و فیقهزانەکان لەم نێوەندەدا کاریان نێوەندگیرییە، حوکمە شەرعییەکان بەسەر ئەو واقیعەدا جێبەجێ دەکات و حوکمی مەسەلە پێشهاتەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەصڵ و حوکمە گشتییەکان.

بێگومان فیقهزانەکان لەم کارەیاندا پشت ئەبەستن بە بنەماکانی دەرهێنانی ئەحکامەکان وەك قیاس و عورف و بەرژەوەندیی و بەباشزانین و شتەکانی تر. هەموو ئەو کردارانە لەگەڵ ئەو زانستی و پرۆگرامی و بابەتییەیدا ـ تا ئاستێکی باش ـ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر بە هەوڵ و کردەیەکی بەشەری، بێ هەڵە و پەڵە نییە و هەردەم لەبەردەم پیاچوونەوە و ڕەخنەدایە.

بەکورتی، بێ هەڵەیی و پیرۆزی بۆ دەقە نیگاییەکانە و بەس، ئەو دەقانەی کە هەڵگری کۆمەڵێ فەرمان و ئەحکامی یەکلاکەرەوە و جێگیرن.

ئەم جیاوازییکردنە سوودی چییە؟ سوودی ئەوەیە کە جیاوازیی بکەین لەنێوان پابەندبوون و ملکەچیی بۆ خودی شەریعەت و لە نێوان ئەو کەلەپوورە فیقهییە کە زانایانی شەریعەت دەریان هێناوە بۆمان.

یەکەمیان: شوێنکەوتن و ملکەچیی کردن بۆ شەریعەت لە ئەنجامی باوەڕەوەیە بە نیگای خوایی.

دووەمیان: لاساییکردنەوە و دەمارگیریی و چەقبەستوویی و داخرانی بەدوادا دێت.

یەکەمیان گومانی تێدا نییە ئاینە، بەڵام دووەم مەرج نییە ئایین بێت، زۆرێك لەوانەی دروشمی جێبەجێکردنی شەریعەتیان هەڵگرتووە، ئەم دوو شتەیان تێکەڵ کردووە کە ئەحکامی شەرعی و کەلەپووری فیقهییە.

بێگومان سامانی فیقهی لەگەڵ ئەو بەهاو نرخ و گەورەییەیدا کە ناتوانین هەرگیز لێی بێ نیاز بین، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە کۆتاییەکەیدا وەك هەوڵێکی بەشەری ئەمێنێتەوە و قەت ناگاتە ئاستی پیرۆزی و بێ هەڵەو پەڵەیی.

بەڵێ، بەشێك لەو کەلەپوورە هێشتا هەر چاکە و بەسوودەو کاریگەرە و وەڵامدارەوەی پرسیارەکانی واقیع و هاوچەرخە، بەڵام تیاشیایەتی پەیامی خۆی گەیاندووە و جێبەجێکردنی بۆ ئەمڕۆ ناشێت و لەکاتێکی مێژووییدا رۆڵێکی گرنگی هەبووە. هەندێکیشی راوبۆچوونی خراپن و ناباوو شازن، نابێ پشتیان پێ ببەسترێ و جێبەجێ بکرێن. کەواتە لە روانگەی ژیرییەوە ـ منطق ـ نابێت وا بزانین کە هەرچی کەلەپووری فیقهییە هەموویان راستییە شەرعییەکانیان لە ئەستۆ گرتووە، هەر ئەوانە بەسن بۆمان.

بە هیچ شێوەیەك نابێ بەم بەرنامە داخراوییەوە سەیری هەموو فیقه بکەین! هەروەك زانا و فەقیه و فەیلەسوف (ئیبن روشد) رەحمەتی خوای لێ بێت ئەڵێ: "دەقە شەرعییەکان ـ قورئان و سوننەت ـ سنووردان، رووداو و پێشهاتەکان بێسنوورن، دەی ئەستەمە بەراوردکردنی بێسنوور لەگەڵ

سنووردارد‌ا، کەواتە پێویستە کار بە قیاس[1] و دەرهێنانی حوکمی تازە بکرێت لە مەسەلەگەلێکدا کە هیچ دەقێکیان لەسەر نەهاتووە"[2].

هەروەها سوودێکی تری ئەم جیاکردنەوەیە، کە ئێمە لە کاتی کاری سیاسیی و حوکمڕانیماندا نابێت بە زۆر خەڵکی بخەینە سەر ڕێڕەو و مەزهەبێکی تایبەت یان قوتابخانەیەکی فیقهی تایبەت یان فەرزکردنی فەتوای زانایەك لە مەسەلەیەکدا کە رای جیاوازیان هەیە تیایدا و هاوڕانین لەسەری، یان سەپاندنی فەتوایەکی زانایەك کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و زیانبەخشی ـ مصالح ومفاسد ـ، یان لەسەر بنەمای رێگری لە خراپتر ـ سد الذرائع ـ، بنیاتنرابێت، کە بە سروشتی خۆی جێگای جیاوازییە، چونکە بۆچوونەکان لەوبارەیەوە جیاجیا و جیاوازان.

هاوشێوەی ئەم ئاستەی جێبەجێکردنی شەریعەت لەم حاڵەتەدا دەبێت حکومەت بێلایەن بێت و بەڵکو هەموو بۆچوونە جیاوازەکان بگرێتە خۆی و کاری پێ بکات، وە ئەگەر وانەکات ئەوا حکومەتەکەی دەبێتە حکومەتێکی خۆسەپێنی چەوسێنەرەوە.[3]

پێشەوا ـ جوینی ـ رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت:

سەرۆك‌و و سەرکردەکانی وڵات نابێ لە مەسەلە فیقهییە جیاوازەکاندا ـ کە جێگای مشتومڕن و لەسەری یەکڕانین ـ خۆی بخات بەلایەکدا و رایەك بسەپێنێ بەسەر گەلەکەیدا، بەڵکو رای هەر ئیمامێك تەنها بەسەر

---

[1] بداية المجتهد ونهاية المقتصد، المقدمة.

[2] قیاس واتە: گەڕاندنەوەی حوکمی مەسەلەیەك کە دەقی لەسەر نەهاتووە بۆ لای مەسەلەیەکی تر کە دەقی لەسەرە و لەیەك دەچن لە چەند روویەکەوە.

[3] میللەتیش لێی وەڕەس دەبن و تووڕە دەبن و رای دەماڵن. وەرگێڕ.

شوێنکەوتەکانیاندا جێبەجیٚ بکات و نەبێتە رێگر لە کارکردن بە مەزهەبی خۆیان و چاو دانەخات لە داواکارییەکانیان.[1]

پێشەوا ئبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لیٚ بێت) ئەڵیٚ: "لەبەر ئەم هۆیەیە کە زانا نووسەرەکان لەبارەی فەرمان بە چاکە و بەرگریی لە خراپە وەك شافیعییەکان دەڵێن: "وێنەی کۆمەڵە مەسەلەیەکی ئا لەم چەشنە ـ واتە مەسەلە خیلافییەکان ـ بەزۆر جێبەجیٚ ناکرێن و کەسیش بۆی نییە خەڵك ناچار بکات بە زۆر شوێن یەکیٚ لەو رایانە بکەون، بەڵکو بە بەڵگەهێنانەوە و لێکۆڵینەوەی زانستییانە قسەیان تێدا دەکرێت، وە هەرکاتێکیش گەشتە رای بەهێز و دروست دەبیٚ خۆی شوێنی بکەوێت و بۆی نییە سەرزەنشتی ئەوانەش بکات کە لاسایی و تەقلیدی رایەکەی پێشوو دەکەن"[2].

بەڵکو ئیبن تەیمیە کۆدەنگیی زانایان دێنیٚ لەسەر ئەم بنەمای لێبوردەیی و فرە بۆچوونییە و دەڵیٚ: "حاکمو دەسەڵات بۆی نییە خەڵکی لە مەزهەب و رایەکانی خۆیان لابدات و ناچاریان بکات کە برۆنە سەر رایەکی تایبەتی ئەو، ئەگەر ئەمە رەوا بێت، ئەوکاتە بۆ کەسانی تریش دروست دەبێت وا بکەن، دواتر ئەمە سەرئەکێشیٚ بۆ ناکۆکیی و جیاوازیی نانەوە"[3].

هەروەها (رەحمەتی خوای لیٚ بێت) ئەڵێت: "ئەحکام و مەسەلە گشتییەکان کە موسڵمانان تیایدا یەکسانن ئیتر کۆدەنگ بن لەسەری یان رای جیاوازیان هەبێت، بۆ فەرمانڕەواکان نییە خەڵکی بە زۆر لەسەر رایەك کۆبکاتەوە، بەڵکو ئەویش وەك هەر زانایەکی تر بەپێی زانیاری و بەڵگەکانی

---

[1] غیاث الأمم في التیاث الظلم، ل١٨٩.

[2] مجموع الفتاوی، ٨٠/٣٠.

[3] الفروع لابن مفلح، ١١٠/١١.

بەردەستی حوکم دەدات، بەڵکو لە چەند مەسەلەیەکی تایبەتدا حوکم دەکات بەسەر خەڵکدا"[١].

لە لاپەڕەکانی داهاتوودا (بە ویستی خوا) باسی ئەو مەسەلە تایبەتانە ئەکەین.

ئەوەبوو کاتێ خەلیفەی عەباسی (ئەبو جەعفەری مەنصوور) ویستی هەموو وڵات و هەرێمەکانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی عەبباسی کۆبکاتەوە لەسەر مەزهەبێکی دیاریکراو، بە پێشەوا مالیکی وت : سوێند بە خوا ئەگەر بمێنم هەموو وتەو و رایەکانت ئەنووسمەوە وەك چۆن قورئان نووسراوەتەوە، ئەینێرم بۆ هەموو کوونو قوژبنێکی وڵاتەکەم و جێبەجێی ئەکەم بەسەریاندا.

پێشەوا مالیك (رەحمەتی خوای لێ بێت) وەڵامی دایەوە و وتی: ئەی سەرکردەی باوەڕداران شتی وا نەکەیت، خەڵکی پێشتر وتە و فەرموودەیان پێگەیشتووە و ریوایاتی خۆیانیان لەلایە، هەر گەلێك شوێنکەوتەی ئەو مەزهەبانەن و گوێڕایەڵییان دەکەن و چ مەسەلەکان کۆدەنگ بن یان رای جیاواز. وازپێهێنان و زۆرلێکردنیان بۆ گۆڕینی مەزهەبیان شتێکی قورسە، بۆیە وازیان لێ بێنە با بەردەوام لەسەر راو مەزهەبی خۆیان بن، کە خۆیان هەڵیانبژاردووە بۆ خۆیان"[٢] [*].

---

[١] هەمان سەرچاوە.

[٢] الطبقات لابن سعد (٤٤١/١)، ومجموع الفتاوی ٧٩/٣٠.

[*] (هەرچەندە ئەو هەنگاوانەی سەردەمی ئیمام مالیك بۆ نزیکبوونەوەی راوبۆچوونەکان زۆر قوورس و مەحاڵ بوون، چونکە زانای ناوچە جیاجیاکان یەکتریان نەدیوە و وەك ئەمڕۆ فڕۆکە و ئینتەرنێت و موبایلی زیرەك وە کەناڵی ئاسمانی نەبووە، بۆیە ئەمڕۆ زۆر ئاسانترە کە موسڵمانان لەسەر رای بەهێز و جوانتر و گونجاوتر بۆ ئەم سەردەمەی ئێستامان ئاسانە و دەوڵەت ئەتوانێت زانایان کۆبکاتەوە و دوور لە دەمارگیریی و زۆرلێکردن، فیقهێکی شەرعی سەردەمیانە بنووسنەوە کە پوختەی مەزهەبە فیقهییەکان بێت لەسەر بنەمای بەڵگەی بەهێز). (وەرگێڕ)

هەندێ لە زانایان رایان وایە لە هەندێ لە مەسەلەکاندا، حاکم ئەتوانێت کۆمەڵگە پابەند بکات بە رایەکی تایبەتەوە لەبەر بەرژەوەندیی گشتی و ئەمەش بە چەند مەرجێك ئەتوانێ بیکات، لەوانە:

یەکەم: ئەمە تایبەت و جیا بێت، نەك بە کراوەیی بمێنێتەوە و هەرکاتێ حکومەتی ئیسلامی هات بەسەریدا و هەرچی بیەوێت یەکسەر میللەت پابەند بکات پێوەی، ئەصڵ ئەوەیە کە لە مەسەلە خیلافییەکاندا ـ موسڵمانان ـ سەربەست بکات و بەزۆر ڕایەکی دیارییکراو نەسەپێنێت بەسەریاندا مەگەر لە سنوورێکی تەسکی دیارییکراودا.

دووەم: لە مەسەلە رێکخستنییەکاندا بێت، وەك ماف و گرێبەست و سزاکاندا بێت، ئەمانە و هاووێنەیان کە مەسائیلگەلێکن پەیوەندییان بە دەوڵەتداریی و رێکخستنی ئیشوکاری رۆژانەی کۆمەڵگە بە گشتییەوە هەبێت. بە پێچەوانەی مەسەلەکانی بیروباوەڕ و پەرستشەکان، یان مەسەلە تاکە کەسییەکان کە پەیوەندییان بە سلووك و هەڵسوکەوتی تاکەکانەوەیە، وەك لەبەرکردنی جلوبەرگ و جوانی و خۆشی دەربڕین و پەیوەندییەکان، یان هەموو کارێکی تاکە کەسیی ـ شخصی ـ و هتد.

ئا لەم جۆرە مەسەلە شەرعییانەدا نابێت میللەت پابەند بکرێت بە رایەکی تایبەتییەوە، ئەمە هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نییە مادەم رای جیاوازی لەسەرە.

سێیەم: ئەوەی لە فیقهی تەقلیدا ناوی لێنراوە ـ حاکم ـ فەرمانڕەوا ئیشی ئەو ئەوەیە خەڵکی لە مەسەلە رێکخستنییەکاندا و لەبەر بەرژەوەندیی گشتی پابەند بکات بە ڕایەکی دیارییکراوەوە.

خۆ مەبەست لە وشەی حاکم یان سەرۆکی وڵات ـ لەو تاکە کەسە نییە کە پێی ئەڵێن سەرۆك یان حاکم ـ وەك وا باوە لە کتێبە فیقهییەکاندا کە هەموو دەسەڵاتە رەهاکان دەگرێتەوە بۆ حاکمی رەها، ئیتر چ بواری (جێبەجێکاری یان یاسادانان یان دادوەریی) بێت، حاکمی تاکڕەوی خۆسەپێن دەیانخات بە لایەکدا.

ئەوەش کە حاکمی رەها هەبێت، هەموو کارەکان خراپ ئەکات و ئەشێونێت، بۆیە زۆر پێویستە لەسەرمان پیاچوونەوە بکەین بە واتا و مانای (حاکم، دەسەڵاتدار)، لە فیقهی سیاسیی ئیسلامیدا، چونکە زاراوەی (حاکم) لە فیقهدا زۆر مەسائیلی شەرعی پێوە بەندە وەك دەستەواژەی (حوکمی حاکم ناکۆکییەکان یەك ئەخات) و (حاکم بۆی هەیە هەندێ لە حەڵاڵەکان سنووردار بکات) و (حاکم ئەتوانێت نرخ دیاریی بکات) و (باج بخاتە سەر هاوردە و هەناردە)و هتد....

کەواتە دووبارە دارِشتنەوەی واتای (حاکم) لەو پاشماوە فیقهییە سیاسییەدا کە بۆمان ماوەتەوە لەسەر بنەمای (سەروەری گەل)، رۆڵی خۆی ئەبێت لە سنووردارکردنی حوکمی حاکمی رەها لە مەسائیلە فیقهییە مێژووییەکاندا.

لێرەدا سەرۆك و سوڵتانی راستەقینە (گەلو ئوممەتە) و ئوممەت ئەسڵە و خۆیشی سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە، نەك تەنها ئەو کەسەی ناوی ـ حاکم ـ یان ـ خەلیفە ـ یە، بکوژ و ببڕ خۆی بێت و خۆی (کل في کل) بێت.

کەواتە ئوممەت، گەل، لە رێگای ـ ئەنجومەنی یاسادانان ـ ەوە ئەو بۆی هەیە سەرپشك بێت لە دەرکردنی سیاسەتی شەرعیدا و لە تایبەتمەندیی

ئەویشە خیلاف و ناکۆییەکان بخات بەلایەکدا و رایەکی گونجاوی دیارییکراو هەڵبژێرێت و کاری پێ بکات لەبەر بەرژەوەندیی گشتی.

یەکلاکردنەوەی پەرلەمان لێرەدا مەبەست هەڵبژاردنی رایەکی تایبەتی نییە بەسەر رایەکانی تردا، تا کەسێ بێت و بڵێت پێویستە پەرلەمان مەرجی حوکمی شەرعی دەرهێنان و یان هەڵبژاردنی رای دروست، وەك هەندێك وا گومان ئەبەن. بەڵکو مەسەلەکە لێرەدا دروستکردنی حوکمێکی سیاسیی دەستڕۆیشتووە، دەرکردنی حوکمی سیاسی لە ئەسڵدا تایبەتە بە دەسەڵاتی سیاسییەوە، لەبەرئەوەشە کە زاناکان دەڵێن: (دەسەڵاتدار ناکۆکییەکان ئەخات بەلایەکدا، ئەم خستن بەلایەکدا لە روانگەی دەسەڵاتی جێبەجێکارییەوە نەك لە لایەنی هەڵبژاردنی رای فیقهی دروست...

ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بارەیەوە ئەڵێ: "ئوممەت ـ گەل ـ ئەگەر لە مانای ئایەتێك یان فەرموودەیەکدا جیاوازییان هەبوو، یان لە حوکمێکی ئیجتیهادی، یان قەزاییدا، نەیانتوانی دروستی و نادروستی حوکمەکەی بخەن بە لایەکدا، تەنها بە حوکمی حاکم ناخرێت بە لادا و ئیلتزامی نابێت.

بەڵکو حوکمی حاکم تەنها لە کۆمەڵی فەرمانی دیارییکراودا دەبێت نەك لە هەموو حوکمێکدا ـ تەنها لە سکالاکاریی و دووبەرەکی و ناکۆییەکان دا ـ ئەو حوکم یەکلایی دەکاتەوە.

چونکە ئەگەر لە هەموو مەسەلەکاندا بوایە، ئەی ئەو کاتە دەبوو لە حوکمی ئایەتی: (والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء)[1]دا مانای قورئی

---

[1] سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٨).

دەخست بە لایەکدا، کە ـ پاکێتییە یان بێ نوێژیی!وە هەموو خەڵکیش بە ناچاری مولزەم ئەبوون پێیەوە.

یان ئایەتی (أولامستم النساء) چوونە لای ئافرەتە بە سەرجێی، یان پێست بەر پێست کەوتنە!

یان ئایا ژن بە شوودان بە دەست کێ بێ ـ مێرد یان باوك یان سەرگەورە ـ، کە ئەمە کەس پێی وانییە و بە دەست باوکە نەك مێرد و ئاغاکان.

یان جیاوازیی لە مانای (الاستواء) لە ئایەتی: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى)[1] واتە: خوای گەورە بەخۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، وشەی (استوی) واتە دانیشتن لەسەر شتێ، بەڵام چۆنیەتییەکەی نەزانراوە، کەچی هەندێ لە ئەهلی عیلم رەددی ئەمە ئەدەنەوە و ئەڵێن کەس لەسەر عەرش نییە و بەڵکو مانای ئایەتەکە ـ لەلای ئەوانە ـ وایە کە توانای بەسەر عەرشدا هەیە، دەی حوکمی حاکم چی سوودێکی هەیە رایەکیان دان پێدا بنێت و هەر ر ایەکیان رەدد بکاتەوە چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت"[2].

فیقهزانان جیاوازییەکی زۆریان لەناودایە لەسەر مەسەلەی ئایا مانای چییە دەستەواژەی (حکم الحاکم یرفع الخلاف) بە مانای حوکمی حاکم ئەتوانێ ناکۆییەکان بخات بەلایەکدا؟

ئایا چ کاتێك ناکۆکیی ئەخات بە لایەکدا؟ ئەی باشە چۆن و بە چ میکانیزمێك ئەیخات بە لایەکدا؟ مەرجەکانی چین؟ بە وردی سەیری رای زانایان بکەیت، دەبینیت پەشۆکان و خراپ حاڵیی بوونێك بەدی دەکەیت.

---

[1] سورەتی (طه) ئایەتی (٥).

[2] مجموع الفتاوی، ٢٣٨/٣.

هۆكارەكەشی بەڕای من، ئەوەیە كە حاكم لەو سەردەمانەی ئەواندا تاكە دەسەڵاتدار بوو، هیچ یاسا و دەستوورێك نەبوو كۆتوبەندی بكات وەك پەرلەمانەكانی ئەمڕۆ.. مەگەر ویژدانی خۆی و ئاستی دینداریی و لەخواترسان یان زانست و فیقهی ئەگەر كەسێك زانا بووبێت.

ئیتر هیچ دەستوورێك نەبوو گرنتی ئەوە بدات كە سەرۆك ـ پابەند بكات و رێگری زوڵم و زۆر و خۆدەوڵەمەندكردن و بە ئارەزوو حوكمدانی لێ بكات.

ئێ پاشان ناكۆكیی لابردن زۆرجار لە لایەن حاكمەوە لە رێگەی ئارەزوو و حەزی شەخصی و بێ ئاگاییەوە مەسەلەكان یەكلایی ئەكاتەوە، چۆن دەبێت؟

بەڵام ئەو ترسانە ـ روونادات ـ لەگەڵ بوونی دەستەیەكی گەورە كە گەل هەڵیان ئەبژێرێت و دەبنە چاودێر بەسەر كارەكانی حكومەت و سەرۆكەوە، چونكە لە ئارەزووچێتی و گەندەڵیی بەدورتر دەبێت، بەتایبەت لەگەڵ بوونی دەزگای دەستووریی و دادوەریی و رێكخراوە چالاكوانە مەدەنییەكان و بوونی دەسەڵاتی چوارەم كە راگەیاندنە...

پوختەكەی... لە مەسەلە خیلافی و ناكۆكەكاندا نابێ بە زۆر خەڵكی پابەندی رایەكی تایبەت بكرێت، ئیتر ئەمە ئەصڵ وایە، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی كەما و جیادا و لە مەسەلەی كاری رێكخستنی وڵات و بۆ بەرژەوەندییەكی گونجاوی گشتی بێت دروستە.

ئەم كارەش كە ئەڵێین دروستە لە كارو تایبەتمەندیی گەلە لە رێگەی نوێنەرەكانیانەوە و لە ئەنجومەنی یاسادانانەوە دەبێت لە رێگای تاكە سەرۆكێكی دەسەڵاتدارەوە.

- ٩ -

## شەریعەت دوو بەشە

ئەگەر ئەوەمانزانی کە گەلی موسڵمان ئەصڵە و سەروەریی بۆ ئەوە، کاری ئەوە کە هەوڵی جێبەجێکردنی شەریعەت بدات لە رێگای دەزگا جۆراوجۆرەکانییەوە.

حکومەت بە تەنها دەزگایەکە لەناو دەزگاکانی تردا، هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی ئەو بەشەی شەریعەت کە تایبەتە بە ئەو، لەناو شەریعەتە گشتییەکەدا.

ئەی ئەم بەشەی تایبەتە بە ئەو کام بەشەی شەریعەتە، کە پێویستی بە دەسەڵات هەیە لە جێبەجێکردنیدا؟

پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئەمەوێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە دروستی ئەم پرسیارە لەوەدایە کە شەریعەت هەر هەمووی کۆمەڵە یاسایەك نییە کە وڵات هەستێت بە جێبەجێکردنی، وە لە رێگایەوە بتوانێت دابەزێتە ناو کۆمەڵگە و بێتە ناو شوێنە گشتییەکان، هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە ناچار بکات بۆ جێبەجێکردنی.

بەڵێ، شەریعەت کۆمەڵی لایەنی یاسایی هەیە کە پێویست ئەکات دەسەڵاتێکی سیاسیی جێبەجێی بکات، بەڵام ئەم لایەنە زۆر کەمە لە چاو لایەنی باوەڕی و رەوشتی شەریعەت، کە ئەرکی تاکە تاکەی کۆمەڵگە موسڵمانەکەیە بە ئارەزوومەندانە جێبەجێی بکەن، بەبێ زۆرلێکردن و مل قەوچاندنەوەی دەرەکی و دوور لە زۆری حکومەت، بەڵکو دەوڵەت ئەبێت لەم حاڵەتەدا بێلایەن بێت.

لەڕاستییدا فیقهزانانی پێشوو، ئەم دوو لایەنانەیان لەیەك جیاکردووەتەوە، زاراوەی (مافەکانی خوا)یان بەکارهێناوە و مەبەستیان هەموو ئەو مەسەلانەیە کە پەیوەندن بە پابەندبوونە ئەخلاقیاتەکانە لەلایەن تاکی موسڵمانەوە.

لەلایەکی ترەوە زاراوەی (مافەکانی خەڵکی)یان بەکارهێناوە بۆ ئەو پابەندبوونە یاساییانەی ناو کۆمەڵگە.

هەروەها زاناکان جیاوازییان کردووە لە نێوان ڕاڕەوی فەتوا و ڕاڕەوی دادوەری و قەزایی، ڕاڕەوی فەتوا لەلایەن یاساییەوە بەزۆر ناسەپێنرێت بەسەر تاکەکاندا، بەپێچەوانەی ڕاڕەوی دادوەرییەوە کە بەپێی یاسا دەسەپێنرێت بەسەر میللەتدا.

ئا لێرەوە ئەو هەڵە تێگەیشتنە باوە دەرئەکەوێت کە هەندێك شەریعەت بەشێوەیەکی گشتی بە هاومانا و بەرامبەری یاسای دادەنێن، لەڕاستییدا شەریعەتی ئیسلامی کە پێکهاتووە لە دەقەکانی قورئان و سوننەت یاسایەك نییە کە دەوڵەت فەرزی کات بەسەر کۆمەڵگەدا، بەڵکو ئەسڵ ئەوەیە کە ئاینێکی بیروباوەڕییە و کۆمەڵێ بنەمای ڕەوشتی لەخۆگرتووە و پابەندبوونیشی خۆیەخۆییە ـ ذاتیة الالتزام ـ تاکەکان موسڵمان دەبن و ڕەوشتیان دەگۆڕێت، ئەوەش ئەصڵە لە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامدا و ئەوەش زۆربەیەتی.

بەڵام جارێکی تریش دووبارەی ئەکەمەوە تا خراپ حاڵیی بوون نەهێڵم:

ئەمە مانای ئەوە نییە کە شەریعەت تەنها کۆمەڵە ئەحکامێکی تاکە کەسییە، هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵگە و رێکخستنی کۆمەڵگەوە نییە[1].

بەڵکو ئەوەی کەمترین شارەزایی لە شەریعەتی ئیسلام هەبێت ئەزانێت و بە روونی بۆی دەرئەکەوێت کە لەگەڵ لایەنی رۆحی و ئیمانی و ئەخلاقییە ناوازەکەیدا، کۆمەڵێ ئەحکامی تۆکمەی پەیوەند بە کۆمەڵگەی هەیە بۆ رێکخستنی کاروباری خەڵکی و بەگرنگ سەیرکردنی سیاسەتداری، ئەمەش بەپێی کۆمەڵێ ئەخلاقیاتی دیارییکراو کە شیاوو گونجاو بێت لەگەڵ ئامانج و مەبەستەکانی کۆمەڵگەی موسڵمان، وەك ئەحکامەکانی گرێبەستەکان و مافەکانی و تاوانەکان.

ئا لێرەوە، زۆر پێویستە ئەو ئاڵۆزییەی نێوان ئەم دوو جۆرە لە ئەحکامی شەریعەت بڕەوێنینەوە بەتایبەت کاتێ قسەکە لەسەر پەیوەندیی شەریعەت بە دەسەڵات و کاری سیاسییەوە بێت.

شەریعەت لە روانگەی پەیوەندی بە دەسەڵات و کاری سیاسییەوە ئەبێت بە دوو جۆرەوە[2] :

١ـ ئەحکامە باوەڕییە تاکە کەسیی و ئەخلاقییەکان.

٢ـ ئەحکامە باوەڕییە کۆمەڵایەتییە یاساییەکان.

بەشی یەکەم: ناچێتە خانەی یاسایی و مافپەروەرییەوە، بەمەش بۆ دەوڵەت نییە کە فەرزی بکات لەسەر خەڵکی، بۆ نموونە حەجکردن، فەرمانێکی بڕاوەیە ـ مؤکد ـ و پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، بەڵام واجبێکی

---

[1] وەك لەم رۆژگارەی خۆشماندا هەندێ لە عەلمانی و سیکۆلار بۆی دەچن و بە هەڵە واتێگەیشتوون ئیسلام بۆ تاکە دیموکراسیش بۆ کۆمەڵگە ـ وەرگێڕ ـ.

[2] العقيدة والسياسة ـ لؤي صافي، ل١٦١.

خواناسی و باوەڕییە کە شێوازێکی ئەخلاقی و پابەندبوونێکی خۆیی ـ ذاتیة الالتزام ـ یە.

بە مانای ئەوەی واجبێکی پارێزەری نییە بە جۆری ئەگەر تاك سستی نواند و پەکی خست و جێبەجێی نەکرد، دەسەڵات بێتە دەنگ لە رێگای دەزگا سەربازی و ئەمنیەکانییەوە تاکەکان ناچار بکات هەستن بە ئەنجامدانی حەج.

لەکاتێکدا کە زەکاتدان و مەسروفکردنی بژێوی ماڵ و منداڵ و دانەوەی قەرز و هاوشێوەکانی تر، دەچێتە خانەی بەشی دووەمەوە، بە مانای ئەوەی کە ئەرکێکی باوەڕی و ئەخلاقی و پارێزراوی و یاساییە و دەسەڵات و هێزە تایبەتەکانی دەخاتە کار بۆ ناچارکردنی تاك بۆ پابەند بوون پێیەوە.

ئەم دابەشبوونە لەوەوە هاتووە، کە سروشتی شەریعەت لە لایەنی سیاسی و دەسەڵاتەوە، هەڵدەستێت بە جیاکردنەوەی رەهەندی تاکی و ئەخلاقی لە رەهەندی کۆمەڵایەتی و پارێزەری.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرجەم ئەحکامەکانی شەریعەت لەلایەن (واجبو حەرام)ەکانەوەن ئەبێ هەموان پابەندبن پێوەی وەك ئایین، ئیتر هەر جۆرێ ببێ لە دوو جۆرەکەی پێشوو، چ ئەحکامە تاکە کەسی و ئەخلاقییەکان بێت یان ئەحکامە کۆمەڵایەتیی و مافپەروەرییەکان.

بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە ئەحکامە تاکە کەسییە ئەخلاقییەکان، پابەندبوون پێیانەوە کارێکی خۆیی و ئارەزووی کردنی لە دەستی تاکەکاندایە، بەپێی هەست بە لێپرسراوێتی لەبەردەم خوای تەعالادا، بەبێ سەپاندن و زۆرلێکردنی دەرەکی و حکومی، بەم مانایە ئەنجامدانی کارێکی قیامەتییە و بەس.

بەڵام سەرجەم فەرمان و ئەحكامە كۆمەڵایەتیی و یاساییەكان، پابەندبوون پێیانەوە بە یاسا رێك ئەخرێت و دەسەڵات و دەوڵەت خەڵكی پابەند ئەكات پێیانەوە، بەم پێیە بەرپرسیارێتی قیامەتی و دنیایشی تێدایە لە هەمانكاتدا.

ئەسڵی ئەم دوو بەشبوونە لە ووتەی هەندێ لە فیقهزاناندا هاتووە ئیتر با بە شێواز و دەربڕینێكی تریش بێت، وەك پێشەوا (قەرافی) لە كتێبی (الفروق)دا دەڵێت:

"بزانە كە بەشی پەرستشەكان ـ العبادات ـ هەموویان، حوكمی یەكلاییكردنەوەیان تێدا نییە (مەبەستی لە دەسەڵاتی سیاسی و دادوەریی و جێبەجێكارییە)، بەڵكو تەنها فەتوایە و بەس، چونكە هەر مەسەلەیەك چەند هەڵبژاردنێكی ئارەزوومەندانەی تێدا بوو، ئەوە بێگومان فەتوایە و بەس.

چونكە بۆ حاكم و دەسەڵات نییە حوكمی دروست یان نادروستی بەسەر نوێژی هیچ تاكێكدا بدات، یان بڵێ ئەم ئاوە لە قوللەتەین كەمترە و حوكمی پیسی بۆ دەر بكات، چونكە دوای ئەوە مالیكییەكان لەسەریان حەرام ئەبێت بەكارهێنانی ئەو ئاوە، بەڵكو ئەبێ بگوترێت تەنها فەتوایە: خۆ ئەگەر لەگەڵ رێڕەوو مەزهەبی بیسەردا بوو ئەوە كاری پێ ئەكات و وەگەرنا ئەتوانی ئەو فەتوایە بەجێ بێڵێ و رایەكی تر جێبەجێ بكات"[1].

ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم جیاكردنەوەیە بە روونی لە نووسینەكانیدا دیارە كاتێ دەڵێ:

"فەرمانی حاكم و فەرمانڕەوا تەنها لە هەندێ مەسەلەی تایبەتدا جێبەجێ ئەكرێت كە كاری خۆیەتی وەك جێبەجێكردنی سزا شەرعییەكان ـ

---

[1] الفروق ٣٨/٤.

الحدود ـ و پاراستنی مافەکان وەك مەسەلەی کوشتن و ناوزڕاندن و پارە و سامان و لەم بابەتانە.

ئیتر سەرجەم مەسەلە گشتییەکانی وەك تەفسیری قورئان و فەرموودە و فیقهییەکان و... هتد، ئەم مەسەلانەش تیایەتی ئوممەت لەسەری کۆدەنگن و تیاشیایەتی رای جیاوازیان هەیە تیایدا.

کەواتە ئەگەر ئوممەت لەسەر مانای ئایەتێك، یان فەرموودەیەك، یان فەرمانێکی خەبەری، یان داواکاریی، جیاوازییان هەبوو، حوکمی حاکم و دەسەڵات ناتوانێت بڵێت ئەم رایەیان دروستە و فڵان راشیان نادروستە، چونکە فەرمانی حکومەت لە هەندێ مەسەلەی دیاریکراودا جێبەجێ ئەکرێت نەك لە هەموو شتێکدا"[1].

مەبەست ئەوەیە کە جیاوازییەکی تایبەت هەیە لە نێوان ئەحکامە شەرعییەکان لە لایەنی پەیوەندییان بە کاری سیاسی و جێبەجێکاری و دادوەرییەوە، خۆدەبێ ئەم لایەنەش رەچاو بکرێت، بەتایبەت لە دووتوێی قسەکردنمان لەسەر (جێبەجێکردنی شەریعەت)، خۆ هەموو حوکمێکی شەرعی کە لەلایەن ئاینەوە دەرکراوە، نە مەرجە لەلایەن یاسا و کاری سیاسی و دەوڵەتدارییەوە کار لەسەر سەپاندن و جێبەجێکردنی بکرێت.

لەوانەیە کەسێك بڵێت: لە شەریعەت دا کۆمەڵی ئەحکامی هەیە تایبەتن بە لایەنی رەوشتیی، وەك حەرامکردنی داوێن پیسی و ئارەق ـ مەی ـ خواردنەوە، کەچی لە هەمانکاتدا سزای شەرعی بۆ دانراوە و سیاسەتی

---

[1] مجموع الفتاوی ٣/٢٣٨ ـ ٢٤٠، ئەم دەقە (ابو الفتاح ابو غدە) هێناویەتی لە کتێبی پەراوێزی کتێبی (القراف) ل٣٦، بەڵام لە ئەسڵدا لە (مجموع الفتاوی)دا هاتووە، بەڵام کەمێ بە جیاوازییەوە، چونکە جیاوازی لە نووسراوە ئەسڵییەکاندا هەیە.

جێبەجێکردنیش لە پشتیەتی لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵە ئیشێکە تایبەتە بەلایەنی ئەخلاقی نەك قانوونی، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو دابەشکردنەی شەریعەت کە بەشی دەوڵەتە و جێبەجێی بکات، دابەشکردنێکی دروست نییە.

وەڵام، هەموو ئەو ئەحکامانەی شەریعەت کە تایبەتن بە لایەنی کۆمەڵایەتی و یاسایی، لەڕاستییدا وەك بنەما هەر هەموویان ئەحکامی ئەخلاقین، هەر بەوەی کە یاساییە مانای ئەوە نییە ئەخلاقی نییە.

بەڵکو هەموو ئەحکامە شەرعییەکان لە ئەسڵدا ئەحکامی خواناسی و ئەخلاقییە، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە ئەفەرموێت: "إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق"، واتە: "من بۆ ئەوە نێرراوم سەرجەم ئاکارە باشەکان تەواو بکەم.

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو ئەحکامێکی ئەخلاقی ئەبێ ئەحکامی قانوونیش بێت، پەیوەندیی نێوان ئەحکامی رەوشتی و ئەحکامی یاسایی پەیوەندیی گشتگیری و تایبەتمەندییە.

هەموو حوکمێکی یاسایی حوکمی ئەخلاقیشە، بەڵام هەموو حوکمێکی ئەخلاقی مەرج نییە یاسایی بێت.

بۆ نموونە، حەرامکردنی ناوزڕاندن حوکمێکی ئەخلاقییە، بەڵام لە هەمانکاتیشدا حوکمێکی کۆمەڵایەتی و یاساییە، دواتر ئەچێتە خانەی ئەحکامە کۆمەڵایەتیی و یاساییەکان و کاری دەسەڵاتە، چونکە پەیوەندی بە مافی کەسانی ترەوە هەیە، حەرامکردنی زینا و ئارەق خواردنەوەش لە ئەسڵدا کۆمەڵە ئەحکامێکی ئەخلاقین، بەڵام بەراورد بە پەیوەندییان لەگەڵ کاری سیاسی و دەسەڵاتەوە، دابەش ئەبێت بۆ دوو جۆر:

١- یان ئەحكامێكی تایبەتە بە تاكەوە و پەیوەندی نییە بە بواری كۆمەڵایەتییەوە، چونكە تاك ئەتوانێت بەو گوناهانە هەستێت لە ماڵی خۆیدا واتە بە نهێنی (پۆشراوی) بە مانا شەرعییەكەی.

ئا لەو حاڵەتەدا بەرپرسیارێتییەكە بەرپرسیارێتییەكی تاكە كەسییە و بۆ دەسەڵات و حكومەت نییە كە بچێتە ناو نهێنی خەڵكییەوە (هتك السرّ)یان بكات.

هەروەك شەرعەن بۆی نییە سیخووڕی بكات بە سەریانەوە و دەستدرێژیی بكاتە سەر مافی تاك لە ماڵەكەی خۆیدا.

٢- یان ئەوەیە كارەكە تایبەتە بە بواری گشتییەوە، وەك ئەو كەسەی مەی ئەخواتەوە، یان داوێنپیسی ئەنجام ئەدات لەسەر جادە و لە شوێنە گشتییەكاندا و بە بەرچاوی خەڵكەوە.

ئەم جۆرە كارانە هەرچەندە بێگومان مافی تاكە كەسییە، وە كەسەكە خۆی بەرپرسیارە لەو گوناهەی ئەنجامی ئەدات، بەڵام كارەكە لە سنوور دەرچووە و چووەتە شوێنە گشتیەكەوە، شوێنی گشتییش هەموو تاكەكانی كۆمەڵگە هاوبەشن تیایدا، بۆ كەس نییە قۆرخی بكات بۆ خۆی، بۆیە ئەبێ ڕێكخستن و ئیدارەدانی - بواری گشتی - بەپێی كۆمەڵێ یاسا كە پێشتر كۆمەڵگە لەسەری ڕێككەوتوون، بەو پێیە هەر شكاندن و سنووربەزاندنێكی ئەم یاسا گشتییە، بێگومان سەرپێچیی یاساییە و ئەچێتە خانەی یاساو كاری سیاسی جێبەجێكارییەوە.

بەو پێیە ئەگەر كۆمەڵگە موسڵمان بوو، یاسای وڵاتەكەش لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام دامەزرابوو، ئەوە مەی خواردنەوە و زیناكردن لە هەردوو لایەنەكە حەرامە چ لایەنی ئەخلاقی و چ لایەنی یاساییەوە.

لەلایەنی ئەخلاقییەوە بەس گوناهبارە ئەگەر بەدزییەوە لە ماڵەکەی خۆیدا ئەنجامی دابوو، لەلایەنی یاساییەوە تاوانبارە چونکە لە شوێنی گشتییدا ئەنجامی داوە.

یەکەمیان دەوڵەت کاری بەسەریەوە نییە و ناچێتە ژێر یاساشکێنییەوە، بەڵام جۆری دووەم تایبەتە بە دەسەڵاتەوە و دەچێتە ژێر رکێفی یاساوە.

ئەم دابەشبوونە، کە وتمان هەندێکی ئەحکامی ئەخلاقی و تاکە کەسییە و هەندێکی تریشی کۆمەڵایەتیی و یاساییە، لەڕاستییدا شتێکی تازە نییە، بەڵکو لە ژێر رۆشنایی ئەو قسەیەی فیقهزاناندا کردوومە کە زۆر بەناوبانگە کە خراپەکانیان کردووە بە دوو جۆرەوە:

یەکەم: خراپەی شاراوە و دووەم خراپەی ئاشکرا، بە حەرامیشیان داناوە پەلاماری خراپەی شاراوە بدرێت بەپێچەوانەی خراپەی ئاشکراوە کە پێویستە رووبەڕووی ببینەوە.

(ابن مفلح الحنبلی) ئەڵێ: "لە (الرعایە)دا هاتووە کە حەرامە و دروست نییە پەلاماری خراپەی شاراوە یان نهێنی یان رابردوویان لە کۆندا روویدا بێت، بدرێت".[1]

(ئەبو یعلی)ش لە (معتمد)دا ئەڵێ: "واجب نییە لەسەر زانایان یان خەڵکی، ئەگەر خراپەیەك بە نهێنی کرابوو ئاشکرای بکەن بەڵکو حەرامیشە لە سەریان، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت: (ولا تجسَّسوا)[2]، واتە: سیخوڕی و جاسووسی بەسەریەکەوە مەکەن.

---

[1] الآداب الشرعیة، ل١/٢٧٦.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١/٢٨٠.

(عبدالكريم العاقولى) ئەڵێ: بیستم (ابو عبدالله ـ أحمد بن حنبل) جارێك پرسیاری لێ کرا دەربارەی کەسێك گوێی لە دەهۆڵ و زوڕنایە و بەڵام شوێنەکەی نازانرێت؟ ئەویش فەرمووی: تۆ هەقت چییە بە سەریەوە و تۆ چیت لێ گیراوە؟ مەشگەڕێ بە دوایدا، یوسفیش دەڵێ وتی: دەی تۆ هەقت چییە بەسەریەوە کە شوێنەکەیان نازانیت.[1]

(الخلال) ئەڵێ: (سەرخۆشی و مەیخواردنەوە، یان هەر کارێکی خراپی تر ئەگەر بە ئاشکرا نەکرا و بەرگی حەیا و شەرمی لەسەر رانەماڵرابوو، ئەوە وازهێنان لە ناموسی موسڵمانان و بەدوادانەچوونی کارە نهێنییەکانیان باشتر و بێوەیی ترە[2].

(ئیبن مفلح) لە (مهدوی)یەوە لە تەفسیرەکەیدا ئەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (بۆ کەس دروست نییە کە بە دواداچوون و سیخوڕیی بەسەر هیچ یەکێك لە موسڵمانانەوە بکات. ئەڵێ: ئەگەر شتێکی گوماناویشی لێبینی و پێویستە لەسەری بیپۆشێت و ئامۆژگاری خێری بکات و بە خوای عزوجل و سزای سەختی دۆزەخ بیترسێنێ.[3]

زانایانی فیقه وتەیان زۆرە لەم بارەیەوە، کە بوار نییە لێرەدا هەمووی باس بکەین، بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لەگەڵ ئەم رایەی زانایاندا لەسەر راوبۆچوونە فیقهییە دەستوورییەکاندا، رای هەندێ لە توندگیرەکانی نێوان زانایان بەتایبەت هەندێ لە حەنبەلییەکان لێڵی ناکات بەتایبەت زاناکانی ئەم دواییەیان، کە رێگایان داوە بدرێت بەسەر ئەو

---

[1] هەمان سەرچاوە ١/٢٨٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ١/٢٥٢.

[3] هەمان سەرچاوە، ١/٢٥٤.

مالآنەدا کە ئارەقی تێدا ئەخورێتەوە یان ئەگەر زانرا کە بەدڕەوشتی تێدا دەکرێت، بەڵام پێمان وایە ئەمانە تەنها کۆمەڵە رایەکن قبوڵکراو و وەرگیراو نین، چونکە راستەوخۆ دژە بە ئەو هەموو دەقە راشکاوانەی لەم بارەیەوە هاتوون، وە دواتریش ئەمە پێچەوانەی کاری پێشینەیە.

ئەسڵی ئەم بابەتە لەو ئایەتەی قورئانەوە وەرگیراوە کە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا﴾[1]. واتە ئەی کۆمەڵی باوەڕداران لە زۆرێ لە گومانەکان دوور بکەونەوە، چونکە هەندێ لە گومانبردنەکان تاوانن و بەدواداچوون و سیخوڕی بەسەریەکەوە مەکەن.

قورتووبی ئەڵێ: مانای ئایەتەکە کە ئەفەرموێت: "خذوا ما ظهر ولا تتبعوا عورات المسلمين" ئەمەیە واتە: پشکنین مەکەن بۆ عەیب و ناتەواوی براکانتان تا ئاشکرای بکەن لەکاتێکدا خوای گەورە بۆی پۆشیوە.

وەك لە فەرموودەی صەحیحدا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: "يا معشر من آمن بلسانه، ولم يدخل الإيمان قلبه، لا تغتابوا المسلمين، ولا تتبعوا عوراتهم، فانه من اتبع عوراتهم، تتبع الله عزوجل عورته، ومن تتبع الله عورته، يفضحه ولو في بيته"[2]. واتە ئەی ئەو کەسانەی بە زمان باوەڕتان هێناوە و باوەڕ نەچووەتە ناو دڵتانەوە، غەیبەت و لەپاش ملە باسی باوەڕداران مەکەن، بە دوای عەیب و عاریاندا مەگەڕێن، چونکە هەرکەسی بە دوای عەیبو عاریاندا بگەڕێت خوای گەورە ـ عزوجل ـ یش بە دوای عەیب و عاری ئەواندا ئەگەڕێ و هەرکەسیش خوا بە

[1] سورەتی الحجرات: ١٢.

[2] رواه احمد ٤/٤٢٠ـ ٤٢١، وابوداود، ٤٨٨٠.

دوای عەیبو عاریدا بگەڕێت ئەوە ئابڕووی ئەبات ئەگەر لە ماڵەکەی خۆیشیدا بێت.

لە فەرموودەکەی موعاویەدا (خوای لیّ رازی بیّ) کە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "إنك ان اتبعت عورات الناس أفسدتهم اوكدت تفسدهم".[1]

واتە : ئەگەر تۆ بە دوای عەیبو عار و ناتەواوی خەڵکیدا بگەڕێیت تێکیان ئەدەیت یان وەختە تێکیان بدەیت.

یان هەر لەو هاوەڵە بەڕێزەوە هاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: "ان الأمير اذا ابتغى الريبه في الناس افسدهم"، واتە: سەرکردە و ئەمیر هەرکاتیّ بەگومان بوو لە خەڵکی ئەوە تێکیان ئەدات.

ئەوەی پشتگیری ئەوە ئەکات کە هەڵسوکەوتی تاکە کەسی ئەگەر مرۆڤەکە بە دزییەوە ئەیکرد و ئاشکرای نەئەکرد، ئەوە بەرپرسیارێتی تاکە کەسییە و لە بەردەمی دادگای قیامەتدا تاوانبارە، هیچ بەدواداچوونێکی یاسایی بۆ ناکرێت لەلایەن حکومەتەوە، ئیّ دواتریش دەسەڵات بۆی نییە بەدواداچوون بۆ ئەم کردەوانە بکات یان رێگرییان لیّ بکات.

ئەم فەرموودەیەی (ابن عمر) خوا لێیان رازی بیّ لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "اجتنبوا هذه القاذورات التي نهى الله تعالى عنها، فمن المَّ بها فليستتر بستر الله، وليتب الى الله، فانه من يبدي لنا صفحته نَقِم عليها كتاب الله تعالى"[2]. واتە: لەم پوخڵەواتانە دوور

---

[1] رواه ابوداود، ٤٨٩.

[2] رواه مالك في الموطأ مرسلا، والحاكم في المستدرك وقال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه وصححه ابن السكن.

بکەونەوە کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە، ئەو کەسەش کە دەکەوێتە ناو گوناهێکیانەوە با بە پۆشینی خوا خۆی داپۆشێت و بەینی خۆی و خوا تەوبەیەك بکات، چونکە هەرکەسی ناوەرۆکی خۆیمان بۆ ئاشکرا بکات کە کاری وای کردووە ـ سزای ـ قورئانەکەی خوای بەسەردا جێبەجێ ئەکەین.

سەیرکە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەکەدا وا ئەگەیەنێت کە دەسەڵات بۆی نییە سزای کەس بدات مەگەر کەسەکە خۆی خۆی ئاشکرا بکات و دان بنێت بە تاوانەکەیدا و داوای سزاکەی بکات، نەك بە دوای خەڵکیدا بگەڕێت و سیخوڕیان بە سەرەوە بکات و نهێنییە ئاشکرا بکات.

کاتێ (هزال بن یزید) هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی پێدا کە (ماعِز) لەگەڵ کەنیزەکەکەیدا کاری ناشەرعی ئەنجام داوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەزال باشت نەکرد، دەی با قوماشێکت پێدا بدایە باشتر دەبوو بۆت.[1]

زەیدی کوڕی وەهەب ئەڵێ: (أتيَ ابن مسعود رضي الله عنه فقيل له فلان تقطر لحيته خمراً، فقال: إنا قد نهيتا عن التجسس، ولكن ان يظهر لنا شيء نأخذ به)[2]، واتە: هاتن بۆ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خوای لێ رازی بێ) پێی وترا: فڵانە کەس عەرەق لە ریشی ئەتکێ، ئەویش فەرمووی: ئێمە قەدەغەکراوە لێمان لە نهێنی خەڵك بکۆڵینەوە، بەڵام ئەگەر ئاشکرای کرد بۆمان سزای دەدەین.

---

[1] يا هزال بئسما صنعت، لو سترته بطرف ردائك لكان خيراً لك. رواه مالك في الموطأ، ل٣٤٨، واحمد في مسنده ٢١٦/٥ وابو داود في السنن ٢٢٥/٢.

[2] رواه ابو داود ٤٨٩٠، وقال المحقق الارناؤوط رجاله ثقات.

له (المصنف)ی عبدالرزاق دا هاتووه: كه عه‌بدوڕه‌حمانی كوڕی عه‌وف (خوای لیٚ رازی بیٚ) ئه‌ڵیٚ: له یه‌كیٚ له شه‌وه‌كاندا له‌گه‌ڵ عومه‌ری كوڕی خه‌تتابدا بووم پاسه‌وانیی شاری مه‌دینه‌مان ئه‌كرد، كاتیٚ گه‌شتینه لای (المصلی) چرایه‌كمان بینی رۆشنایی ده‌دایه‌وه. عومه‌ر لێی پرسیم ئه‌زانی ئه‌و چرایه ماڵی كێیه؟ وتم: به‌ڵیٚ ئه‌وه ماڵی ره‌بیعه‌ی كوڕی ئومه‌ییه‌ی كوڕی خه‌ڵه‌فه و ئێستا هه‌موویان فوول سه‌رخۆشن، ده‌ڵیٚ: له ماڵه‌كه‌یان نزیك بووینه‌وه به جۆری گوێمان له غه‌ڵبه غه‌ڵب و ده‌نگه ده‌نگیان بوو، عومه‌ر وتی: وا دیاره ئێمه بۆ شوێنیٚ هاتووین كه دروست نییه بۆمان كاری وا بكه‌ین، منیش وتم: به‌ڵیٚ وایه، ئیتر گه‌ڕاینه‌وه (واته نه‌چوینه سه‌ریان).[1]

له ریوایه‌تێكی تردا هاتووه ده‌ڵیٚ: عه‌بدوڕه‌حمانی كوڕی عه‌وف (خوا لێی رازی بیٚ) ده‌ڵیٚ: شه‌وێكیان له‌گه‌ڵ عومه‌ری كوڕی خه‌تتابدا (خوای لیٚ رازی بیٚ) پێكه‌وه پاسه‌وانی شارمان ده‌كرد له مه‌دینه، له دوره‌وه چرایه‌كمان به‌دی كرد له ده‌رگایه‌كه‌وه كه له ژووره‌وه كۆمه‌ڵیٚ كه‌س به‌ده‌نگی به‌رز غه‌ڵبه غه‌ڵبیان بوو. عومه‌ر وتی: ئه‌مه ماڵی ره‌بیعه‌ی كوڕی ئوممه‌یه‌ی كوڕی خه‌ڵه‌فه و ئێستا خه‌ریكی عاره‌ق ـ مه‌ی ـ خوارده‌نه‌وه‌ن، تۆ چی ئه‌ڵێی؟ چیان لیٚ بكه‌ین؟ منیش وتم: من وا ئه‌بینم كه‌وتووینه‌ته حه‌رامی خواوه و خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێت: (ولا تجسَّسوا) واته: جاسووسی به‌سه‌ریه‌كه‌وه مه‌كه‌ن، وا دیاره ئێمه جاسووسیمان كرد، عومه‌ریش گه‌ڕایه‌وه و پشتگوێی خستن".[2]

---

[1] عبدالرزاق ، المصنف ١٠/٢٣١ـ ٢٣٢، والحاكم في المستدرك.

[2] ذكره القرطبي في تفسيره ١٦/٣٣٣.

له تەفسیری قورتووبیدا هاتووە: کە ئەبو قولابە ئەڵێ: قسەیان کرد بۆ عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ رازی بێ) کە ئەبو میحجەنی سەقەفی لەگەڵ کۆمەڵێ لە برادەرەکانیدا لەماڵەوە ئارەق ـ مەی ـ ئەخۆنەوە، عومەری بەخێرایی خۆی گەیاندە ماڵیان، دەبینی وا نییە و تەنها پیاوێك لە ماڵیان بوو، ئەبو میحجەن وتی: ئەم کارە بۆ تۆ دروست نییە و خوا قەدەغەی کردووە لەسەرت لە سیخوڕی بەسەر خەڵکەوە بکەیت و عومەریش هەستا و هاتە دەرەوە و وازی لێ هێنا.[1]

پێشەوا ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا ئەڵێت: دوخەین کە نووسەری عوقبە بوو، ئەڵێ: بە عوقبەم وت: هەندێ دراوسێمان هەیە لە ماڵەوە ئارەق ئەخۆنەوە و منیش پۆلیسیان لێ ئاگادار ئەکەم و ئەیانبەن، ئەویش وتی: شتی وا مەکە، تەنها قسەی خێر و ئامۆژگارییان بکە و بیان ترسێنە، ئەڵێ: وامکرد بەڵام هەر وازیان نەهێنا.

دوخەین هاتەوە بۆ لای عوقبە و پێی وت: من داوام لێ کردن وازبێنن بەڵام وازیان نەهێنا و منیش پۆلیسم بۆ بانگکردنەوە.

عوقبە پێی وت: بێ قەزابی شتی وا نەکەیت! چونکە من لە پێغەمبەری خوام بیست (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: "من ستر عورة مؤمن فكأنما استحيا مؤودة من قبرها"، واتە: هەرکەسێ عەیبو عاری باوەڕدارێك بپۆشێت وەك ئەوە وایە کچێکی زیندە بە چاڵکراوی زیندوو کردبێتەوە لە قەبرەکەیدا.

(المروزی) ئەڵێ: بۆ ئەبو عەبدوڵڵام ئەخوێندەوە کە ئەبو رەفیعی صوفی ئەڵێ: لە شاری بەسرە چووم بۆ سەردانی حەسەنی بەصری و پێموت: من

---

[1] مصنف عبدالرزاق، ١٨/٢٧٥.

لەگەڵ دەستەی (حسبە)[1] دا بەسەر دیواردا پەلاماری ماڵی شەلاتییەکان ئەدەین بۆ ئەوەی بیانگرین.

ئەویش وتی: ئەی ماڵەکانیان دەرگای نییە؟ وتم: بەڵێ، هەیەتی، بەڵام لە شەودا و لە ناکاودا ئەدەین بەسەریاندا و ئەیانگرین، زۆر بە توندی ئەو شێوازەی رەدکردەوە و رەخنەی لەو کارەمان گرت.[2]

مەبەست لە هێنانی ئەم بەسەرهاتانە، ئەوەیە کە دووپاتی ئەوە بکەینەوە لە دابەشبوونی شەریعەت بۆ ئەو دوو جۆرە راستە و دروستە و لەلای زانایانی فیقهی بەهای خۆی هەبووە و سروش و وەحی پاڵپشتی ئەکات و ئامانج و مەبەستە بەرزەکانی شەریعەتیش هەر ئەوە ئەگەیەنێت.

کەواتە شەریعەت لە روانگەی جێبەجێکردنی سیاسییەوە دوو جۆرە و هەندێکی ئەحکامی رەوشتی تاکە کەسییە و مرۆڤ ئەگەر بەینی خۆی و خوا ئەو سەرپێچییە ئەنجامدا ئەوە لێپرسینەوەی قیامەتی و بەردەم دادگای خوا چاوەڕوانی ئەکات، وە جۆرەکەی دووەمیش ئەحکامی کۆمەڵایەتی و قانوونییە و دەسەڵات لێپرسینەوەی لەسەر ئەکات.

---

[1] حسبە: واتە خۆبەخشانە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکەن.

[2] ابن مفلح، لە الآداب الشرعیة، ١/٢٩٨دا هێناویەتی.

کەواتە لەم روانگەیەوە ئەتوانین جیاوازی بکەین لە نێوان زاراوەی (شوێنکەوتنی شەریعەت) و زاراوەی (جێبەجێکردنی شەریعەت).

(شوێنکەوتن) مانای پابەندبوونی خۆڕسکی سەربەستانەیە بەبێ ناچارکردن یان زۆرلێکردن.

بەڵام (جێبەجێکردن) مانای پابەندبوونێکی زۆرەملێیەو بەناچاریو زۆرلێکردن جێبەجێ دەکرێت.

بەم مانایە (شوێنکەوتن) پەیوەندە بە کردەی تاك یان کۆمەڵگەوەیە بەبێ دەسەڵاتێك بەزۆر بیسەپێنێ.

بەڵام (جێبەجێکردن) پەیوەند بە کرداری پابەندکردنی سیاسی بە پاڵپشتی یاساو دەستوور.

لەبەر ئەم هۆیەیە کە زاراوەی (جێبەجێکردنی شەریعەت) لەم سەردەمە هاوچەرخەدا بەرەو زیاتر تایبەتمەندیی و بەرتەسککردنەوە ئەڕوات، وای لێهاتووە (جێبەجێکردنی شەریعەت) لەلای فیقهزانانی ئەم سەردەمە - لە زۆر حاڵەتدا - بۆ چەند بنەمایەك ئەگەڕێننەوە کە ژیانی رۆژانەی خەڵکی رێك ئەخات، بەدەر لە ئەحکامە پەرستیشییە ئەخلاقییە تاکە کەسییەکان.

زانانی گەورە (طاهر بن عاشور) (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم زاراوەیەی بەم جۆرە بەکارهێناوە و ئەڵێ: لە زاراوەکەمدا کاتێ وتم (یاسادانان) (التشریع) مەبەستم پێی یاسای وڵاتە نەك بەشێوەیەکی گشتی و هەموو یاسایەك و من مەبەستم (مندوب و مکروە)ەکانی نییە، وە

ئەحکامەکانی پەرستشەکان وا دەبینم گونجاوە پێیان بگوترێت (ئاین) یان (ئاینداری).

هەروەك کاتێ دروشمی (جێبەجێکردنی شەریعەت) بەرز ئەکرێتەوە، ئەبێ مەبەست لە سەرجەم ئەحکامە شەرعییە یاساییەکان بێت ئەوانەی پەیوەندییان بە کردەی جێبەجێکاری سیاسییەوە هەیە، نەك هەموو ئەحکامەکانی شەریعەت بە گشتی.

چونکە ئەحکامەکانی شەریعەت لە بنەڕەتدا ـ وەك باسمانکرد ـ لە رێگەی (شوێنکەوتنەوە) بەرجەستە ئەبێت لە دنیای واقیعدا واتە شوێنکەوتنی بنەما و بەهاکانی شەریعەتی ئیسلام لەلایەن تاكو کۆمەڵگەوە.

لەکاتێکدا (جێبەجێکردن) تەنها پەیوەندە بە لایەنی یاسایی شەریعەتەوە.

## - ١ -

دوای ئەوەی زاراوەی (الشريعة) و چۆنیەتی (جێبەجێکردنی)مان باسکرد و پەیوەندی بە تاکو کۆمەڵگە لەلایەك و پەیوەندییان بە کردەی سیاسی دەسەڵاتەوە لەلایەکی ترەوە.

دوای ئەوەی زانیشمان کە رێڕەوی شەریعەت لەلایەنی سیاسەتی جێبەجێکارییەوە، رادەوەستێت لەسەر جیاکردنەوەی رەهەندی تاکە کەسی ئەخلاقی لە رەهەندی کۆمەڵایەتی یاسایی، هەروەك وتمان پابەندبوون بە ئەحکامە تاکە کەسییە ئەخلاقییەکانەوە بە هەڵبژاردنێکی ئارەزوومەندانەی دوور لە زۆراکاری و ناچارکردنی دەرەکی حکومەتەوە دەبێت، ئەمەش بەپێچەوانەی ئەحکامە کۆمەڵایەتییە یاساییەکانن کە پابەندبوون پێیانەوە لەسەر بوونی قانوون وەستاوە، بە پشتگیریی دەسەڵاتی حکومەت و دەزگا جێبەجێکارەکانی.

ئەمە مانای ئەوەیە، پەیوەندی دەوڵەت و کاری سیاسی لە جێبەجێکردنی شەریعەتدا تەنها لە بواری کۆمەڵایەتی و قانونی دایە و بەس، هیچ پەیوەندییەکی نییە بەسەر ئەخلاقو هەڵسوکەوتی تاکەکەسیی مرۆڤەکانەوە. کە پێشتر ئەمەمان بە دووردرێژە گفتوگۆ کرد و لەسەری دواین، وا ئێستا دێینە سەر بیرۆکە سەرەکی و بنەڕەتییەکە، کە هەموو باسەکانی ئەم کتێبە لەو خولگەیەدا ئەسوڕێتەوە.

ئەویش پەیوەندی لایەنی یاسایی (شەریعەت)ە بە دەوڵەتەوە و دەسەڵاتی سیاسی و جێبەجێکارییەوە، ئەمەش بێگومان لە کەش‌و زەمینەیەکی لەبار و نموونەییدا ـ جێبەجێکردنی شەریعەت ئەنجام ئەدرێت و

جێبەجێ ئەکرێت. کەش‌و زەمینەیەکی وا دا کە جێبەجێکردنەکە ئامانج و مەبەستە باڵاکانی شەریعەتی ئیسلام تیایدا بێتەدی.

مەبەست لە زەمینە لەبارو کاتی گونجاوەیە کە دوو خاڵ بێتە دی کە هۆکاری سەرەکین ئەوانەش:

١- کۆدەنگی هاووڵاتیان لەسەر رێزگرتنی بنەما سەرەکییەکانی یاسای شەرعی، بە جۆرێ کە ملکەچی و گوێڕایەڵی گەل بۆ ئەو جۆرە سیستەمەیە لە باوەڕبوون و رەزامەندی و خۆشحاڵییەوە بێت و بەدوور بێت لە زۆرلێکردن و ناچارکردن، ئەمەش لەسەر بنەمای سیاسەتی (سەروەری گەل).

٢- دەسەڵاتێکی سیاسی هەڵبژێراو لەلایەن گەلەوە، کە ئاوات و مەبەستە هاوبەشەکان بێنێتە کایەوە و لەسەر ئەرزی واقیع جێبەجێیان بکات.

لە هەلومەرجی نەبوونی ئەم دوو هۆکارەدا، زۆر قورسە ئەحکامە قانوونییەکانی شەریعەت بەشێوازێکی گونجاو جێبەجێ بکرێت و بەرهەمی خۆی ببێت. ئەگەر ئەمە هاتەدی ئەوە قانونی شەرعی ئەگۆڕێت بۆ ئامرازی ئەوپەڕی زۆرلێکردن و ناچارکردنی خەڵکی بۆ پابەندبوون و ئەو کاتە هەموو رەهەندە ئیمانی و ئامانجە باڵاکانی شەریعەت بوونی نامێنێ.

ئا لێرەوە، نرخی ئەو وتەیە دەردەکەوێت کە دەڵێت: "سەروەری گەل (پێش جێبەجێکردنی شەریعەتە)، چونکە - وەك پێشتر باسمانکرد - جێبەجێکردنی شەریعەت سیاسەتێکی جێبەجێکاری زۆرەملێیە.

یاسایەکیش هەیە کە ژیری و هەستیش لەگەڵیدایە کە دەڵێ: "زۆرلێکردن نییە پێش سەروەری"، واتە: حکومەتداری و یاسا چەسپاندن روونادات مەگەر دوای بەدەستهێنانی سەروەری، هەرکەسی سەروەری بەدی نەهێنێ ناتوانێ خەڵك پابەند بکات. بە مانایەکی تر: پابەندکردن بەشێکە لە

سەروەری، ئیٚ لەوێوە ئەتوانین بڵێین جێبەجێکردنی شەریعەت بەشێکە لە سەروەریی. بە مانایەکی تریش: سەروەریی پێشەکییە و پێویستییەکی عەقڵی و هەستیارییە و دەبێت بکەوێتە پێش جێبەجێکردنی شەریعەت.

جێبەجێکردنی شەریعەت بە واتا سیاسی و جێبەجێکاریکەی، سروشتێکی پابەندکاری ـ ئیلزامی ـ هەیە، خۆ بۆ کەسیش نییە ـ لە لایەن عەقڵییەوە ـ کە خەڵکی پابەند و ناچاری جێبەجێکردن بکات تا نەبێتە خاوەنی سەروەری و دەسترۆیشتن.

کە کاتیٚ ئاغایەك ـ گەورەیەك ـ فەرمان دەرئەکات بۆ بەندە و خزمەتکارەکەی و پابەند و ناچاریشی ئەکات ئەو لە ئاکامی بوونی دەستو شتن و سەروەرییەتی بەسەر ئەو بەندەیەدا.

هەموو پاشا و سەرکردەکان بە درێژایی مێژوو ـ ئەمرۆشی لەسەر بێت ـ کاتیٚ خەڵکی پابەند و ناچاری جێبەجێکردنی فەرمانەکانیان ئەکەن، ئەوە بە پشتەسوری ئەو سەروەری و دەسترۆیشتنەیانە بەسەر گەلەکەیانەوە، ئەگەر ئەم سەروەرییەیان نەبوایە هەرگیز نەیاندەتوانی کاری سەپاندن و پابەندکردن بچەسپێنن.

نەتەوە ـ گەلیش ـ بە گشتی، کاتیٚ دەبێتە خاوەنی سەروەریی ئیتر دوای ئەوە هەر خۆی بەخۆی و بە خۆشیی خۆی، خۆی پابەند ئەکات، بە یاساگەلێکەوە کە خۆی پێی رازییە و لەسەری رێککەوتوون و گونجاوە لەگەڵ قەناعەت و بەها و ئامانج و مەبەستەکانی لەم بوونەوەرەدا.

ئەمەش لە رێگەی حکومەتێکی هەڵبژێردراوی جێبەجێکاردا کە کاری چەسپاندن و پابەندبوونەکان ئەنجام بدات، بێگومان ئەمەش بەپێی ئەو رازیبوونەی گەلە بۆ وڵاتەکەیان کە ئەم سەپاندنانە جێبەجیٚ بکات، بەبیٚ

بوونی زۆرداری و سەرکوتکردنی و بە بوونی سەربەخۆییەکی تەواو، بەبێ بوونی راسپاردە و دەست تێوەردانی لە لایەن هیچ کەس و لایەنێکەوە.

ئەمەش بە جۆرێك دەبێت کە یاساکە ـ بێگومان حکومەت جێبەجێی ئەکات ـ گوزارشت لە راو و ویستی گەل بکات. کاتێ زانیمان کە: (پابەندبوون بەبێ سەروەری هیچ بوونێکی نییە). واتە: شەریعەت بە مانا یاسایی و مافپەروەرییەکەی بەبێ بوونی سەروەریی و گەورەیی جێبەجێ ناکرێت.

بۆیە ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە:

سەروەری بۆ کێیە؟ بۆ گەلە ـ ئوممەت ـ؟ یان بۆ سەرۆکێکی تەنها و خۆسەپێنن؟

بە ئاماژەیەکی تر: ئایا (جێبەجێکردنی شەریعەت) پەیوەستە بە بوونی سەرورەی گەل یان سەروەری سەرۆکێکی دەسەڵاتدارە؟ دەی کەواتە جێبەجێکردنی شەریعەت بۆ ئەوەی باشتر و پارێزراو تر و درێژخایەنتر بێت و دوور بێت لە لادان و یاری پێکردن و تێکەڵکردنی هەواو ئارەزوو، ئایا وا باشە کە سەروەری لە دەستی گەلدا بێت یان لە دەستی پاشایەکی خۆسەپێنی ـ دیکتاتۆر ـ دا بێت؟

بەڵکو لەڕاستییدا لە روانگەی ئیسلامەوە: ئایا سەروەری گەل لە پێشە یان سەروەری تاك؟ وەڵام، بێگومان و بێ دوودڵی، دەسەڵات و سەروەری گەل بنچینە و ئەسڵە و ئەوەش باشتر و چاکترە بۆ زیاتر بەردەوامی جێبەجێکردنی شەریعەت. بۆ زیاتر مانەوەی شەریعەت و پاراستنی لە هەواو ئارەزوو یاریکردن بە دەقەکانی لەلایەن سەروەری و گەورەیی حاکمێکی زۆرداری خۆسەپێنەوە دەبێت ئوممەت ـ گەل ـ سەروەر بێت و حاکم لەلایەن ئەوەوە دەستنیشان بکرێت.

لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەم بەڵگە و دەلیل ـ بە پشتیوانی خوا ـ بۆ دروستی ئەم قسەیە بهێنمەوە، بەڵام پێش ئەوەی بەڵگەکان بهێنمەوە، گرنگە یەکەم جار لەلایەنی فەلسەفی و سیاسی و یاسییەوە لە زاراوەی (سەروەریی) بکۆڵینەوە، چونکە هەندێ لە لێکۆڵەرەوە بەڕێزەکان وای بۆچوون کە سەروەریی ـ سیادە ـ نە بۆ گەلە و نە بۆ سەرۆك و دەسەڵاتدار، بەڵکو بۆ خودی شەریعەتەکەیە، تەنها پەناگە و پارسەنگ ـ مرجح ـ شەریعەت ئەبێت و بەس.

بەڵگەشیان لەسەر ئەمە بنەمای هەیمەنەی خودی شەریعەتە و فەرمانکردنە بەو قورئانەی پەروەردگار ناردوویەتییە خوارەوە لە ژێر بنەمای ئایەتی: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ (المائدة : ٤٤)، هیچ کەسیش لە سەروی حوکمی پەروەردگارەوە نییە.

لەڕاستیدا ئەم بنەمایە چەند بنەمایەکی سەرەکی و گەورەیە لە دیدی ئیسلامیدا، هەرگیزیش ئەوە نابێت کە دیدەکە ئیسلامی بێ لە هەمان کاتدا دژو پێچەوانەی ئەم بنەمایانە بێت، ئەو سیستەمە سیاسییەی کە کۆمەڵگە موسڵمانەکە پێشنیاری ئەکات بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی رۆژانەی و پارێزگاری بەرژەوەندییە دنیاییەکان، رێکخستنی پەیوەندی ئینسانییەکانی دا، پێویستە هەموو ئەمانە پەیوەست بن بە بنەما گشتییەکانی ئیسلامەوە.

هەرگیز روونادات سیستەمە سیاسییەکە سیستەمێکی ئیسلامی بێ کەچی لە ژێر کاریگەری ئەو بنەما جێگیرانەدا نەبێت، کەواتە شتێکی زۆر سروشتییە کە ئەو کۆمەڵگەیە و شێوازی بەڕێوەبردنی بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بنەمایانە، چونکە کۆمەڵگەکە خۆی کۆمەڵگەیەکی موسڵمانە.

بەڵام تا ئێرە کێشە نییە و پرسیارەکە لەمە نییە، بەڵکو پرسیارەکە ئەمەیە:

کێ مافی ئەوەی هەیە کە بژاردە و پێشنیاری هەڵبژاردنی ئەم سیستەمە سیاسییە بکات کە کاریگەریی شەریعەتی لەسەر بێت؟

گفتوگۆکە لەسەر ئەوە نییە کە پێویستە سیستەمی سیاسی وڵات لە ژێر کاریگەری بنەماکانی ئیسلامدا بێت. بەڵکو گفتوگۆ لەسەر ئەوە ئەکەین کە ئایا کێ مافی هەڵبژاردنی بنەماکانی ئیسلامی هەیە وەك چوارچێوەیەکی سەرچاوەیی سیستەمی سیاسی وڵات؟

ئایا نەتەوە موسڵمانەکە بە گشتی ـ گەل ـ، یان سەرۆکێکی تاکڕەوی زۆردار، یان چینی دەسەڵاتدار؟

بێگومان پرەنسیپە ئیسلامییەکان خۆیان هاوار ناکەن، بەڵکو پێویستیان بە پیاوانێکە لە دنیای واقیعدا بەرپایان بکات وەك عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوای لێ رازی بێ) وایفەرمووە. دەی کەواتە ئەو پیاوانە کێن؟ نەتەوە ـ ئوممەت ـ بە گشتییە یان دەسەڵاتدارێکی تاکڕەو یان چینێکی دەستڕۆیشتوو لەسەر بنەمای دەستڕۆیشتن و زاڵبوون؟ یان بنەماڵەیەك؟..

بە دەربڕینێکی تر: ئایا کێ خاوەنی سەروەرییە؟ کە بەپێی ئەو سەروەری و دەستڕۆیشتنەی وەڵامی چوار پرسیارە سەرەکییەکە بداتەوە سەبارەت بە پێشنیازکردنی سیستەمی سیاسی حوکمڕانی وڵات؟

پرسیارەکانیش ئەمانەن:

١ـ کێ حوکمی وڵات بکات؟

٢ـ حکومەتەکە لە بەرژەوەندیی کێ کار بکات؟

٣ـ شێوازی حکومڕانییەکە چۆن بێت؟

٤ـ چ بەهایەك حوكمی ئەم وڵاتە ڕێك بخات؟

هەر ئەم پرسیارە سەرەكییە گەورانەشە كە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی عەقڵ و هۆشی فەیلەسوف و فیقهزانان و بیرمەندان و حەكیمانی سەرسام كردووە، چەندان پرسیاری بە دوای خۆیدا هێناوە و ئەشیهێنێت.

ئەی كێ مافی ئەوەی هەیە كە وەڵامێكی تایبەت و دیاریكراو هەڵبژێرێت بۆ سیستەمی سیاسی حكومڕانی؟ بێگومان ئەوەی سەروەری و كاروباری خۆی بە دەست خۆی بێت، ئەوە ئەو ئەتوانێت و ئەو مافەی هەیە، كە وەڵامی دیاریكراو هەڵبژێرێت بۆ سروشتی ئەو سیستەمە سیاسییەی كە حوكمی ئەو ئەكات و بەشێوازێكی وا بەرژەوەندییە دنیاییەكانی بێنێتەدی كە بگونجێت لەگەڵ ئامانج و مەبەستەكانی بوونی ئەو ئوممەتە.

كەواتە، كێ خاوەنی سەروەرییە؟

ئا ئەمەیە ئەو پرسیارەی كە جێگای مشتومڕ و گفتوگۆیە؟

بەو پێیە، خودی (شەریعەتی ئیسلام) هەرگیز جێگای مشتومڕ گفتوگۆ نییە، ئەو پەیوەندە بە پرسیاری چوارەمەوە (چ بەهایەك حوكمڕانی ڕێك ئەخات؟) كە دیارییكردنی شێواز و جۆری حكومڕانی سیاسی وڵاتە.

بێگومان لە دیدی ئیسلامیدا، بەهای شەریعەتی ئیسلامی ئەبێ ڕێكخەری كۆمەڵگە ئیسلامی بێت و یاسای وڵاتی لەسەر دابمەزرێت، چونكە ناچێتە عەقڵەوە وڵات وڵاتێكی ئیسلامی بێت لە هەمانكاتدا دەستووری وڵات لە شەریعەتی ئیسلامەوە سەرچاوە نەگرێت.

بەڵام تا ئێرە جێگای مشتومڕ و گفتوگۆكەمان نییە.

بەڵکو ئەوەی جێگای گفتوگۆیە ئەوەیە: کە ئایا کێ لە رووی دەستوورییەوە (شەریعەتی ئیسلامی) هەڵدەبژێرێت وەك سەرچاوەی حوکم بۆ دیاریکردنی ئەو بەهایانەی حوکمڕانییەکە رێك و پێك ئەکات؟

لە کۆتاییدا پێویستە توانا و ویستێکی بەشەری هەبێت کە هەستێت بە دیاریکردنی شەریعەت وەك سەرچاوەی حوکمی وڵات، چونکە ئاشکرایە خۆ شەریعەت خۆی هەڵنابژێرێت، ئەو تەنها کۆمەڵە یاسا و بنەما و بەهایەکی تیۆری رووتە. خۆ لە روانگەی سیاسییەکەوە نابێت سەروەری و دەسەڵات بدرێتە دەست ئەو کۆمەڵە بنەما و یاسایانە تا خۆیان بەسەر واقعی حوکمڕانیدا بسەپێنن، بەڵکو پێویست بە هۆکاری بەشەریی ئەکات کە شەریعەت هەڵبژێرێت و دەبێت سەروەری و ئازادی مرۆڤ هەستێت بەو هەڵبژاردنە، کەواتە سەروەرییەکە بۆ گەل و نەتەوەکە بێت یان سەروەرییەوەکە بۆ سەرۆکێکی زاڵ و دەستڕۆیشتوو بێت؟

کەواتە رووبەڕووبوونەوەکە لە نێوان ئوممەت و تاکدایە، نەك لە نێوان ئوممەت و شەریعەتدا، گەل ئەتوانێت ئەم شەریعەتە وەك سەرچاوەی حوکمی وڵات دیاریی بکات.

ئەم دەمەقاڵەیە، بەڕاستی بەڵگەیە لەسەر بوونی خراپ حاڵیی بوون و لێتێکچوون لە مەسەلەی (سەروەری) و سیادەدا بە مانا سیاسییەکەی و مانا عەقڵییەکەی لە عەقڵیەتی شەرعی ئەو کەسانەی کە رەفزی سەروەری گەل ئەکەن، بۆیە باشتر وایە لە مەسەلەی سەرچاوەگیری قانونی و سیاسی بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی ئەم تێکەڵکردنە لە یەکتر جیابکەینەوە پێش ئەوەی قسە لەسەر شایستەیی سەروەری گەل ـ ئوممەت ـ بکەین.

کەواتە: سەروەری (السیادة) مانای چییە؟

- ٢ -

## مانای سەروەریی

سەروەری (السيادة) وشەیەکی وەرگێڕراوی وشە ئینگلیزییەکەیە (severeignty) و ئەویش زاراوەیەکی قانونی و سیاسییە، لە رۆژئاوا دروست بووە و گەورە بووە، دواتر بەکارهێنانی گوێزراوەتەوە بۆ ناو گەلانی رۆژهەڵات، ئەمەش دوای ئەوەی کە زۆری چەمك و زاراوەکان تەرجەمەکران و گوێزراونەوە لە سەردەمی بێداربوونەوەی گەلانی عەرەبیدا بۆ ناو ئەو گەلانە کە دواتر فکر و هزری عەرەبی لیٚ دروست بوو.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە (سەروەری) زاراوەیەکی بێگانەیە و نوێیە و پێشتر لەناو فەرهەنگی عەرەبی و ئیسلامیدا بەم ناوەوە نەبووە.

بەڵیٚ (سەروەری) وەك مانا سیاسییەکەی، لە مێژووی ئیسلامیدا بەرجەستە بووە و لە واقیعدا بوونی هەبووە، ئەمەش لە ئەزموونی سیاسی دەوڵەتەکەی پێغەمبەر و دواتر چوار خەلیفە راشیدەکەدا بە روونی بەدی دەکرێت وەك دواتر باسی ئەکەین.

بەڵام وەك زاراوە و بەم ناوەوە و بەو گۆڕانکاریی و پێشکەوتنە فەلسەفی و یاساییەیدا، لە فەرهەنگی سیاسی ئیسلامیدا نەبووە، بەتایبەتی لەو کلتوورە حوکمڕانییەی لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا دروست بوو بوو.

لەکاتێکدا زاراوەیەك تازە بێت، شتێکی سروشتییە، کە بۆ زانینی ماناکەی، ئەبیٚ بگەڕێینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دروستبووە و لەوێوە لە ماناکەی بپرسین و دواتر لێی وردبینەوە و حوکمی خۆمانی بەسەردا بدەین لە دیدو تێڕوانینی ئیسلامەوە.

جوانتر وایە پێش ئەوەیە مانا سیاسییەکەی (السیادة) بکەین، با بزانین لە (لسان العرب)ی (ابن منظور)دا چۆن مانا کراوە.

سەروەری ـ سیادە ـ سەرچاوەیە و وشە تاکەکەی (السید)ە، واتە سەروەر، واتە: خاوەنی ماڵی خۆیەتی، سەرگەورە واتە: سەروەری بەندە و خزمەتکارەکانیەتی، هەروەك (متولی)یش بەو مانایە کە کەسێکە کۆمەڵێکی گەورەی لەژێر دەستدایە، هەرکەسێکە کە گوێڕایەڵییکردنی فەرز بێت، (سید الشيء) واتە شتەکە بەرز نرخاند و بەرزی کردەوە.[1]

وشەی سەروەری ـ السیادة ـ ئەگەر درایە پاڵ کەسێك کە جیاوازی نییە بڵێی (الرئيس المتولی) یان (السید المتولی)، یان بدرێتە پاڵ مانای وشەکان وەك بەرز و بڵند (الشريفة والرفيعة والعالية) و ئەم تێبینییەش زۆر گرنگە و پاش کەمێ تر ئیشمان تێیان ئەکەوێت.

ئەمە وەك دەستەواژەیەکی زمانەوانی، کە بەو جۆرە بەکارهاتووە و لە وشە ئینگلیزییەکەیەوە گوێزراوەتەوە (severeignty).

[1] لسان العرب، ابن منظور، ل٧/٢٩٦.

## "سەروەری" مانای چییە؟

ئەما لە لایەنی مانا سیاسییەکەی وشەی سەروەری ـ السیادة ـ پێموایە گشتگیرترین پێناسە بۆی، لە (موسوعە السیاسە)دا هاتووە، ئێمەش لەبەر گرنگی و گشتگیرییەکەی بە تەواوەتی نقلّی ئەکەین.

لە (الموسوعة)دا هاتووە و دەڵێت: (السیادة) واتە: بەرزترین دەسەڵات، کە هیچ دەسەڵاتێك لە سەروی ئەوەوە نەبێت، ئەمەش تایبەتمەندییەکی سەرەکی دەوڵەتەو لێی جیانابێتەوە.

کە لە هەموو رێکخراوەکانی ناو کۆمەڵگەی سیاسی جیا دەکاتەوە، دەبێتە سەرچاوەی قانون و یاسادانان، تاکە لایەنی سەرپشك کراوە کە دەبێ پاراستنی یاسا و ئەمن و ئاسایش لە ئەستۆی بێت، وە هەروەها هێز و چەکداری تەنها بە دەست ئەوە و لەو رێگایەوە جێبەجێکردنی یاساکان ئەنجام دەدات.[1]

ئەم سەروەرییە واتە سەروەری و دەستڕۆیشتنی دەوڵەت بەسەر ناوخۆی وڵاتەکەیدا، بەڵام ئایا سەرچاوەی ئەم ـ سیادة ـ یە لە کوێوەیە؟ واتە ئایا کێ ئەتوانی ئەم دەسەڵاتانە لە دەوڵەت بسەنێتەوە؟ با ئەم وەڵامە دوابخەین و پێناسەکە تەواو بکەین.

"بەڵام سەروەری لەسەر ئاستی دەرەکی، واتای ـ سیادە ـ ئەوەیە رزگاربوون لە، یان سەربەخۆبوون لە، ژێر دەستەیی وڵاتانی تر".

---

[1] موسوعة السیاسة، عبدالحمید الگیلانی، ٣٥٦/٣.

"به مانای ئەوەی کە پێناسەی دەوڵەتی پێ نادرێت ئەگەر ژێردەستەی وڵاتێکی تر بێت چ بە (انتداب)، یان (وصایة)، یان (حمایة)، چونکە لەم حاڵەتانەدا سەروەری ئەم وڵاتە سنووردار و کۆتکراوە لەلایەن هێزێکی بەرزترەوە، کە وڵاتی داگیرکەرە چ لە رێگای (انتداب، وصایە، حمایە)وە بێت". [1]

ئەما سەرچاوەی سەروەری یان جێگای سەروەریی بەوە دەبێت: کە لەوانەیە پاشایەك یان خەلیفەیەك یان گەل بێت یان پەرلەمان و دەزگا نوێنەرییەکان و دادوەرییەکان، بوونی یاسا و قانوونیش مانای بەرجەستەبوونی سەروەرییەکەیە و بەڵگەی بوونیەتی. [2]

بەڵام لە (مەوسوعەی لالاندی) بەناوبانگدا هاتووە کە مانای (سەروەری) واتە دەسەڵاتێکەو دەدرێتە پاڵ: "سەرۆکێکی تاکرەوی خۆسەپێن یان دەسەڵاتی بە کۆمەڵی ـ گەل ـ کە بەپێی یاسا ئەو دەسەڵاتە رێگە بە خۆی ئەدات کە هەموو دەسەڵاتەکانی تر بخاتە ژێردەستی خۆی"[3].

جان جاك رۆسۆیش دەربارەی دیاریکردنی ئەم کەسێتیە گشتییە ـ واتە گەل ـ ئەڵێت: "ئەم کەسێتیە گشتییە کە پێکدێت لە یەکگرتنی هەموو خەڵکەکانی تر، کە لە رابردوودا ناوی لێ نرابوو ـ مەدینە ـ بەڵام ئێستا ناوی نراوە کۆمار (جمهورية) یان دەستەی سیاسی ئەگەر چالاك و بزووت بوو پێی ئەڵێن (دەوڵەت) ئەگەر کەسێکی عاقڵ بوو پێی ئەڵێن سەرکردە ـ سید ـ و

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] هەمان سەرچاوە.

[3] موسوعة لالاند، ل١٣٢١.

ئەگەر بەراوردی بکەین بە هاوچەشمەکانی پێی دەڵێن دەسەڵات ـ سلطة ـ". [1]

ئەو دەسەڵاتەی کە گەل واتە کەسی گشتی هەیەتی دەبێتە سەرچاوە و کانیاوی سەرجەم دەسەڵاتەکانی تری وەك جێبەجێکردنی یاسادانان و دادوەری.

ئەی لە کویێ هاتە کایەوە ـ ئەوەی مەشهوورە لەلای لێکۆڵەرەوان ئەوەیە کە یەکەمین کەس تیۆری ـ سیادە ـ ی داڕشتەوە بەپێی فەلسەفەیەکی سیاسی داڕێژراو، ئەویش بیرمەندی فەرەنسی جان بودان کە لە ساڵی ١٥٩٦دا کۆچی دوایی کردووە. [2]

هەرچەندە بیرۆکەی ـ سەروەری ـ لەگەڵ شیکارییەکانی بوداندا دەستی پێ نەکرد، چونکە سەروەری وەك بیرۆکە و فەلسەفە و بنەما لە گرنگترین و کۆنترین بنەماکانی قانون بووە لە روانگەی فەلسەفی سیاسییەوە.

ئەی بوودان چی کرد؟ بودان یەکەمین کەس بوو سەروەری وەك بیرۆکەیەکی تێرو تەسەلی سەربەخۆ داڕشتەوە لە کتێبی (الجمهورية)دا کە لە شەش بەرگدا نووسیویەتی، تیایدا زۆر بابەت و دۆسێیەی قانوونی و سیاسی تاوتویێ کردووە و لە نێوانیاندا مەسەلەی (سەروەری)یە. [3]

دەبێ ئەوەش بۆ خوێنەر روون بکەینەوە کە بودان کەسێکی دیموکراسی نەبووە، بەڵکو یەکێکە لەو بیرمەندانەی کە بانگەشە بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی

---

[1] في العقد الاجتماعي، ل٩٦.

[2] تأريخ الأفكار السياسية، ل١٦٧، مارسيلو بريلوو جورج ليسكيية.

[3] الوسيط في القانون الدستوري، ابراهيم ابو خزام، ل١٥٤.

رەها ئەكرد و تیۆری (سەروەری)یشی هەر بۆ ئەم مەبەستە دارِشتۆتەوە وەك دواتر دەگەین پێی.

سەروەری لەلای بودان: "ئەو گەورە هێزەیە كە ئەسەپێت بەسەر هاوولاَتیان و شتەكاندا"، یان "گەورەترین ویست كە لە ناو كۆمەلَگەدا پەیدا ئەبێت".

واتە: ئەو دەسەلاَتەی یاساكان دێنێت و كاری چاودێری جێبەجێكردنی دەكات".[1]

بەلاَم بودان پێی وایە جێبەجێكردنی قانون تەنها بەسەر گەلدا دەچەسپێت، نەك بەسەر پاشاكاندا چونكە ئەوان سەرچاوەی یاساكانن و ئەصلَی سەروەرین، لەلای ئەو پاشاكان ناچار ناكرێن تا پابەندی یاساكان بن، چونكە یاساكان ئەوانیان دروست كردووە.

باشترین وێنەی حوكمرِانی لەلای بودان، حوكمی (موتارەكی)یە واتە یاسای تاكە سەرۆك، كە ئەو سەرچاوەی سەروەرییە، یاسا و برِیارەكان نایگرێتەوە، بەلاَم بەو مانایەش نا كە حوكمرِانان حوكمی رەهایان هەبێت، بەلَكو یاسا سروشتییەكان ئەیانگرێتەوە، چونكە چەندێ گەورە و دەسترِۆیشتوو بن ناتوانن شوێنی چیاكان بگۆرِن یان باران ببارێنن یان لە مردن قوتار بن و یان هتد...

هەروەك چۆن لەبەردەم یاساكانی خواییدا ملكەچن، چونكە ئەو پاشایانە رەوایەتی دەسەلاَتەكەیان لە (پەروەردگار)ەوە وەرگرتووە كە ئەوانی لە خەلَكی تر جیاكردۆتەوە.

---

[1] القانون الدستوری والانظمة السیاسیة، آدیب نصور، ل٥٣.

بەڵام ملکەچییەکەیان بۆ قانونە خواییەکان تەنها تیۆرییە و دەسەڵاتە بێ سنوورەکەیانەوەیە و نەك ملکەچییەکی کرداری کە گەل بەسەریاندا بیسەپێنێت، چونکە ئەگەر ئەو شتانەیان بەسەردا بسەپێت و ویستی خۆشیانی لەسەر نەبێت، ئەوە بێگومان لە گەورەییان کەم ئەکاتەوە، سەروەری و سەرکردەیی پێویستی بە دەسەڵاتی سەرتر لە خۆی نییە، هەر لەبەرئەمەیە بودان مانای قانون بەم جۆرە ئەکات و ئەڵێت: (کردەوەکی هەڵقوڵاوە لە ویست و ئیرادەی فەرمانڕەوا).[1]

کەواتە لەسەر رای بودان سەروەری بەدەستی پاشایە، بێجگە لەو بەدەست کەس نییە، ئەوەی پاڵی نا بە (جان بودان)وە بۆ دەربڕینی ئەم رایەی، چونکە ئەو لەکاتێکدا دەربارەی سەروەری بابەتی ئەنووسی کە فەرەنسا بەرەو یەکگرتن هەنگاوی ئەنا، ناکۆکی نێوان چینی خانەدانەکان ـ النبلاء ـ و پاشا هنری سێیەم هەبوو، لەو کاتەدا چینی خانەدانەکان دەسەڵاتی لاوەکییان بەسەر هەرێم و شانشینەکانی خۆیاندا هەبوو، بوونی ئەم دەسەڵاتە لاوەکییانە رێگر دەبوو لەبەردەم یەکگرتنی وڵاتی فەرەنسادا و دەسەڵاتی پاشای لە مەرکەزدا کەم ئەکردەوە، دەبوایە پاشا دەسەڵاتێکی وای هەبوایە کە دەستڕۆیشتوو بوایە بەسەر هەموو هەرێم و شانیشنە لاوەکییەکانی خانەدانەکانەوە.

بودان بەم بیرۆکانەی دەیویست هاوکار بێت بۆ پاشا لە کاری یەکگرتنەوەی ناوچەکاندا وەك بەڵگە و بەهانەیەك بوو بە دەستی پاشاوە بۆ

---

[1] أبو خزام، الوسيط في القانون الدستوري، ل١٥٤.

سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر خانەدانەکان و سەرجەم مڵك و سامانەکانیان.[1]

لەڕاستییدا تێڕوانینی بودان وەك زانایانی قانون و کەسە سیاسییەتمەدارەکان سەردەمەکەی لە کتێبەکەیدا سێ جۆر گەورەیی و سەروەریی بڕیارداوە:

١ـ سەروەری گەل: کە تیایدا گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە، یەکسانی باڵ ئەکێشێ بەسەر هەموو هاوولاتیاندا و هەموویان یەکسانن لە خاوەندارێتیی زەوی و سامانەکاندا و تیایدا یاسا بەرقەرارە بەبێ جیاوازیی بەسەر هەمواندا.

٢ـ سەروەری ئوستوکراتییەکان: کە تیایدا خانەدانەکان و کەمایەتییەك دەبێتە سەرچاوەی دەسەڵاتەکان، ئەوان خاوەنی زەوی و سەرجەم سامانەکانن، لە جێبەجێکردنی یاساشدا ئەوان جیاوازن لە خەڵکی.

٣ـ سەروەری پاشایەتی: کە تیایدا بە تەنها پاشا خاوەنی بڕیاردان و دەسەڵاتە، تەنها ئەویش خاوەنی زەوی و زار و سامانەکانە، تەنها ئەو لە هەموو یاساکان دەبەخشرێت.

بودان سەروەری گەلو سەروەری ئوستوکراتی و حوکمی چین و بنەماڵەی رەدکردۆتەوە، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك:

ئەترسا لە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت، تەشەنەکردنی ناکۆکییەکانی ناو خانەدانەکان، یان دەستگرتنی بۆرجوازەکان بەدەسەڵاتەوە و کاریگەرییان لەسەر زۆرینەی گەل، چونکە گەل وەك ڕانەمەڕ ـ قطیع ـ پارەدار و دەوڵەمەندەکان ئەتوانن کاری تێ بکەن.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٦٨.

ئەمەو چەندان هۆکاری تر کە (بودان) گریمانەی بۆ دانابوون، ناچار هەستاوە بە شایستەگرتنی هەڵبژاردەی سێیەم ـ سەروەری تاك سەرۆك و پاشایەتی ـ لەلای ئەو ئەمە باشترین بژاردەیە لەپێناو یەکپارچەیی و سەقامگیری وڵاتدا).[1]

جا هەموو پاشاکانی ئەوروپا ئەم بەهانەیان بەدەستەوەگرت و سوودیان لە بیرۆکەکەی بودان سەبارەت بە سەروەری، وەرگرت و بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە ئەم دەسەڵاتەیان لە خواوە وەرگرتووە نەك لە گەلەوە.

تەنانەت لە یاداشتەکانی لویسی چواردەیەمدا هاتووە دەڵێ: (.... ئەو دەسەڵاتەی پاشاکان دەستیان کەوتووە رێگەپێدانە لە لایەن چاودێری خواییەوە، چونکە خوا سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتێکە، هەر ئەویش لە پاشاکان ئەپرسێتەوە لە چۆنیەتی ئەو حوکمەی پیادەی ئەکەن).

لە پاشکۆی ئەو راگەیانراوەدا کە لویسی پانزەهەم دەری کردووە لە ساڵی ١٧٧٠دا ئەڵێ: (...ئێمە خاوەنی تاج نین بەڵکە تەنها لەلایەن خواوە پێمان دراوە، مافی داڕشتنی یاسایش ـ سەروەری ـ تەنها بۆ ئێمەیە بەبێ هاوبەشی یان راوێژکاری هیچ کەسێك).[2]

بیری دیموکراسی لە ئەمڕۆدا راو بۆچوونەکانی بودان سەبارەت بە پەیوەندی نێوان پاشا و هاووڵاتیان رەد ئەکاتەوە، بەڵام جەوهەری ـ سەروەری ـ بەبێ ئەوەی بڵێین بۆ کێ بێ ـ وەك زاراوەیەکی سیاسی بەردەوامبوونی دەبێت لە فەلسەفەی دیموکراسیدا، بودانیش زیاتر لە هەموو زانایەکان رۆڵی زیاتر بووە لە دەوڵەمەندکردنی بیرۆکەی ـ سەروەری ـ

---

[1] تأريخ الأفكار السياسية، ل١٧٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٥٥.

هەرچەندە هەڵەیەکی گەورەی کرد کە دایە دەستی پادشا خۆسەپێنەکان و لە چنگی گەلی دەرهێنا.

بەڵام بیرۆکەی سەروەری ـ سیادە ـ وەك دواتر پێی ئەگەین ـ بوو بە چەکێك بۆ دەستی دیموکراسیەت و بۆ ئەوانەشی کە بیرۆکەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیان دامەزراند: وەك (هوبز، لوك، رۆسۆ).

هەروەها ئەو شۆڕشگێڕانەی خەباتیان کرد دژی دەسەڵاتی تاکڕەوی و چینی خانەدانەکان و پیاوانی ئایین، (فلیپ بۆت) کە یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی فەرەنسی بە ئاشکرا لە دانیشتنەکانی ئەنجومەندا ئەمەی راگەیاند و وتی:

(گەل ئەبێت سەروەر بێت، هەر ئەویشە پاشاکانی دروستکردووە، پادشاکانیش هەر بەوەی پادشای وڵاتن مانای ئەوە نییە سوود لە گەل وەرگرن و لەسەر حسابی ئەوەی خۆیان دەوڵەمەند بکەن، نەخێر بەڵکو ئەبێ گەلەکانیان والێبکەن دەوڵەمەند و بەختەوەر بژین، ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەیان کرد ئەو ەبە پادشای ملهوڕ ناودەبرێن).[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٥٦.

- ٤ -

## گرێبەستی کۆمەڵایەتی

بیرمەندەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك (هوبز و لوك و رۆسۆ)، سودیان لە بیرۆکەی سەروەری وەرگرت کە بودان دایڕشتبوو، بیردۆزەکانی خۆیانیان لە بواری گرێبەستی کۆمەڵایەتی دا لەسەر بونیات نا).[1]

بەڵام تۆماس هوبز (١٥٨٨ ـ ١٦٧٩) پێی وابوو کە شەرعیەتی دەسەڵات و مافی پادشاکان لە فەرمانکردن و بەرگرییکردندا لە ڕێگەی پشتاوپشتکردنی کورسی دەسەڵاتەوە بەدەست نایەت وەك چۆن خێزانی شاهانەکان پێیان وایە. هەروەها ئەو دەسەڵاتەی لە لایەن خواوە پێ نەگەیشتووە وەك کەنیسە بانگەشەی بۆ ئەکات.

لەبەرئەوەش نییە کە دەوڵەمەندترین کەسە لە وڵاتدا وەك دەرەبەگەکان پێیان وایە. یان لەبەرئەوە نییە کە زاناترین کەس بێت وەك چۆن فەیلەسوفەکان پێیان وایە.

بەڵکو ڕەوایەتی دەسەڵات لە ویستی سەرجەم گەلەوە دەست ئەکەوێت کە بەرژەوەندییەکانی دەپارێزێت و کاروبارەکانی بەڕێوە دەبات لە باتی تاکە تاکەی کۆمەڵگا و ئەمەش ئەسڵی بیردۆزی ـ گرێبەستی کۆمەڵایەتییە ـ چونکە سەروەری لە ئەسڵدا بۆ سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگایە نەك بۆ کەسێکی دی بەدەر لە گەل).[2]

---

[1] مدخل إلى الفلسفة السياسة، محمد وقيع الله، ل١٤٩.

[2] رجل الساسة، دليل الحكم الرشيد، توفيق السيف، ل٩٠.

بەڵام لە بیردۆزەکەی (هۆبز)دا هاتووە کە گەل یان کۆمەڵگاکە لەو مافە سەروەرییەی خۆی دەست هەڵدەگرێت بۆ دەسەڵاتێکی باڵا کە هەستێت بە پاراستنی یاسا و ئاشتی کۆمەڵایەتی.

مەبەست لە دەست هەڵگرتن ئەوەیە: کە دەست لە مافە سروشتییەکەی خۆی هەڵگرێت بۆ پادشایەك ـ سەرۆکێك ـ وەك مافی ئازادی و موڵکداری، ئەم دەستهەڵگرتنەش لە پێناو مانەوە و ژیانی پڕ لە ئاشتی و ئاسایش و دوور لە ناکۆکی و کێشمەکێشمە.

کەواتە لای (هوبز) سەرورەی لە سەرەتادا بۆ گەلە، بەڵام لەبەر پێویستی لەم مافەی دەستهەڵدەگرێت بۆ سەرۆك یان پاشا، پاشان سەروەری پادشا لە پشتاوپشتەوە بۆ نەماوەتەوە، بەڵکو تەنها لە گەلەوە دەستی کەوتووە و ئەوەش ئەسڵی سەروەرییە. بەڵام ئاڵۆزییەك هەیە لە تێگەیشتنی هۆبز بۆ چەمکی سەروەری، واشی داناوە ئەو دەستهەڵگرتنەی گەل کە باسی کردووە یەکجارە و یەکجارییشە، لە روانگەی هوبزیشەوە دەستاودەستکردنی دەسەڵات شتێك نییە بەو ناوەوە، دواتر ئەو دەسەڵاتپێدانەی پاشا وای لیٚ ئەکات ببێت بە خاوەنی تاکە دەسەڵات و گەل هیچی بەدەست نەمێنێت.

بەڵام ئەگەر حکومەت یان سەرۆك نەیتوانی سیستەمی وڵات و ئەمن و ئاسایش بپارێزێت و بەها کۆمەڵایەتییەکان بەرز رابگرێت و خۆشگوزەرانی بۆ گەل دەستەبەر بکات، ئایا ئەم سەروەری و دەسەڵاتەی لێدەسەنرێتەوە کە گەل پێیداوە لە رێگای بەرەنگاربووەنەوە یان شۆڕشەوە؟

ئەم خاڵە گرنگە جەوهەرییە، هوبز لێی بێدەنگ بووە یان راستتروایە بڵێین قسەیەکی روون و ئاشکرای یەکلاکەرەوەی نییە لەم بوارەدا.

لەبەرئەمەیە کە (جون لووك) بیرمەندی دووەم لە بیردۆزەی (گرێبەستی کۆمەڵایەتی)دا رەخنەی توند ئاڕاستەی هوبز ئەکات لە بیرۆکەی (دەستهەڵگرتنی یەکجاری) کە هوبز باسی لێوەکردووە، لەبەرامبەردا بیرۆکەیەکی جێگرەوەی هێناوە و ناوی ناوە (دەستهەڵگرتنی مەرجدار).

بەجۆرێ کە بۆ گەل هەبێ هەرکاتێك ویستی سەروەرییەکەی وەرگرێتەوە، بەتایبەت ئەگەر ئەو دەسەڵات و سەروەرییە لەلایەن حکومەت یان سەرۆکەوە بەجۆرێ بەکارهات کە خزمەت بە هاووڵاتیان نەکات و مافەکانیان دەستەبەر نەکات.

لەلای (بیردۆزەکەی جون لووك) جگە لە سەروەری گەل، هەموو سەروەرییەکانی تر کاتییە و مەرجدارە، تەنها سەروەری گەل هەمیشەییە، چونکە هەموو سەروەرییەکان لە حاڵەتی ئاساییدا هەڵئەوەشێنرێنەوە، ئیتر سەروەری پادشایی بێت یان پەرلەمان، یان حکومەت.

تەنها سەروەری گەل نەبێت، هەرگیز هەڵوەشاندنەوە بەسەردا نایەت، مەگەر لە حاڵەتێکی زۆر ناسروشتییدا وەك ئەوەی هەموو گەل بکوژرێت، یان سەرجەمیان ئاوارەی وڵاتان بکرێن، یان داگیرکەرێك دەست بگرێت بەسەر وڵاتدا و هەموو هاووڵاتییەکان بکاتە کۆیلەی خۆی و ئەم بارو حاڵەتانەش ناسروشتیین.بەڵام لە بار و حاڵەتی سروشتییدا ـ ئەسڵ ـ وایە بەردەوام گەل سەروەری خۆی هەبێت و ناکرێت هەرگیز لێی بسەنرێتەوە کە سەروەرییەکە نە کۆتوبەندکراوە و نە مەرجدارە، بەڵام سەروەری و دەسەڵاتی سەرۆك یان پەرلەمان یان حکومەت، هەمووی مەرجدار و کۆتوبەندەو جێگای هەڵوەشاندنەوەیە.

پاشان (جان جاك رۆسۆ) مەسەلەی ـ گرێبەستی کۆمەڵایەتی ـ بەیەکجاریی یەکلایی کردووەتەوە، بەشێوەیەکی یەکجارەکی سەروەری خستۆتە چوارچێوەی (ئیرادەی گشتی) گەلەوە، بەشێوەیەك کە هەرگیز نابێتو ناکرێت دەستی لێ هەڵبگیرێت، چ بە یەکجاریی یان بە مەرجو کۆت، گەل هەمیشە فەرمانڕەوایە و جگە لە ئەو حاکمێکی تر نییە، ئەو باڵاترین دەسەڵاتە لە هەموو بوارەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریدا.

لەبەرئەوەی گەل بە هەموو ئەندامەکانییەوە ئەم کارەی پێ ناکرێت، (رۆسۆ) بیرۆکەی (راسپاردن)ی بۆ داناوە لەباتی بیرۆکەکەی هۆبز (دەستهەڵگرتن).

دەستهەڵگرتن و دابەزین کردەیەکە واتە گوێزانەوەی سەرجەم دەسەڵات و موڵکداری و سەروەری گەل بۆ سەرۆکێك، بەڵام راسپاردن تەنیا واتە جێگر یان بریکار یان کرێگرتەیی لەلایەن گەلەوە لەگەڵ مانەوەی دەسەڵات و سەروەری بۆ گەل، ئا ئەمەبوو جەوهەری ئەو گەشەکردنە لە بواری گرێبەستی کۆمەڵایەتی دا کە گوێزانەوەیە لە (دابەزین و دەستهەڵگرتن)ەوە بۆ (راسپاردن و پێسپاردن).

کاتێ ئەڵێین سەروەری بۆ گەلە، لە بیرۆدۆزەی رۆسۆدا مانای ئەوەیە کە ئەم سەروەرییە دابەشکراوە بەسەر گەلدا و هەموو تاکێکی کۆمەڵگا بەیەکسانی ئەم مافەیان هەیە، مەگەر کەسانێك بە سروشتی ئەو مافەیان لەدەست دابێت، وەك منداڵ و شێت و هاوشێوەکانیان، ئەمەش چار نییە و پەروەردگار سروشتی وا خوڵقاندوون، جگە لەمە، هەموو تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگا، هەموو مافێکی خەڵکانی تریان هەیە.

جەوهەر و ناوكرۆكی فەلسەفەی گرێبەستی كۆمەڵایەتی، بەندە لەسەر ئەو بنەمایەی كە هەموو تاكێكی ناو گرێبەستەكە وەك هەموو خەڵكانی تر یەكسانن بەبێ رەچاوكردنی جیاوازی ئایین، یان عەشیرەت، یان مەزهەب، یان بیروڕا و رەنگ و رەگەز، بۆ هیچ تاكێكی ئەم كۆمەڵگایە نییە كە پلەیەكی تایبەتی بۆ خۆی دابنێ لەبەرئەوە جیاوازییانەی كە باسمان كردن.

ئەم سەروەرییەی گەل، ئەو دەرەنجامەی لێ دەردەكەوێت كە ناونراوە (ئیرادەی گشتی)، بیرۆكەی ئیرادەی گشتی بنكەیەكە لە دیدی بیردۆزەكەی رۆسۆدا، چونكە سەروەری پێوەی بەندە بەشێوەی ئەندامێتی، بەو پێیەی ئیرادەی گشتی لە گرێبەستێكی نێوان ئەندامانی كۆمەڵگە پێكدێت كە لەنێوان خۆیاندا و بە رەزامەندیی و تەوافوق، ئەمەش لەبەر خاتری بەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگاكایە.

ئەم گرێبەستە مانای ئەوە نییە خەڵكەكە لە شووناس و ئایین و مەزهەبی تایبەتی خۆیان دەستهەڵبگرن یان لە سەربەستی تایبەتی و ئازادییەكانیان، بەڵكو لە بەشێكی كەمی دیاریكراوی سەربەستییەكانیان وازئەهێنن كە ئەوەش پەیوەستە بۆ بەرژەوەندیی گشتی و پێكەوەژیان، چونكە دەستهەڵگرتنەكە بە ئەوپەڕی ئارەزوومەندانە و تەوافوقەوە بووە نەك لە رێگای زۆرلێكردن و ملقەوچاندنەوە.

كەواتە (ئیرادەی گشتی) لە گرێبەستەكەوە دروست ئەبێت و گرێبەستەكەش لە سەروەری گەلەوە دروست ئەبێت، بە مانایەكی تر سەروەری گەل هەڵقوڵاوی ئیرادەی گشتییە كە لە رێگەی گرێبەستەوە بە روونی رەنگ دەداتەوە.

وە ئەم ئیرادە گشتییەیە کە رەوایەتی سیاسی لە دەسەڵات و دامودەزگاکانی ئەسەنێتەوە، وە رەوایەتی حکومەت لە ئیرادەی گشتییەوە هەڵئەقوڵێت.

سەروەری و دەسەڵاتی وڵات (چ لەسەر ئاستی ناوخۆ یان دەرەوە) دەرەنجامی سەربەخۆیی ئیرادە گشتییەکەیە، سەروەری یاسایش تەنها لە ئیرادە گشتییەکەوە سەرچاوە ئەگرێت.

ئا لێرەوە، ئەو زاراوە بەناوبانگ و وردەی بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت کە دەڵێن: "گەل سەرچاوە و کانیاوی سەروەرییە"، یان "سەرشاری دەسەڵاتە و سەرچاوەکەیەتی".

- ٥ -

## ( ئەتوانین زاراوەی سەروەری گەل بدەینە پاڵ شەریعەت )

له پاش ئەم روونکردنەوە کورتەی زاراوەی (سەروەری)، ئەگەڕێینەوە بۆ ئەو پرسیارەی کە جێگای مشتومڕ و خراپ حاڵیی بوونە، کە تا ئێستاش هەندێ لە ئیسلامییە پارێزکارەکان دەیوروژێنن، ئەویش ئەوەیە، ئایا دروستە ـ لە روانگەی زانست و شەرعەوە ـ زاراوەی (سەروەری) بە مانا سیاسییەکەی بدەینە پاڵ شەریعەتی ئیسلامی؟ بە جۆرێ کە بڵێین: سەروەری بۆ شەریعەتە، ئەی شایانتر نییە بپرسین: ئایا ئەتوانین بیدەینە پاڵ خوای پەروەردگار و بڵێین: سەروەری سیاسی ـ وڵات ـ بەدەست خوای تەعالایە؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستە ئەوەمان لە یاد بێت، کە زاراوەی (سەروەری) زاراوەیەکی سیاسیی و یاساییە لە بنەڕەتدا، واتە هەر لە دروست بوون و گەشەکردنیدا، مانایەکی جێگیر و واتایەکی روونیشی هەیە لە زانستی سیاسەت و قانوونی نوێدا، تەنانەت لە دەقە فەلسەفی و هزرییەکانیشدا.

کەواتە بەوپێیە ناتوانرێت ئەم زاراوەیە لە بوارە سیاسی و قانوونییەکەی دەربهێنین و لە کۆمەڵە بوارگەلێکی تردا بەکاربهێنین وەك بواری بیروباوەڕ و وتووێژ و لاهووتیدا کە ئەوانە هیچ پەیوەندییەکیان نییە بە کاری سیاسیی دنیاییدا، دوو بوارەکە زۆر جیاوازن لە یەکتر و ئەمەش لەم روونکردنەوەیەی خوارەوەدا بە روونی دەرئەکەوێت:

(جان بودان) بە باوکی راستەقینەی بیردۆزی سەروەری دائەنرێت، کە توانی سەروەری بێنێتە بواری بەشەرەوە، بە مانای کەسەکان خاوەنی

ئیرادە و توانای خۆیانن، کە بەپێی (بودان) سێ چینن وەك باسمانکرد: چینی گەل، چینی خانەدانەکان، چینی سەرۆك یان پاشاکان.

کەواتە (بودان) سەروەری نەداوە بە کتێبی پیرۆز ـ ئینجل و تەورات ـ وەك رێنماییەکانی مەسیح ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ وە هەموو ئەو بەها مرۆڤانەیەی کە لەسەردەمی خۆیدا بڵاو بووە، چونکە بیروباوەڕ و بەهای بەرزن، بەڵام تەنها بیردۆزەن، خۆیان بە خۆیان ناتوانن وەك چەمکە سیاسییەکەی حوکمڕانی بکەن، هەر بە سروشتی خۆی پێویستی بە خەڵکانێك هەیە کە خاوەنی ویست و توانای خۆیان بن و لە ئەرزی واقیعدا بەرجەستەی بکەن.

کەواتە ناتوانایی بیروباوەڕەکان لە بواری ئیرادە و تواناداو وایان لێ ئەکات ناتوانن سەروەری و سیادە وەك چەمکە سیاسییەکەی جێبەجێ بکەن، چونکە سەروەریی خۆی بۆخۆی دەسەڵاتێکی باڵایە و پێویستی بە کەسانی تر نییە هەستن بە بەرجەستەکردنی. دەی هەر ئەمەش وای لەو بەڕێزانە کردوە کە رەخنەیان لە بیردۆزەی (سەروەری گەل) هەبێ، ئەگەر وا تێگەیشتبن لە مانای سەروەری کە بە مانای بەرزی و بڵندی و رێز مانای بکەن، دەی ئەوەش بەدەر نییە لە گفتوگۆ و جێگای ناکۆکی هیچ لایەك!

(سەروەری) بە مانا سیاسییەکەی کارپێکردن ـ ممارسة ـ گرنگترین پایەیە کە لەسەری راوەستاوە، بەمانای ئەوەی خاوەنی سەروەری خۆی بەخۆی سەروەرییەکەی بەکارئەهێنێ نەك بە ویستی کەسانی تر.

ئەگەر پێویستی بە کەسی تر هەبێت لە بەکارهێنانی سەروەرییەکەیدا ئەوەی خاوەنی سەروەری تەواو نییە وەك پێشتر باسمانکرد، سەروەری واتە ـ ئیرادەی بەرز و دەسەڵاتی بڵند ـ بەجۆرێ پێویستی بە ئیرادەی کەسی تر

نەبێت جگە لەخۆی، لەبەرئەمەشە کە پێناسەکەی (رۆسۆ) وردترین پێناسەیە کە وتوویەتی: سەروەری واتە کارپێکردنی ئیرادەی گشتی.[1]

هیچی لە سەرچاوەکان خاوەنی ویستی خۆیان نین ئیدی ئەگەر ئاینی بێ، یان فەلسەفیی، یان کەلتووری، هیچ لە سەرچاوەکان کاری سیاسی و حوکمڕانی ئەنجام نادەن مەگەر لە رێگەی خەڵکانی سیاسییەوە.

ئێ ئەو خەڵکە سیاسییەش یان گەلەکەیە، یان سەرۆك و پادشاکانیان، یان خانەدانەکان، وەك دابەشکردنەکەی بودان کە دەڵێ یان گەل یان چینی دەستڕۆیشتوو چ ئایینی بێ یان سەرمایەداری یا پادشایەتی.

مەبەست لە کرداری دەسەڵاتی سیاسی، تەنها کاری جێبەجێکردنی حکومەت نییە وەك هەندێ لە نووسەرەکان وای بۆ ئەچن، بەڵکو مەبەست لێی کرداری سیاسییە. کە گرنگترین و ترسناکترین و ئاشکراترینی ئەوەیە کە گەل بۆی هەبێت سەرعیەتی سیاسی لەهەر سێ سەرۆکایەتییەکە بسەنێتەوە چ یاسادانان چ جێبەجێکردن و دادوەری، ئەمەش لە رێگای (ویستێکی گشتی) گەلەوە.بە مانایەکی  تر: واتە دەسەڵاتی باڵا کە (سەروەری)یە سەرچاوەی هەر سێ دەسەڵاتەکە و گشت دەسەڵاتێکی تر بن و ببێتە سەرچەشمەی رەوایەتی سیاسی.بودان لەڕاستییدا لە پێناسەکردنی سەروەرییدا پێشی رۆسۆ کەوتووە، کە سەروەری بە ئیرادەی تەواو مانا کردووە، دەڵێ: بەرزترین ئیرادەی ناو کۆمەڵگایە.

یاسای بەها شەرعییەکانیش خاوەنی ئیرادە نین، هەروەك چۆن هۆبز کاتێ پێناسەی سیادەی کرد وتی: سەروەری واتە قۆرخکردنی هێزی پابەندکردن و زۆرلێکردن.[1]

---

[1] العقد الاجتماعي، ل١٠٥.

کەواتە هەموو سەرچاوە رەوشتی و بەهای و کەلتووریەکان خاوەنی هێزی پابەندکردن و زۆرلێکردن نین، بەڵکو خەڵك خاوەنی ئەم دوو هێزەن.

ئەوەی جێگای تێڕامانە رۆسۆ لە کتێبەکەیدا ـ گرێبەستی کۆمەڵایەتی ـ زاراوەی ـ کەس ـ یان خەڵکی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی وشەی (سەروەری) بخاتە پاڵ، ئەم کارەشی هەڵبژاردەیەکی ورد و مەبەستدار بووە ـ بە گومانی ئێمە ـ لەلای رۆسۆ ئەو کەسەی کە وشەی (سەروەری) دەدرێتە پاڵی دوو جۆرن لە لایەنی گریمانەی تیۆرییەوە:

١ـ یان کەسێتییەکی ستەمکار و زۆردار ـ، کە تاکە کەسە.

٢ـ کەسێتیەکی دەستەجەمعی، کە گەلە.

(کەسێتی) ئەو مرۆڤەیە کە سەروەری سیاسی ئەدرێتە پاڵ، ئیتر فەرقی نییە بە مانای تاکە کەس بێت یان بە مانای دەستەجەمعی و کۆمەڵ، هۆکاری ئەوەی وشەی ـ سەروەری ـ دراوەتە پاڵ کەسەکەوە لەبەرئەوەیە کە ئەو خاوەنی ئیرادە و توانایە بۆ پیادەکردنی سیاسەت.

لەمەش زیاتر، کاتێ کە ـ بودان ـ وەسفی ئیرادە ئەکات بە وشەی (باڵاترین) و ئەڵێ: "ئەوەیە کە لە کۆمەڵگادا پەیدا ئەبێت"، واتە بەڕاستی ئیرادەیەکی زۆر بەرز و باڵاترینە، بەڵام هەر لە سەروی کۆمەڵگەوە نییە، بەڵکو لە چوارچێوەی کۆمەڵگادایە.

واتە بەڵێ باڵاترین ئیرادەیە، بەڵام هەرچی ببێ دنیاییە و هەڵقوڵاوی کۆمەڵگایە، ئیرادەیەکی ئاسمانی و خوایی نییە، بۆیە لە وشەی سەروەری بە زاراوە سیاسییەکەی نابێت بدرێتە پاڵ خوای گەورە، چونکە خوای پەروەردگار لەوە خاوێنترە و لەوە بەرزترە لەسەر عەرشەکەیەوە دابەزێتە

---

[١] تأريخ الافكار السياسية.

سەر زەوی و دەسەڵاتی خۆی لەناو خەڵکدا جێبەجێ بکات و حوکمی وڵات بکات بە خودی خۆی.

بەڵێ خوا ـ سبحانە وتعالی ـ بە تەنها خۆی حوکمی هەموو بوونەوەر ئەکات، بەڵام خۆی وەك حاکمێکی سیاسی و بێتە ناو خەڵك شتی وا ناکات و نەیکردووە. بۆ ئەوەی زیاتر دووپاتی بکەینەوە، هەروەها ـ بودان ـ پێناسەی (سەروەری) بەوە کردووە کە : باڵاترین هێزە کە سەپاوە بەسەر سەرجەم هاووڵاتیان و شتەکاندا بە جۆرێ پشت ئەستوور بە چەند یاسایەك کە هاووڵاتیانی پێوە پابەند دەکرێت و چاودێریی کاری جێبەجێکردنەکەشی دەکات.

سەرنج بدە، لەگەڵ مندا وردبەرەوە لەم کارە سیادی و سەروەرییانە:

١ـ پشتبەستن بە کۆمەڵە یاسایەك.

٢ـ هاووڵاتیان پابەند بن پێوەی.

٣ـ چادێری کارەکانی دەوڵەت.

ئەم کارە سیادییانە لە روانگەی عەقڵ و هەستەوە، ناچێتە عەقڵەوە، چەند ئەخلاق و بەهایەك خۆیان هەستن بە جێبەجێکردنی ـ کە لە ناویاندا ـ شەریعەتی ئیسلامی بە نموونە.

هەروەك ئەو کارانەی سەرەوە کە باسمانکرد، خوای گەورە زۆر لەوە مەزنتر و خاوێنترە کە خۆی بێتە ناو کۆمەڵگا و ببێتە سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکان و یاساکان جێبەجێ بکات و چاودێری جێبەجێکردنیشی بکات.

برا سەلەفییەکان، ئەوانەی کە وا دەبینن کە وشەی سیادە و سەروەری دروست نییە بدرێتە پاڵ خوای گەورە، یان بدرێتە پاڵ شەریعەتی ئیسلامی، بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن دوو شتیان تێکەڵ کردووە، ئەویش تێکەڵکردنی مانای (سەروەری) وەك زاراوەی سیاسی و وەك زاراوەیەکی زمانەوانی، واتە: مانا زمانەوانییەکەی و زاراوە دانراوەکەی.

سەروەری ـ وەك پێشتر باسمان کرد ـ وەك زاراوەیەکی زمانەوانی، واتە ئەوپەڕی بەرزی و بڵندی و شانازی و سەرگەورەیی، لە هەندێ فەرموودەدا بەم مانایە هاتووە وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (أنا سيّد ولد آدم يوم القيامة)،[1] واتە: من سەروەر و سەرگەورەی هەموو نەوەکانی ئادەمم لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، ئیمامی نەوەویش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەڵێ: "هەرەوی ئەڵێ: سەروەر ئەو کەسەیە کە لە هەموو هۆزەکەی زیاتر سەرگەرمی خێر و چاکەیە".

یان کەسانی تریش ئەڵێن: سەروەر و سەرکردە ئەو کەسەیە کە هۆزەکەی ـ گەلەکەی ـ لە کاتی ناڕەحەتییەکاندا پەنای بۆ دەبەن و ئەویش هەڵئەستێت بە هاوکارییان و ناڕەحەتییەکانیان لەسەر لادەبات.

پاشان پێشەوا نەوەوی قسەیەکی زۆر جوان ئەهێنێت کە بە ناڕاستەوخۆ جیاوازی کردووە لە نێوان زاراوە سیاسییەکەی سەروەری و نێوان واتا ئاینی و بەهاکەی و دەڵێت:

---

[1] رواه مسلم.

مەبەست لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە وشەی (ڕۆژی قیامەتی) ئەوەیە کە لە ڕۆژی دواییدا هیچ گەورە و سەردارێك نامێنێت کە کێشمەکێشی سەروەری لەگەڵ بکات بە پێچەوانەی ژیانی دونیا کە سەرانی کوفر و بێباوەڕان خۆیان بە سەرۆك و سەروەر ئەزانی زیاتر لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

ئەمەش زۆر نزیکە لەو ئایەتە پیرۆزە قورئانییەی کە ئەفەرموێت: ﴿لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾[1]، لە قیامەتدا پادشایی و سەروەری و گەورەیی تەنها بۆ خوای تاکانە و زاڵە، بەڵام لە دنیا خەڵکی خۆی بە گەورە و سەرۆك ئەزانی و یان سەرکردەیی ئەدرێتە پاڵ خەڵکی، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو ئەو سەرکردە کاتی و دونیاییانە نامێنێت.[2]

هەر لەسەر ئەم مانایە، فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: (الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنه) واتە: حەسەن و حوسێن سەرکردەی گەنجانی ناو بەهەشتن.[3]

هەروەك فەرموودەی: (إن ابني هذا سيّد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين عظيمتين)،[4] واتە: ئەم کوڕەم واتە (حەسەنی کوڕی عەلی) سەید و گەورە دەردەچێت و هیوادارم خوای گەورە بیکاتە هۆی ئاشتەوایی نێوان دوو تاقمی گەورەی ناو موسڵمانان.

---

[1] غافر: ١٦.

[2] شرح مسلم، النووي ١٥/٣٧.

[3] رواه الترمذي والحاكم، وصححه ووافقه الذهبي.

[4] رواه البخاري.

حەسەن و حوسەین (خوایان لێ رازی بێ) سەرکردە و سەروەر بوون وەك رێز و حورمەت و باوباپیر و شەرەفی خزمایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام سەروەری و گەورەیی وەك مانا سیاسییەکەی ـ لە واقیعدا ـ حسەین نەیبووە، بەڵکو معاویە و بەنی ئومەیە و خەلیفەکانی دوای ئەوانیش، بەڵام فەرموودەکەی لەگەڵ وەفدی بەنی عامر کە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێیان وت: تۆ گەورە و سەروەرمانی، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێی خۆش نەبوو، بۆیە پێی فەرموون: (السید الله تبارك وتعالی)، واتە وا مەڵێن بە من، بەڵکو سەروەر و سەیدی راستەقینە خوای تەبارەك وەتەعالایە و ئەوە خاوەنی بەرزی و بڵندی و شەرەفی تەواو، ئەویشە ئەبێت بە کاملی گوێڕایەڵی بکرێت.

ئەم سیادە و سەروەرییەش هاومانای زاراوەی ـ ربوبیةـ ی خوایە، واتە ئەوپەڕی دەستڕۆیشتوو و سەروەرە بەسەر هەموو بوونەوەردا و ئەم سەروەرییەی بەسەر هەموو بوونەوەردا سەروەری تەواوە و جیاوازە لەو سەروەرییە کە بە مانا سیاسییەکەی هاتووە، کە کردەیەکی دنیایی بەشەرەکانە، پێویستە لەناو کۆمەڵگادا ئەنجام بدرێت، بەپێی پێناسەکەی (بودان)، کە بێگومان خوای گەورە زۆر مەزنتر و خاوێنترە لەم جۆرە سەروەری و سیادە دنیاییە.

بەڵام زاراوەی (سەروەری شەریعەت) بە مانا زمانەوانییەکەی نەك سیاسییەکەی، وەك هەندێ لە ـ برا ـ سەلەفییەکان دەیخەنە ناوەوە، ئێمەش پێمان خۆش نییە تەنانەت بە مانا زمانەوانییەکەشی و لەگەڵ ئەوەشدا کە وشەی ـ سەروەری ـ بەکارهێنراوێکی نوێیە و لە ناوەندە ئیسلامییەکەدا بوونی نەبووە و فراوانخوازییەکی تێدایە کە پێمانخۆش نییە، چونکە خراپ

حاڵیبوون و لێتێکچوونێك هەیە لە زاراوە زانستییەکەی (سەروەری)دا، لەبەرئەوەی سەروەری بە مانا سیاسییەکەی ـ وەك پێشتر باسمانکرد ـ تەنها وەسفێك نییە تا بیدەینە پاڵ بەها و بیروباوەڕەکان، بەڵکو وەکو وەسفە، لە هەمانکاتدا مومارەسەیە (واتە مومارەسەکردنی ئیرادەی گشتی) یان (سەرچاوە دەسەڵاتەکان) لەسەر وتەکانی رۆسۆ.

شەریعەتیش وەك کۆمەڵە بیروباوەڕ و ئەحکامێك، ناتوانرێت وەسف بکرێت بە بوونی ئیرادە و توانا تا مومارەسەی سەروەرییەکەی خۆی بکات و یان خۆی بکاتە سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکان.

دواتر، دانەپاڵی وشەی (سەروەری) بۆ شەریعەت، هەندێ شڵەژان و تێکەڵکردنی لێ دروست ئەبێت، بۆیە واباشترە لەباتی (سەروەری) وشەی (هەژمونی شەریعەت) کە زاراوەیەکی قورئانییە بەکار بێنین، واتە شەریعەتی ئیسلامی باڵاترین سەرچاوەی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەرییە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

کەواتە بەوەی کە شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەی باڵایە، راستییەکە و هیچ موسڵمانێك نکوڵی لێ ناکات، باوەڕبوون بەوەی کە دەبێ شەریعەت و سەیرکردنی وەك سەرچاوەی باڵا و پێویستی پابەندبوون پێوەی، یەکێکە لە بنەڕەتەکانی ئاینی ئیسلام، هەرگیز نابێت بە جێگای مشتومڕ و رای جیاواز لە بوارە ئیسلامییەکەدا.

بەڵام (هەیمەنەی شەریعەت) وەك سەرچاوەیەك، ئەوە ناگەیەنێت کە سەروەری و سیادەی هەیە بە مانا سیاسییەکەی، چونکە سەروەری سیاسی پەیوەستە بە پرسی دەسەڵاتەوە، بەڵام رێسای هەیمەنەی شەریعەتە پەیوەستە بە پرسی سەرچاوەیی.

هەر بەوەی موسڵمانان باوەڕیان وایە کە شەریعەت تاکە سەرچاوەیە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە سەروەری سیاسییشی دەستکەوتووە، چونکە دەستکەوتنی راستییەکان مانای دەستکەوتنی دەسەڵات نییە.

بەڵگەیش لەسەر ئەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و لەگەڵ هاوەڵانیدا کاتێ لە شاری مەککە بوون، لە ئەوپەڕی ئەو باوەڕەدا بوون کە وەحی و سروشی خوایی هەژموون و هەیمەنەی بەسەریانەوەیە لە سەرجەم بوارەکانی تایبەت و گشتییاندا.

هەر ئەم هەیمەنەیە و ئەم روانینەیان بۆ شەریعەت مانای ئەوە نەبوو کە هەرئەبێ ئەمان سەردار و سەروەری شاری مەککە بن، چونکە ئەمان لەو کاتەدا کەمینە بوون و سەرکردەیی و سەروەریی لەلای قوڕەیشییەکان بوو.

لەبەرئەمەیە کە ئەڵێین سەروەری سەرچاوەی ئایینی (لەلایەن پابەندبوون و جێبەجێکردنەوە) پێویستی بە سەرورەی سیاسی هەیە و بە جۆرێك کە سەرچاوەگیری نایەتەدی تا سەروەری نەیەتەدی.

لەڕاستییدا پەیوەندی نێوان دەسەڵات و سەرچاوەگیری، کەمەندکێشمان ئەکات بەرەو دەمەقاڵەیەکی فەلسەفی کە بوار نییە لێرەدا درێژەی پێ بدەین، بەڵام ئەوەندە بەسە کە ئاماژەیەکی بۆ بکەین ئەگەر بە کورتییش بێت.

ئەویش ئەوەیە باوەڕبوون بە بوونی یان دەرخستنی راستی (سەرچاوەی باڵا) ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت بسەپێنرێت بەسەر خەڵکانی تردا، چونکە زاراوەی راستی زۆر جیاوازترە لە دەسەڵاتی زۆرکاری، رەوایەتی راستی مانای شەرعیەت پێدانی دەسەڵات نییە.

ڕەوایەتی ڕاستی، سەرچاوە کانگاکەی لە ئایین یان لە فەلسەفەوە وەرئەگیرێت، بەپێچەوانەی سەرچاوەی ـ دەسەڵاتەوە ـ کە لە کۆمەڵانی خەڵك ـ یان لە سەرۆکێکی تاکڕەو کە دەسەڵاتی بە هێز ئەسەپێنێت ـ وەرگرتووە.

کەواتە پرسی ڕاستی و ڕەوایەتی بە تەواوی جیاوازە لە پرسی دەسەڵات، ئالێرەدا ناحاڵیی بوون و لێتێکچوونێکم بۆ نەیارانی دیموکراسی لا دروست بووە، چونکە وا ئەزانن کە وتت دیموکراسی ئیتر بۆ گەل هەیە بە ئارەزووی خۆی حەڵاڵ حەرام کات و حەرامیش حەڵاڵ بکات لەنێو دەقە ئاینییەکاندا، دەی ئەمە ڕاست نییە.

حەڵاڵ و حەرام لە ئیسلامدا ـ لە هەموو ئاینێکی تریشدا ـ سەرچاوەی زانینی دەقە پیرۆزەکانی ئاینەکەیە، نەك لە ڕێگای زۆرینەی گەلەوە وەك چۆن نەیارانی دیموکراسیەت بۆی دەچن.

ئەنجومەنی یاسادانان جێگای مشتومڕی فەتوادان و ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی ئەحکامە شەرعییەکان نییە، بەڵکو جێگای دروستکردنی بڕیار و یاسایە لە ڕێگای کۆمەڵە بڕیارێکی پابەند ئامێزەوەیە.

دەی جیاوازیش هەیە لە نێوان ئەوەی کە ئەنجومەن ببێتە سەرچاوەی حوکمی شەرعی و نێوان ئەوەی ببێتە سەرچاوەی دەسەڵات پێدان و پابەندکردن و زۆرلێکردن لە ڕێگای کۆمەڵە یاسایەکی پابەندئامێزەوە.

مەرجەعیەت و سەرچاوەی ـ هەرچییەك بێت ـ هەرگیز ناتوانێت لە ئەرزی واقیعدا بەرجەستە ببێت، مەگەر لە ڕێگەی دەسەڵاتەوە نەبێت، ئیتر ئەگەر دەسەڵاتی تاك سەرۆك بێت یان دەسەڵاتی گەل.

سەرۆکی تاکڕەو یان گەل، کاتێ حوکمڕانی و مومارەسەی دەسەڵات ئەکات، خۆ بە هەوانتە ئەوە ناکات، بەڵکو بەپێی بوونی سەرچاوەیەکی دەسەڵاتداری کە خۆی باوەڕی پێیەتی حوکمی وڵات ئەکات، ئیتر ئەو سەرچاوەیە هەرچییەك ببێت، چونکە هیچ گەلێك یان سەرۆکێکی تاکڕەو نییە کە بەبێ ئەو سەرچاوەگەراییە بتوانێت حوکم بکات.

هیچ گەلێك نییە لە هەموو جیهاندا کە بێ سەرچاوەگەرایی بەهایی، و بێ شووناسێکی کەلتووری بێت، هەموو گەلانی سەرزەوی کاتێ حوکمڕانی گەل ئەکەن بەپێی سەرچاوە بەهاکانیان و شووناسی شارستانییان.

کەواتە لەڕاستییدا گەل حوکمی ئەکات، سەرچاوەگەرایی و شووناسەکان ناتوانن بە خۆیان حوکمڕانی بکەن، ئێ پاشان ناتوانرێت و راست نییە، سەروەری سیاسی بدرێتە پاڵ سەرچاوەگەراییە بیردۆزەکان، بەڵکو حوکمڕانی دەدرێتە پاڵ کەسێك کە ویستی هەبێت لە حوکمڕانییدا کە ئەویش گەلە.

ئالێرەدا داوای مۆڵەت لە خوێنەرانی بەڕێز ئەکەم لە هێنانی دەقێکی دوور و درێژ، بەڵام دەقێکی زۆر گرنگە، بیرمەندی ئیسلامی بە توانا (دکتۆر محمد عەمارە) نوسیویەتی، دەربارەی روونکردنەوەی سروشتی رێبازە سیاسییەکان، کە زۆرکردنێکی ناچارییە یان ویست و ئیرادەی بەشەرییە؟

ئەمەش لە دووتوێی گفتوگۆکردن لەسەر بیردۆزەی (حاکمیەتی خوا) کە بیرمەندی مەزنی پاکستانی (ئەبو ئەعلای مەودودی) رەحمەتی خوای لێ بێت باسی لێوە کردووە، محمد عەمارە دەڵێت:

"ئەمڕۆ، ئەو دۆزە (کۆنە نوێیە) دووبارە وا جارێکی تر لەسەر گۆڕەپانی عەرەبی و ئیسلامی سەرلەنوێ دەرکەوتەوە، بە هەمان ناوەڕۆك و بەهەمان مەبەستو ئامانج، لەگەڵ هەوڵدان بۆ نوێکردنەوەی داڕشتنەوەی هۆکارەکانی. بەهەمانشێوە گەڕایەوە تا لە ژێر ناوی (حاکمیەت تەنها بۆ خوایە) خۆی نمایش بکاتەوە.

هەڵگرانی ئەم دروشمە، پێیانوایە کە سوڵتان و دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا مافێك لە مافەکانی گەل نییە، مرۆڤەکان حوکمڕانی کۆمەڵگەکانیان نین، بەڵکو حاکمی تاکانە لەم کۆمەڵگایانەدا تەنها خوای پەروەردگار - عزوجل - ەو بەس، بە مانای ئەوەی کە ئوممەت - گەل - سەرچاوەی دەسەڵات و سەروەری نییە، وەك چۆن لە دەستوور و رێباز و بیردۆزەکاندا هاتووە لە هەموو وڵاتانی دنیای ئەم سەردەمەی خۆمان!

بەپێی وتەی ئەو بیرمەند و بانگخوازە ئیسلامیانە، هەموو ئەو گەلو نەتەوانەی کە تێدەکۆشن لە پێناو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و ببنەوە بە

سەرچاوەی دەسەڵات لە شێوازی حوکمڕانی کۆمەڵگاکانیاندا، هەر هەموویان لە ڕێگەی ڕاستی خوا لایان داوە و سنووری ئەویان بەزاندووە و ستەمیان لە تایبەتمەندییەکانی پەروەردگار کردووە!

لە سەرەتادا، ئەم بانگەشەیە مۆرکێکی دەسەڵاتی ئایینی بە بەر خۆیدا کردووە و دەست ئەگرێت بەسەر بیری هەموو ئەوانەدا کە پێچەوانەی ئەم رایەیان هەبێت!! جا کێ هەیە ـ بوێرێت ـ نکوڵی دەسەڵاتی خوا بکات؟ یان ئایا کێ ئەو کەسەیە ـ بوێرێت ـ قسە و مێزگرد بکات لە دەسەڵاتی ئوممەت ـ گەل ـ لەبەردەم دەسەڵاتی خوای پەروەردگاردا؟

لە سەرەتاوە کە گوێت لەو وتانە دەبێت ئەمەی لێ حاڵی ئەبیت... بەڵام هەڵقوڵاوی وردی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و تێڕامانی فیکری و حوکمدانی بابەتییانە نییە و گونجاو نییە فیکری ئیسلامی خاوێن و کەلتوورە ڕاستەقینەکەی لەم بوارەدا بە پێچەوانەی ئەوەوەیە، ئەمە بەرهەمی دروستبوونی بیرێکە کە کۆڵەکەکانی تێکەڵ و پێکەڵن بەسەر یەکدا.

یەکێ لە ئەنجامەکانی ئەم تێکەڵکردن و شێواندنە ئەوەیە کە دەیخوێنینەوە یان دەیبیستین، دەربارەی چەند ئەنجامێك کە ئەو کەسانەی لە بواری لێکۆڵینەوەی ئیسلامی سیاسییدا کار ئەکەن، ئەوەش ئەوەیە کاتێك کە بڕیاری ئەوە ئەدەن کە دیدی ئیسلامی سیاسی لەناو کرۆکدا جیاوازە لەگەڵ دیموکراسی سیاسییدا، چونکە دیموکراسی واتە گەل دەسەڵاتدار بێت و ئەو حوکم ئەکات، لەکاتێکدا کە لە ئیسلامدا، وەك ئەوان ئەڵێن ـ حوکمڕانی و دەسەڵات تەنها بۆ خوای تاکانەیە، هەر ئەو حوکمڕانە و هەموو حوکمڕانییەك بۆ ئەوە و جگە لە ئەو حاکمێکی تر بوونی نییە.

ئەم چەند کەسەی کە لە بواری کاری ئیسلامییدا کار ئەکەن، حوکمی ئیسلامی ئەخەنە خانەی ڕێبازی حوکمڕانییە ناچارییەکان (الحتمیة) ئەوانەی گەل ئیرادە ڕۆڵی نییە تیایاندا.

چونکە بەڕای ئەوانە ـ هەموو ڕێبازە ئیرادییەکان وا دائەنێن کە قسەی کۆتایی قسەی مرۆڤەکانە و ئیرادەی بەشەرەکانە ئیتر چ لە دامەزراندنیدا یان لەپێشخستنیدا.... لەکاتێکدا کە ـ لای ئەوان ـ ڕێبازی ئیسلام ئەو مافە لە ئوممەت و ـ گەل ـ ئەسەنێتەوە و بە تەواوی ئەیداتە دەستی خوای پەروەردگار.

ئەوان ئەمە ئەڵێن، کە دەسەڵاتداری سیاسی لە پەیڕەوی ئیسلامیدا واتە ـ حوکمڕان ـ بریکاری خوایە لە کارەکەیدا ـ ئیتر ڕاستەوخۆ ئەمە بڵێن یان نا ـ چونکە حاکم لە کۆتاییدا شەریعەت جێبەجێ ئەکات و یاسا بەرقەرار ئەکات.

ئەم بەم کارانەی جێگری دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی کۆمەڵگەیە و هەرکارتێ وتمان حاکمیەت بۆ خوایە، واتە ئاینییە و لە وەحی خواییەوەیە، پاشتر دەسەڵاتەکە ئەبێتە دەسەڵاتێکی ئایینی و ئەوەی پێی هەڵئەستێ واتە بریکار و جێگری (خوای حاکمە) و جێنشینی ئەویشە!

بەڵام ئەگەر وتمان (وەك چۆن لە دیدی دیموکراسیدایە) خاوەنی دەسەڵاتی ڕاستەقینە و سەروەری بۆ گەل بێت، ئەو کاتە حاکم لە باتی گەل و لەجیاتی گەل ـ کار ئەکات، وە ئەویش بەرپرسیارە لەبەردەم ئەو بەیعەتەی کە گەل پێیداوە و ئەتوانن لێپرسینەوە و لێپێچینەوە و

لەکارخستنی ـ ئەنجام بدەن ئەگەر ئەو مەرجەکانی بەیعەتەکەی نەهێنایەدی و لەگەڵ کاری کاردانەدەست[1] و هەڵبژاردنەکەیدا".[2]

پاشان دکتۆر عەممارە ئەوەش روون ئەکاتەوە کە خاوەن بیرۆکەی (حاکمیەت بۆ خوایە)، لەوەدا لێیان تێکچووە کە بەو دیدو بۆچوونە کار ئەکەن کە رژێمی سیاسی ئەکەن بە دوو جۆرەوە: ١ـ رژێمە ناچارییەکان کە ئیرادەی مرۆڤەکان هیچ رۆڵێکیان نییە تیایدا. ٢ـ رژێمە ئیرادییەکان کە لەسەر بنەمای ئیرادەی مرۆڤەکان و بنەمای (هەموو شت بەدەست ئوممەت ـ گەل ـ ە) پاش ئەوە ئیسلام ـ لە دیدی ئەوانەوە ـ یەکەم جۆرەکەیانە، حاکم تیایدا خوایە نەك مرۆڤەکان.

بەڵام لەڕاستییدا ئەم دابەشکردنە ـ وەك عەممارە ئەڵێ ـ ناواقیعییە و راستیش نییە، چونکە دەسەڵات لە هەر کۆمەڵگەیەکدا و لە ژێر هەر سیستەمێکدا و لە روانگەی هەر فەلسەفەیەکەوە بێت، لە ئاکامدا بەدەر لە هەموو دروشمو داڕشتنێك ـ لەدەستی مرۆڤەکاندایە، خۆیان یاساکان دادەڕێژن و جێبەجێکردن و دادوەری بەرپا دەکەن.

تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگەی ئیسلامیش لەپێش چاو بگرین، کە ئەو لێکۆڵەرەوانە باسی لێوە دەکەن و ئەحکامی ئەو دەوڵەتە بەیان ئەکەن، ئەڵێن:

حوکمڕانی بۆ خوایە و بۆ ئوممەت ـ گەل ـ نییە، کەچی دەبینین کەسانێکن و مرۆڤیشن خەریکی دانانی یاسان و حوکمی واجبیەتیشی دەرئەکەن و هەڵدەستن بە جێبەجێکردنیشی، لەگەڵ بانگەشەی ئەوەدا کە

---

[1] کاردانەدەست: تفویض.

[2] محمد عمارة، الدولة الاسلامية بين العلمانية والسلطة الدينية، ل٣٦.

ئەوان وەکیلی خوان و ئەویش سەرچاوەی دەسەڵات و حوکمڕانییە و بەهیچ جۆرێ وەکیل نین لەباتی ئوممەت.

هەر بەشەرن و حوکمڕانی ئەکەن و خۆ خوا خۆی حوکمەکە ناکات، ئیتر با بشلێین خوا حاکمە و هیچی تر.

ئەوەی تازەیە لەم مەسەلەیەدا ـ ئەگەر بکرێ وشەی تازەی بۆ بەکاربێت ـ ئەو کاتە کاتژمێرمان گەڕاندەوە بۆ چەندان سەدەی پێشتر بۆ ئەو فەلسەفەیەی کە دەڵێ (حوکمڕانی بەناو خواوە) لەسەر ئەو شێوازەی فارسەکان لە سەردەمی کیسرا و ڕۆما لە سەردەمی قەیسەردا و ئەوروپا لە چاخە تاریکەکاندا!

خراپە و زیانی ئەم ڕژێمە کەمتر نییە لە وێنەی ئەو فەلسەفە سیاسییانەی کە دەڵێت: سەرکردە و حاکم پابەندە بە شەریعەتەوە، چونکە خۆلادان لە ڕێگای "گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە"... فەرمانڕەواکان ـ هەریەکە و بە ئەندازەی خۆی ـ لەو کۆتانە خۆی قووتار ئەکات کە گەل بۆی دائەنێت تا لە ستەمکاریی و هەڵە و پەڵە بیپارێزێت.

هەروەك ئەمەش وای لێ ئەکات جۆرە بەرگێکی پیرۆزی ئایینی و دەسەڵاتی خوایی کە بە تەواوی پێچەوانەی گیانی ئیسلامە، ئەمەیە مەسەلەی ڕێباز و فەلسەفەکان و ئەمەیە مرۆڤایەتی خستووەتە بەر ـ بەبێ ڕەچاوکردنی بیر و باوەڕی ئەم جۆرە فەلسەفانە لە سیستەمی حوکمڕانیدا.

هەرگیز سیستەمە سیاسییەکان دابەش نابن بۆ حوکمڕانی ناچاری ـ حتمیە ـ و ئیرادی، چونکە و هەمیشە و گشت کات ـ ئیرادییە، دەسەڵات لە دەستی بەشەردایە و ئیرادەی ئەوەیان هەیە کە حوکمی هەڵسوکەوتەکانیان بکات لەو دەسەڵاتەی هەیانە.

ئەو دەسەڵاتەی کە باوەڕی وایە ـ گەل ـ سەرچاوەی دەسەڵاتە، وا بۆ سەرۆك‌و پاشاکانی ئەڕوانێت کە نوێنەری خەڵکن و ئەو خەڵکەش ئەتوانن دایان بنێن و چاودێرییشیان بکەن و هەرکاتێکیش مەرجی جێنشینی شکاند ئەتوانن لایبەرن لەسەر حوکم، لەکاتێکدا کە ئەو حکومەتەی کە ئەو کەسانەی وا گومان ئەبەن سەرۆکەکەی لە باتی خوای تەعالا حوکمی سیاسی و ئابووری وڵات ئەکات، ئیتر ئەو سەرۆکە لە باتی خوا لەسەر حوکمە و نوێنەری خوایە و نوێنەری خەڵکی نییە تا کەس بۆی هەبێت لایبات.

کەواتە دابەشبوونی راستەقینەی سیستەمی حوکم بەو جۆرەیە:

١ـ سیستەمێك حوکمڕانی ئەکات، بەڵام لەژێر پەردەی (مافی پەروەردگار)ی ـ الحق الالهی ـ.

٢ـ سیستەمێکیش بە ئاشکرا ئەڵێت: حوکمڕانەکان بەشەرن و نوێنەرایەتی بەشەرەکانیش ئەکەن، لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی کۆمەڵگەو حوکمڕانییەکەیدا و گەل سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکانە.[1]

کەواتە، سەروەری تەواوی پەروەردگار ـ جل وعلا ـ لە فەرمانداری و یاسادانان و دەسەڵاتداریدا، پێچەوانە نییە لەگەڵ رێبازی (سەروەری مرۆڤ)دا، چونکە دەسەڵات بە فیعلی و واقیعی بەدەست بەشەرەکانەوەیە، نەك بەدەست پەروەردگاری باڵادەستەوە یان بە دەست شەریعەت خۆیەوە و خوای پەروەردگار بەزاتی خۆی دانابەزێتە ناو بەشەرەکان و ناچاری قەبوڵی شەریعەتەکەی خۆیانیان بکات.

خەیاڵ و ئەندێشەیە وامان لێ ئەکات کە وا بیر بکەینەوە کە خوای پەروەردگار بە خودی خۆی حوکمڕانی وڵات ئەکات لەسەر زەویدا، خۆئەگەر

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.

خوا خۆی حوكمی وڵاتانی بكردایە لەسەر زەویدا، ئەوكات یەك بێ باوەڕ لەسەر زەوی نەئەما و هیچ سیستەم و ڕێبازێكی ـ دەستكردی سەر زەوی ـ كە دژ بێت لەگەڵ ویستو ئارەزووی خوای باڵادەستدا نەیئەهێشت و لەناوی ئەبردن. حوكمڕانی و سەروەری لەسەر زەویدا كەس نایكات جگە لە مرۆڤەكان، بەس مرۆڤەكان خۆیان، بەڵام بەپێی ئەو بەرنامە و سیستەمانەی كە باوەڕیان پێیەتی.

ئیسلامییە موحافیزكارەكان، ئەوانەی كە ڕەدی سەروەری ئوممەت ئەكەنەوە، بە بەڵگەی حاكمیەتی خوا، ئەوان سەروەری گەل بە دەستدرێژیی كردنە سەر مافی پەروەردگار لە حوكمڕانیدا دەزانن.

گووتارەكەیان ـ بەبێ ئاگایی بێ یان بە ئەنقەست ـ وەك ئەوە وایە بە خوێنەر بڵێن حوكمڕانی سیاسی تایبەتمەندی خوایە و هەر ئەو پێی هەڵدەستێت، بەڵام لە ڕێگای بریكار و جێنشینەكانی لە سەرزەوی، لەبەر ئەم هۆكارە بوو كە لای سوننەكان (خەلیفە، سێبەری خوایە لە سەرزەوی)، وە لای شیعەكانیش: (پێشەوای مەعصوم ئەزانێ ویستی خوا چی دەوێت)!

لەگەڵ ئەوەدا، كە پارێزكاران چاك ئەزانن وەك چۆن هەموو عاقڵمەندەكانیش ئەوە ئەزانن: كە (حوكمڕانی بەبێ فەرمانڕەوا) بەشەرگەلێك پێی هەڵدەسن كە بێ تاوان و (معصوم) نین و (نیگا)ی خوایی دەسەڵاتێكی ئاینییە و هەمیشە پێویستی بە مرۆڤ هەیە تا لە دنیا واقیعدا بەرجەستەیان بكات و لە بواری مرۆڤایەتیدا جێبەجێیان بكات.

بەو پێیەی بەشەرەكان هۆكارن و ئەكەونە نێوان ڕێبازی خوا و بەشەرەكانی تر تا وایان لێ بكەن ئەو فەرمانانە بە جوانی جێبەجێ بكەن، هەرگیز هیچ لەو بەهایانە و ڕێبازی نیگای جێگیر لە دنیای واقیعە پڕ لە

گۆڕانکارییەکان نایەتەدی مەگەر بەهۆی کاری مرۆڤەکانەوە بە هەموو هۆکارە مێژووییەکانەوە.

ئەو بیردۆزەی (حاکمیەت)ە، ترسناکییەکەی لەوەدایە ـ بەو شێوەیەی کە ـ موحافیزکارەکان ـ باسی لێوە ئەکەن ـ بەرهەمی نابێت جگە لە دروستبوونی چینێکی سیاسی ئایینی (سیوقراتی) کە بە ناوی (خوا)وە دەسەڵاتێکی رەها بەکارئەهێنێ! دەسەڵاتێك بەدەر لە هەر جۆرە رەخنەو لێپرسینەوەیەك! دەسەڵاتێکی بێ سنوور و بە ئارەزووی خۆی، چونکە بەناوی هیچ بیرۆکەیەکی شارستانی دنیاییەوە حوکم ناکات و دەسەڵاتەکەشی لە رێگەی گەلەوە دەست نەکەوتووە، بەڵکو حوکمڕانییەکەی لە حاکمیەتی خواوە دەستکەوتووە، ئەوانە خۆیان بە نوێنەری خوا و بە بریکاری ئەو ئەزانن کە ئیرادە و ویستی خوا جێبەجێ ئەکەن لە سەرزەویدا، بەجۆرێ کە هەرکەسێ نەیارییان بکات و بەرامبەریان بوەستێتەوە مانای نەیاریکردن و بەرامبەر خوا و ئیرادەی خوا وەستانەوەیە! بە مانایەکی تر: رەوایەتی دەسەڵاتە سیاسییەکانیان ـ لەم حاڵەتەدا ـ لە سەروەری و گەورەیی خوای پەروەردگارەوە هەڵدەقوڵێت نەك لە سەروەری و دەسەڵاتی گەلەوە، ئەو کاتە کتومت لەو دەسەڵاتە ئەچێت کە پیاوانی ئایینی (ئەکلیروس) لە ئەوروپای مەسیحییدا پێش ئەوەی چاکسازیی ئایینی و سەردەمی شۆڕشەکان بێتە ئاراوە پیادەیان ئەکرد.

وتەیەکی زیادەش هەیە، کە دەڵێ ئەوەی کە رووبەڕووی ئەهلی سوننە ئەبێتەوە لە رەخنە و هەڵوەشاندنەوە، هەمان شتیش راستە بە بیرۆکەی (ویلایەتی فەقیه)ی شیعەکانیش بگوترێت، چونکە (ویلایەت) لە بیرو دیدی

شیعەکانی ئیمامیدا ـ درێژکردنەوەی مێژووی ئیلاهییە بۆ بیردۆزەی (پێغەمبەراتی و ئیمامەت).

ئەمەشیان لە روانگەی ئەوەوە کە مەحاڵە خوای گەورە زەوی و ئەوانەی لە زەویدا دەژین وازلێبهێنێت بەبێ ئەوەی کەسانێك بکاتە جێنشینی خۆی کە پێشەوایانی بێ تاوان و بێ هەڵە و پەڵە بن، کە ئەوان ئەتوانن بە حەق درێژەپێدەر و رێکخەری بەرنامەی خوا بن لە سەرزەوی.

کەواتە پێویستەکا سەرزەوی پێشەوایانی مەعصومی تێدا بێت کە هەڵەی لێنەوەشێتەوە، تا زۆر بە ئەمانەت و بە وردییەوە ئیرادە و ویستی خوا لە سەرزەوی جێبەجێ بکات، یان بوونی (فەقیە)ێك جێگرایەتی ئەو ئیمامە مەعصومانە بکات لە کاتی نەبوونی ئەواندا.[1]

---

[1] الاصولية الاسلامية العربية المعاصرة بين النص الثابت والواقع المتغير، حسين سعد، ص٤٣٦.

## - ٨ -

ئەوانەی توێژینەوە ئەکەن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ گوتاری چاکسازی ئیسلامییەکان لە سەرەتای سەدەی رابردووەوە، واتە پێش سەردەمی دروستبوونی بیرۆکەی (الحاکمیە)و بیرۆکەی (ویلایەتی فەقیە).

دەبینین کە نووسینی زانایان و بیرمەندە ئیسلامییەکان زۆربەیان بەرەو ئەوە ئەڕۆن کە لە ئیسلامدا (ئوممەت سەرچاوەی دەسەڵاتە) و هەموو ئەو کەسانە وەك نووسەری میصری فەهمی هوەیدی ئەڵێت ئەو بیرەیان بەکارهێناوە کە کۆمەڵەی دامەزرێنەرانی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی دانی پێداناوە کە سەروەری داوە بە ئوممەت ـ گەل ـ.[1]

یەکێ لەو کەسانەی کە ئەمە رایانە، موفتی پێشتری وڵاتی میصرە و ناوی (ئیمام محمد بخیت المطیعي)یە و لە کتێبەکەیدا بە ناوی (حقیقة الاسلام واصول الحکم)دا بەرپەرچی کتێبەکەی شێخ عەلی عەبدوڕازقی بەناوبانگی داوەتەوە بەناوی (الاسلام واصول الحکم).

پێشەوا ـ بخیت ـ بەرەحمەت بێت ـ لەو کتێبەیدا ئەڵێت: "موسڵمانان یەکەمین گەلن کە وتوویانە (ئوممەت سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکانە) پێش ئەوە گەلانی تری جیهان بگەنە ئەو باوەڕە".[2]

هەر لەسەر ئەو رێڕەوە شێخی سەلەفی (محمد رەشید رەضا) لە تەفسیری (المنار)دا هەمان بۆچوونی هەیە،[3] هەروەها شێخ عەبدولوەهاب

---

[1] فهمی هوەیدی (القرآن والسلطان) ل١٤٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٢٤٤.

[3] تفسیر المنار ١٨٣/٥.

خەلاف لە کتێبی (السياسة الشرعية)دا و فەقیهی یاساناس (عەبدولقادر عۆدە) لە کتێبی (الاسلام وأوضاعنا السياسية)دا[1] و چەندان کەسی تریش کە هەمان دروشمی (سەروەری گەل)یان هەڵگرتبوو.

بەناوبانگترینی ئەو کەسانەی لەم بوارەدا نووسیویانە، گەورە مامۆستای یاسا لە جیهانی عەرەبیدا، دکتۆر (عبدالرزاق السنهوری)یە (رەحمەتی خوای لێ بێت)، کە یەکەمین کەس بوو لە میصردا بانگەشەی بۆ ئەوە کرد کە شەریعەتی ئیسلام بە سەرچاوەی سەرەکی هەموو یاساکان دادەنرێت.

ئەم مامۆستایە دەربارەی گرێبەستی پێشەوایی ـ عقد الامامة ـ دا وەك زانایانی شەریعەت دەیوت: "گرێبەستێکی راستەقینەیە، بەپێی دیدی قانون هەموو مەرجەکانی تێدایە و لەسەر رەزامەندیی بنیاتنراوە و مەبەست لێی ئەوەیە کە پێشەوا ـ سەرۆکی وڵات ـ لەوەوە رەوایەتی دەسەڵاتەکانی خۆی بەدی دەکات، کە رێکەوتنێکە لە نێوان پێشەوا و ئوممەت ـ گەل ـ دا".

پاشان لە شوێنێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات: "کە بیرمەندەکانی ئیسلام دەرکیان بە جەوهەری بیردۆزەکەی (جان جاك رۆسۆ) کردووە کە ئەویش ئەڵێت: "حاکم یان سەرۆکی وڵات هەموو دەسەڵاتەکانی لە گەلەوە وەرگرتووە و ئەو نوێنەری ئەوانە، ئەمەش لە رێگای گرێبەستێکی سەربەستانەوە لە نێوان هەردوولادا"، دەی فیقهزانانی ئیسلامیش پێناسەی (سەروەریی)ان بەو جۆرە کردووە کە جان جاك رۆسۆ دواتر پێناسەی کردووە".[2]

بەشێوەیەکی گشتی، ئەمە زۆر روونە تا ئاستێك کە بووەتە بەڵگەنەویست، هەروەك دکتۆری یاسایی ـ عەلی عەبدالحفیظ ـ ئەڵێ:

---

[1] الاسلام واوضاعنا السياسية، ل٩٧ـ ٩٨.

[2] النظريات السياسية الاسلامية، ضياء الدين الريس، ل٢١٣.

"پێویست ناکات ناکۆکی و جیاوازی هەبێت لەو مەسەلانەی کە لە ریزی بەڵگەنەویستەکاندان، مەسەلەی سەروەرییش پێویستە لە نێوان دوو بژاردەدا رایەکان جیاواز نەبن، کە هەردووکیان راستن و لەگەڵ رایەکەی تردا دژبەیەك نین، ئەوەی بەرامبەر وتەی ـ سەروەری خوای پەروەردگار ـ ە، سەروەری گەل نییە، بەڵکو بەرامبەرەکەی سەروەری خوایەکی تر لە خوا درۆینەکان و هیچ گەلێکیش هەق بە خۆی نادات ئەمە بڵێت". مەبەست لەم وتانە کاتێ باس لە سەروەری ئوممەت یان سەروەری کۆمەڵێك بەسەر خۆیاندا ئەکەین، هیچ شتێکی زیادەمان نەوتووە جگە لە جێگیرکردنی کۆمەڵێ بەڵگەنەویست نەبێت، دەربارەی فەرمانی خوای گەورە بۆ دروستکراوەکانی کە سەربەستی و هەڵبژاردنی داوەتە دەستیان و زەوی داوەتە دەستیان تا ژیانی خۆیانی تێدا بەسەر بەرن و لەناو خۆیاندا گرێبەست بکەن و هاوکاری یەکتری بکەن.

دەی ئایا کاتێ خەڵکی لەناو خۆیاندا بڕیاریاندا دەست بخەنە ناو دەستی یەکتر و پێکەوە گرێبەست بکەن و لە کاری خێری نێوانیاندا هاوکاری یەکتر بن و بەم ئیرادەیانەوە کە رەنگدانەوەی سەروەری خۆیان و هەڵبژاردەی خۆیان بێت، ئەمە لەگەڵ سەروەری پەروەردگاردا بەسەر گەردوونەوە دژەو پێچەوانەیە؟! کەواتە بەڵگەنەویستە کە بڵێین: مەبەستمان لە سەروەری گەل، پێدانی سەروەرییە بە کەسی دەستەجەمعی بایەخپێدراو بە رەچاوکردنی ئەوەی کە ئەو کەسێکی سەربەستە و دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەیە و بەرپرسیارێتیشی لەسەرە بەرامبەر ئەو بژاردانەی.

دەی ئەمەش کارپێدانێکی راستە و قسە هەڵناگرێت و ئا لەم رووەوەیە کە سەروەری بدرێتە دەستی ئوممەت).

- ١ -

## کێ سەروەری بۆ هەیە؟ ئوممەت .. یان.. تاك؟

دوای ئەوەی زانیمان کە (سەروەری سیاسی) سەروەرییەکی دنیایی ڕێژەیی زەمینییە، لە ژێر کاریگەری هۆکارەکان و بارودۆخی مێژووییدایە و سەروەرییەکی ڕەها نییە کە لە سەرووی مێژوو و سروشتەوە بێت، پاشان هەروەها تەنها بۆ مرۆڤەکانە و (سەروەری) ئا بەم مانایەی جێگای ئەوە نییە لەدژ بێت لەگەڵ حاکمیەتی پەروەردگاردا - جل جلالە - یان لەگەڵ سیستەمی هەیمەنەی شەریعەت.

چونکە ویستی خوا و هەیمەنەی شەریعەت دەرناکەوێت و بەرجەستە نابێت مەگەر لە ڕێگای مرۆڤەکانەوە نەبێت و لە ڕێگای کاری مرۆڤی کۆمەڵایەتی، کەواتە ناچێتە هیچ عەقڵ و هەستێکەوە کە سەروەرییەکە بۆ غەیری ئەم مرۆڤە کۆمەڵایەتییە، کە بە ویست و توانای ئەوەوە شەریعەت بەرجەستە ئەبێت و جێبەجێش ئەکرێت لە سەر ئەرزی واقیعدا. ئەگەر ئەمەمان زانی، ئەگەڕێینەوە سەر ئەو پرسیارەی کە پێشتر کردمان: کێیە ئەو کەسانەی کە لە ڕوانگە و دیدی ئیسلامییەوە سەروەریان بۆ هەیە، ئوممەت یان تاك؟ وەڵام - بەبێ دوودڵی - ئوممەت خاوەنی سەروەرییە لە دیدی ئیسلامیدا و کەس بۆی نییە ئەم سەروەرییە بۆ خۆی قۆرخ بکات، هیچ بەڵگەیەکیش نییە لە ئیسلامدا لەسەر ئەوەی کە سەروەری تایبەتە بە کەسێکی دیاریکراو یان بنەماڵەیەکی تایبەت، یان دەستەو تاقمێکی جیا، یان زمانو نەژادێکی تایبەت، بەڵکو بەپێچەوانەوە چەندان دەق و بەڵگە بەدی دەکەین لەسەر ئەوەی کە ئوممەت بە هەموویانەوە ئەسڵن و ئەوان سەرچاوەی دەسەڵاتن و سەرچەشمەی شەرعییەتی سیاسیین.

- ٢ -

## لە ئیسلامدا... خەڵکی ئازادن...

لەوانەیە یەکەمین دەروازەی شەرعی و قانونی بۆ سەلماندنی سەروەری گەل، یاسای (مافی سەرەتایی سەربەستی) و خەڵکی لە بنەڕەتە سروشتییەکەیدا بە ئازادی لەدایکبوون، بێگومان پێش ئەوەی هیچ سوڵتەیەکی مادی و مەعنەوی ئازادی لێ قۆرخ بکات، وەك چۆن عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی رازی بێ - وتوویەتی: "متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحرارا"، واتە: تاکەی خەڵکی ئەکەن بە کۆیلەی خۆتان لەکاتێکدا ئەوان بە ئازادی لەدایك بوون.

مرۆڤەکان لە بنچینەدا ئازادن، چ لە روانگەی لەدایکبوونیانەوە، یان لە بەخششی خواییەوە، بەڵام دەسەڵاتی زۆرداری لە ناکاوەو هاتۆتە ناویانەوە؟

کەواتە بەم پێیە، خەڵکی ئازادن لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی ئەو شتانەی قەناعەتیان پێیەتی و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان بە ئازادی خۆیان و کەس مافی ئەوەی نییە ئەم مافە مرۆڤانەیە لە کەس زەوت بکات، چونکە لە ئەسڵدا کەس لە کەس زیاتر نییە و کەس لە ژێر دەستی کەسدا نییە و خەڵکی سەرەتا ئازادن، دواتریش خۆیان دەستیان بەسەر خۆیاندا ئەڕوات لە لایەنی قەناعەت و بژاردەکانەوە بەپێی دادوەری خوایی.

چونکە ئەگەر دروست بوایە کەسێك ماف لە کەسێکی تر زەوت بکردایە، ئەوە شایانی خوای پەروەردگار ئەبوو، کاتێ فەرمانی دا بەسەر ئیبلیسدا بۆ گوێڕایەڵی، ئەو - نەفرەتییە - سەرکەشیی و یاخیبوونی هەڵبژارد، لەگەڵ ئەوەشدا یەکسەر سزای نەدا لەسەر ئەو بژاردەیەی، بەڵکو هەلی پێدا تا بیر

بکاتەوە و بگەڕێتەوە و دان بە هەڵەی خۆیدا بنێت و هەر بەخودی خۆی - پەروەردگار - ڕاستەوخۆ کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیدا و گوێشی گرت بۆ بەهانە، نابەجێیەکانی - شەیتان، دواتر ڕێگەی پێدا لە سەر زەویدا دەستەو تاقمی خۆی دروست بکات، ڕێگەشی لێ نەگرت لە هۆکارەکانی سەرگەردانکردنی نەوەکانی ئادەم لە دنیادا و هەوڵی زۆرکردنی ئەندامانی و هاوکاریکردنیان و خوا بە هەموو ئازادییەوە ڕێگەی پێدا کارەکانی بەڕێوەبەرێت و تا ڕۆژی دوایی بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی مانای پێدانی ئازادی و زۆرلێنەکردنە لە دید و ڕوانگەی ئیسلامەوە.[1]

سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەڵێ: "لەم بەسەرهاتەدا بەڵگەی ڕێزی خوای تێدایە بۆ مرۆڤ و ڕێزگرتنی ویستو بیرو هەستی، هەروەها پێدانی ئازادی تەواو لە هەڵبژاردنی ڕێگای هیدایەت و گومڕایی لە بیروباوەڕدا، هەروەها هەڵگرتنی باجی کردەوەکانی و لێپرسینەوەی و ئەمەش تایبەتمەندترین تایبەتییەکانی ئازادی مرۆڤایەتییە"[2].

ئازادی هەڵبژاردن لە مەبەستە بنەڕەتییەکانی شەریعەتەو بە ڕوونی لە ئایەتەکانی (اختیار)دا نموونەی زۆری لە قورئاندا هاتووە وەك ئایەتی: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾،[3] واتە: (هەق و ڕاستی لەلای پەروەردگارتانە و جا ئیتر کێ باوەڕ دێنێ خۆی ئازادە و کێش بێ باوەڕ ئەبێ هەر ئازادە.

---

[1] مصالح الانسان، مقاربة مقاصدية، عبدالنور بزا، ل٧٧.

[2] في ظلال القرآن، سيد قطب، ٢٩١/١.

[3] الكهف : ٢٩.

یان خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾،[1] واتە: ئەگەر خوا بیویستایە هەموو سەرزەوی موسڵمان ئەکرد، دەی ئیتر تۆ بۆ بەزۆر خەڵکی موسڵمان ئەکەیت. یان ئایەتی: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾،[2] واتە: لە ئاینداریدا زۆرکاری نییە، چونکە ڕێنوونی و هیدایەت لە سەرگەردانی و سەرلێشێواوی جیابوویەوە.

یان ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾،[3] واتە: ئەی خەڵکینە ئاگاداری خۆتان بن و خەمی خۆتان بێت، چونکە ئەوانە گومڕا بوون هیچ زیانیان بۆ ئێوە نییە، ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێنموونی بەردەوام بن، گەڕانەوەشتان بۆ لای خوایە و لەوێش ئاگادارتان ئەکاتەوە لە هەموو کردەوەکانتان.

یان ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَاْ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾،[4] واتە: واتە: هەرکەس ڕێگەی ڕێنمایی بگرێت ئەوە قازانجەکەی بۆ خۆیەتی و هەرکەسیش ڕێگەی گومڕایی بگرێت، خۆی زەرەر ئەکات.

---

[1] یونس: ٩٩.

[2] البقرة : ٢٥٦.

[3] المائدة : ١٠٥.

[4] یونس : ١٠٨.

یان ئەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾،[1] واتە: ئەگەر گوێڕایەڵت نەبوون و نەهاتنە سەر رێگات ئەوە تۆ تەنها گەیاندنت لەسەرەو بەس. یان ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ * لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾.[2]

ئایینی ئیسلام وا سەیری ئازادی ئەکات کە بنەڕەتێکەو لەناو قووڵایی باوەڕدا رەگی داکوتاوە، ئەمەش لە رێگەی (بنەمای یەکتاپەرستی) و ئەوەش بیرۆکەیەکی ناوەندی و قووڵە و هەموو بنەما و بیروباوەڕ و بەها و دیدە ئیسلامییەکانی بە دەوردا ئەسوڕێتەوە.

یەکتاپەرستی لە ناوکرۆکدا، ناوجەرگەی (ئازادبوونە)، ئازادبوون لە هەموو دەسەڵاتەکانی ئەم بوونەوەرە، ئیتر چ دەسەڵاتە دەرەکییەکان بێت وەك پەلامارەکانی دەسەڵاتداران و پیاوانی ئایینی و خوو و نەریتەکان، یان دەسەڵاتە ناوخۆییەکان وەك هەواو ئارەزووەکان و خەیاڵات و ئەفسانەکان.

لە دید و روانگەی ئیسلامەوە جۆرە ئازادییەکی وا دەست ئەکەوێت، کە بەجۆرێ لە هیچ فەلسەفە و دید و رێبازێکی تردا ـ بەو جۆرە گەورەیە ـ بەدی ناکرێت، چونکە لە قوڵایی باوەڕی موسڵمانەوە هەڵدەقوڵێت، شایەتوومان، کە باوەڕی موسڵمانی لەسەر دائەمەزرێت، لە دوو پایەی سەرەکی پێکدێت: یەکەم: نکووڵی کردن ـ نفی ـ لە وشەی (لا اله)دا هیچ پەرستراوێك نییە کە ئەوەش ئەوپەڕی رزگاربوون و کۆت بچڕانە. دووەم: دان پێدانان لە وشەی (الا الله)دا کە ئەوەش ناوکرۆکی یەکتاپەرستییە و نکووڵی پێش چەسپاندن هاتووە، بەو پێیەش هەرگیز بە تەواوی یەکتاپەرستی نایەتەدی تا مرۆڤ بە تەواوی لە ملهوڕەکانی ئەم بوونەوەرە رزگاری نەبێت،

---

[1] النحل : ٨٢.

[2] الغاشية: ٢١ ـ ٢٢.

قووڵترین ماناکانی ئازادی ـ کە مەبەستمان لە باسی سەروەریدا ـ ئازادی بیروڕایە، بە جۆرێ کە کۆمەڵگە ئازادە لە هەڵبژاردنی بیروڕا و بۆچوون و بیروباوەڕێك کە خۆی بەڕاستی بزانێت، یان لە هەڵبژاردنی بنەما و سەرچاوەیەك کە یاسای وڵاتەکەی لەسەر بنیات بنرێت و نابێ زۆری لێ بکرێت کە ناچار بکرێت بۆ شتگەلێك کە خۆی پێی باش نەبێت.

بەڵێ، ئەگەرهاتوو، کۆمەڵگەی ئیسلامی، ئیسلامی وەك سەرچاوەی باڵای وڵات هەڵبژارد لەسەر بنەمای ویستی سەربەستانەی خۆی و ئیسلام چ وەك بیروباوەڕ و چ وەك شەریعەت، شەریعەتیش بریتییە لە کۆمەڵە بنەما و سیستەم و بەهایەك کە قانون و یاسای لەسەر بنیات ئەنرێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە سەرجەم کۆمەڵگە ـ بە ئارەزووی خۆیان ـ بە ناڕاستەوخۆ پەیمانی دەستگرتن و پابەندبوونیان داوە بە ئەو سەرچاوە باڵایەوە بە هەموو یاسا و ئەحکامەکانییەوە و بە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی تەواوی ئەوەوە کە یەکێکیان هەستێ بە ئەنجامدانی کارێك کە پێچەوانەی یاساکە بێت، چونکە هەرکەسێ پابەندبوونی دەربڕی بۆ یاسایەك ئیتر لەسەریەتی جێبەجێی بکات و لێی لا نەدات و گرێبەستیش یاسای گرێبەستانە و ئەگەر وانەبێت هیچ مانایەك نامێنێت بۆ دەزگای دەوڵەت و کۆمەڵگە و گرێبەست و پابەندبوون و یاسا و قانونە گشتییەکان، بەڵکو کارەکە لە ئاستی پابەندبووندا ناوەستێت، بەڵکو تا ئاستی یاسادانان، هەموو یاسا و قانونێك کە پێچەوانە بێت لەگەڵ سەرچاوەی باڵای دەوڵەت کە گەل بە ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردووە ، ئەوە بەتاڵە و هیچ کاری پێ ناکرێت.

بەڵام پێویستە هەڵبژاردنی سەرچاوەی باڵای وڵات (مرجعية) لە چوارچێوەی ویستێکی ئازادانەی کۆمەڵگەدا بێت، نەك لە چوارچێوەی

ستەمکاری و زۆرداری و چەوساندنەوە و قۆرخکردنی بڕیار دور لە ویستی ئوممەت ـ گەل ـ.

چونکە ملکەچبوونی رەفتاری مرۆڤەکان بۆ یاسا کۆمەڵایەتییەکان، ئەوە ملکەچییەکە لە پابەندبوونی تاك بەو یاسایانەوە دروست دەبێت.

سروشتی مەبەستەکانی ئەو یاسایانەی کە کاریگەری لەسەر کردەی مرۆڤەکان هەیە، ئەوەمان بۆ دووپات ئەکاتەوە کە گرنگە مەبەستە کۆمەڵایەتییەکان ـ کە مەبەست لێی پابەندبوونە رەوشتییەکانە ـ و مەبەستە یاساییەکان و بەبێ جووتبوونی نێوان ئەم دوانە، یاسا تەنها مرەکەبی سەر کاغەز دەبێت و بەبێ ئەو دوانەش حکومەت رۆڵی جەللادێك ئەبینێ بەسەر گەلەکەیەوە و تەنها پشت بە هێز ئەبەستێت، بۆ ئەوەی یاساکانی لە لایەن خەڵکەوە پێشێل نەکرێت، بەڵام دەستەوسانە لەوەی ورە بەرزییان تیادا دروست بکات و بەکارهێنانی توانا داهێنەرەکانیان لەپێناو هێنانەدی ئامانجە کۆمەڵایەتییە باڵاکان".

مەبەست ئەوەیە کە رووتکردنەوەی مرۆڤ لە ئازادی هەڵبژاردن، بەتەوای دژە لەگەڵ مەبەستی گەیاندنی ئاشکرا و هیچ گەیاندنی ئاشکرا نایەتەدی ئەگەر قەدەغە بکرێت لە مرۆڤ و شتانێکی بەزۆر بەسەردا بسەپێت کە خۆی نایەوێت و حەزی پێی نییە لە بیروباوەڕ و بۆچوون و دیدگا و یاسا و پرۆگرام و سیستەم و هتد...

هەروەك پێشەوا دەهلەوی ئەڵێ: "مەرجی لێپرسینەوەی کردار ئەوەیە مرۆڤەکە بە ئارەزووی خۆی ئەنجامی دابێت".[1]

---

[1] محبة الله البالغة، ولي الله الدهلوي، ١/٢٤.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، خوا نەیناردووە تا بە شەق و بەزۆر خۆی بسەپێنێ بەسەر گەلەکەیدا، یان بۆ دەستخستنی دەسەلاَت نەهات، هیچ زۆرێکی لە کەس نەکرد بۆ قبولکردنی پەیامەکەی، بەڵکو بە مژدەدەر و ترسێنەر نێرراوەتە ناویان، هاتووە تا گەیاندنی پەیام بە ئاشکرا ئەنجام بدات. وەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظاً إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ﴾،[1] واتە: تۆمان نەناردووە تا ببیتە پارێزەریان، بەڵکو تۆ لەسەرتە بە ئاشکرا پەیامی خوا بدەیت بە گوێیاندا.

یان فەرموویەتی: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾،[2] واتە: ئایا تۆ بەزۆر ئەتەوێت ئەو خەڵکە بکەیتە باوەڕدار.

یان ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ * لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾،[3] واتە: تۆ خوایان یاد بخەرەوە، چونکە کاری تۆ یادخستنەوەیە و هیچ دەستکێت بەسەر دڵیاندا ناڕوات.

کەواتە ئایاتگەلێکی زۆر هەن کە باس لە کار و وەزیفەی پێغەمبەران ئەکات کە سەرەکییترینیان مژدەدان و ترساندنە، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾[4]، واتە: ئێمە پێغەمبەرانمان تەنیا بۆ مژدەدان و ترساندن ناردووە.

ئەو جەنگانەش ـ کە دواتر ـ لە نێوان پێغەمبەری خوا و هۆزەکەیدا روویدا، هۆکارەکەی ئەوەبوو کە دژایەتییان بەرامبەر نواند و بە دوژمنکارانە

---

[1] الشورى : ٤٨.

[2] يونس : ٩٩.

[3] الغاشية: ٢١ ـ ٢٢.

[4] الأنعام : ٤٨.

و ستەمکارانە لە شاربەدەریان کرد، دواتریش هەر بە دوای بانگەوازەکەیەوە بوون بە دژایەتی کردنی تا سەر ئێسقان و تۆقاندن، هیچ چارێك لەبەردەمیدا نەمابوویەوە جگە لە جەنگان لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی خوای گەورە نێوان ئەو و هۆزەکەی بکاتەوە و واز لە دژایەتی بێنن بەرامبەری.

ئایەتی روخسەت دان بە جەنگ بە ئاشکرا ئەم هۆیە دەرئەبڕێت کەمەبەستی سەرەکی جەنگکردنی تێدایە وەك خوای ـ عزوجل ـ ئەفەرموێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾،[1] واتە: روخسەت درا بە باوەڕداران تا بجەنگن، چونکە ستەمیان لێ کراوە و خوایش بۆ سەرخستنیان زۆر بەتوانایە.

دواتر بە درێژی گفتوگۆ ئەکەین لەسەر ئایاتی جیهاد و پەیوەندییان بە بنەمای ئازادییەوە کە ئایەتەکانی هەڵبژاردن دووپاتیان کردوەوتەوە.

ئەوەی ئەمانەوێت لەم روونکردنەوە کورتەدا پێی بگەین، ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییەی نێوان سەربەستی و سەروەری، پەیوەندییەکی ئەندامی و هۆکارییە لەهەمانکاتدا، (سەرورەی گەل) ئەنجامی هەمیشەیی (سەربەستیی)ەکەیەتی، (سەربەستی گەل)یش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری (سەروەریی)ەکەیەتی. بەجۆرێ کە ناکرێ باس لە نەتەوەیەك بکرێت سەربەست و ئازاد بێت، کەچی سەروەری خۆی بەدەست خۆی نەبێت.

گەلان کاتێ سرودی ئازادی ئەڵێنەوە، ئەوە بۆ ئەوەیە تا سەروەری بەدەست بێنێتەوە و ببێتەوە خاوەنی خۆی، ئەو سەروەرییە کە دەسەڵاتە خۆسەپێنەکان لێیان زەوت کردووە، ئیتر ئەو ستەمکارە ستەمی سیاسی بێت یان ستەمی ئاینی.

---

[1] الحج : ٣٩.

بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، گەل حەزیان کردووە (ڕزگاربوون) لە وڵاتەکەی خۆیدا بەدەست بێنێت، تا بتوانێت حەز و ویست و قەناعەتەکانی خۆی بێنێتەدی و بەرجەستەی بکات، دوور لە هەموو زۆرکاری و چەوساندنەوە و ئاغایەتی هیچ کەسێك.

بەردەوام ئەم حەز و خولیایە پێش‌و دوا ئەکات لە نێوان کۆتکردن و لەدەستداندا، ئەمە ئەگەر بارو زروفێکی دەرەکی زۆرداری بێتە پێش، وە دەستکەوتنی ئازادی کاتێك کە بارو زروفێکی باشی بۆ بڕەخسێت، لەدەستدان و دەستکەوتنی سەربەستیش بەستراوە بە هەوڵ و تێکۆشان و خەبات و قوربانیدانی گەلانەوە، تا وای لێهاتووە جیهادی گەلان بۆ بەدەستهێنانی سەربەستی بوەتە جیهاد و تێکۆشان لەپێناو بەدەستهێنانی ژیاندا. کەواتە ڕاست نییە قسە لەبارەی (سەربەستی گەلەوە) بکەین، لەکاتێکدا خاوەنی سەروەری خۆی نەبێت.

-٣-

دەروازەی دووەم لە روونکردنەوەی (سەروەری گەل)دا، (ئەرکە خواییەکان)، ئوممەت جێبەجێکاری ئەرکە شەرعییەکانە، هەموو فەرمانەکان لە ئەسڵدا روو لە ئەو دەکەن، نەك روو بکاتە کەسێکی دیاریکراو، یان لایەنێکی دیاریکراو، یان بنەماڵەیەکی دیاریکراو، بەڵکو ئوممەتی موسڵمان بە گشتی بەرپرسیارە و ئەرکی پاراستنی شەریعەت و جێبەجێکردنەکەی لە ئەستۆی هەموو ئوممەتدایە، ئەو ئەرکی قورسی هەڵگرتنی دواین پەیامی خوای لەسەرە، هەروەها هەستان بە کاری شاهێدی دوای پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم).

ئەگەر لە گووتارە ئەرکییەکانی قورئانی پیرۆز وردبینەوە دەبینین زۆربەی زۆری رووی لە کۆمەڵ یان ئوممەتی موسڵمان ئەکات وەك:

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، یان ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ و ﴿إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾، یان ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾، و (ولتكن منكم) و (وأولي الأمر منكم) ئەمەو چەندان ئایەتی تر... کەواتە کۆمەڵی موسڵمانان جێنشینی ئەسڵین لە دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئەو دەستی بەسەر کاری خۆیدا ئەڕوات و ئەو ـ بە هەموویانەوە ـ زیاتر بێ هەڵە و پەڵەیی کەمتری لێ ئەوەشێتەوە لە حوکمی تاکەکەسی.

ئەمەش مانای ئەوەیە بڕیاردانی سیاسی و ئەنجامدانی کاری سیاسی، مافێکی گشتییە و هی ئوممەتە و بەرپرسیارێتییەکی هاوبەشە لە نێوان موسڵماناندا و ئا لێرەدا بنەمای سەروەری دەردەکەوێت.

خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً﴾،[1] واتە: ئێوەمان کردووە بە ئوممەتێکی مامناوەند تا ببنە شاهید بەسەر خەڵکییەوە و پێغەمبەریش ببێتە شاهید بەسەر ئێوەوە، دەی کەی گونجاوە ئوممەتی موسڵمان بە گشتیانەوە راسپێراوە بە ئەرکێکی گەورەیی خوایی کە شاهیدییە بەسەر هەموو شارستانییەکان لە دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەچی دەستی بەسەر کاری خۆشیا نەڕوات و هیچی بەدەست نەبێت.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾،[2] واتە: ئەی ئوممەتی ئیسلام با لەناوتاندا هەمیشە دەستەیەك هەبن خەمی خەڵکی هەڵگرن و خەڵکی بانگ بکەن بۆ لای چاکەو فەرمان بە چاکەش بکەن و بەرگریش لە خراپە بکەن و ئەوانەی وا ئەکەن لە زومرەی رزگاربووانن.

دەی خۆ ناکرێت ئوممەتێك ئەرکی قورسی چاکترینی جیهانی پێ سپێررا بێت و ئەبێ برەو بە چاکە بدات و بەر لە لێشاوی خراپە بگرێت، کەچی لە هەمانکاتدا هیچی بەدەست نەبێت و خۆی خاوەنی کاروباری خۆی نەبێت؟!

گەلێك سەروەری و کاری خۆی بەدەست خۆی نەبێت، نابێتو دروست نییە لەم جۆرە ئەرکە گەورە و قورسانە بخرێتە سەرشانی، بەڵکو گەلێك سەروەری خۆی نەبێت هەرگیز بۆی نییە بە چاکترینی ئەو گەلانە دابنرێت کە دەستیان بەسەر خۆیاندا ئەڕوات و خاوەنی سەروەرین.

---

[1] البقرة : ١٤٣

[2] آل عمران: ١٠٤.

بۆیه زیادەڕەوی نییه ئەگەر بڵێین: سەروەری گەل مەرجه بۆ دروستی ئەرك خستنه سەرشانی، ئەوەتا (بەنده و ناتوانا و زۆرلێکراو) زۆری له ئەرکه شەرعییەکانیشیان لەسەر لائەبرێت.

کەواته هەر گەلێکیش مافی سەروەری لێ زەوت کرابێت و چەوساندنەوه و تۆقاندن و سەرکوتکردنی بەسەرەوه بێت ناتوانێت به ئەرکه شەرعییه گەورەکان هەستێت، که بەهۆی ئەوانەوه چاکترینی گەلان و بوون به شاهیدی دەست ئەکەوێت، بەڵکو ناشتوانێ هەستێت به ئەرکی بنەماکانی لێپرسینەوه و لێپێچینەوەی بەرپرسه باڵاکانی، چونکه ئەوه له روانگەی سەروەرییەوه دەکرێت، ئەگەر ئوممەت خاوەنی ئەم سەروەرییه نەبوو، ناتوانێ هەستێت بەکاری چاودێری حکومەت، چونکه چاودێری حکومڕانەکان بەشێکه له دەسەڵاتی گەلو بەڵگەی بوونی سەروەری و دەسەڵاتیەتی بەسەر خۆی و زەوی و سامانی وڵاتەکەیدا.

ئەم کارەش زۆر به روونی و ئاشکرا درکی پێکراوه لەلایەن بەرەی یەکەمی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، له وتارەکانی خەلیفەکانی راشیدیندا زۆر به جوانی ئەم راستییه بەدی دەکرێت کاتێ سەرەتا بوون به جێنشین.

ئەوه خەلیفەی یەکەمه (ئەبوبەکری صدیق) ـ خوا لێ رازی بێت ـ له یەکەمین وتاری سەرۆك کۆماریدا فەرموویەتی: "أيها الناس، اني قد وليتُ عليكم، ولستُ بخيركم، فإن أحسنتُ فأعينوني، وإن أسأت فَقوموني"، "أطيعوني فيما أطعتُ الله فيكم، فإن عصيتُ فلا طاعةَ لي عليكُم".[1] واته: "ئەی خەڵکینه، وا من کراوم به گەورەتان، خۆ چاکترین کەستان نیم، ئەگەر

[1] رواه ابن اسحاق و (ابن هشام) وقال ابن كثير في البداية والنهاية، ٣٠٦/٦، وهذا اسناد صحيح.

ئیشی باشم کرد هاوکارم بن، وه ئەگەر خراپیشم کرد راستمکەنەوه"، پاشان فەرمووی: "بەگوێم بکەن تا بە گوێی خوا ئەکەم، ئەگەر سەرپێچی خوام کرد ئێوەش بۆتان نییە گوێڕایەڵیم بکەن".

وردبەرەوه لە دەستەواژەی (وُلیت علیکم) واتە ئێوه منتان کردووه بە برا گەورەی خۆتان، وه من خۆم نەسەپاندووه بەسەرتاندا، وه خۆم نەکردۆتەوه سەرگەورەتان، ئەوەش داکۆکیکردنە لەسەر بنەمای سەروەری گەل.

یان وتەکەی: " فإن أحسنتُ فأعینوني، وإن أسأت فَقوموني"، واتە: ئەگەر باشم کرد هاوکارییم بکەن و ئەگەر خراپم کرد، دەستم بگرن و راستم بکەنەوه، ئەمەش ئەوپەڕی داکۆکیکردنە لەسەر پێدانی مافی راستکردنەوه و چاودێریکردنی حکومەت لەلایەن میللەتەوه، ئەو هاوکاری ئەبێت لە پرۆژە و کاری چاکەدا و رەخنەی لێ ئەگرێت و چاودێری ئەکات و رێی راستی نیشان ئەدات و هەرکاتێ سەرگەردان و خواربوویەوه، ئەمەش بەشێکە لە مافی سەروەری گەل و دەست رۆیشتنی میللەت.

یان وتەکەی کە فەرموویەتی: "گوێڕایەڵییم بکەن مادەم من گوێڕایەڵی خوا بکەم و ئەگەر سەرپێچییم کرد ئێوەش بە گوێم مەکەن"، ئەمەش خاڵێکی ترە لە خاڵەکانی پێداگریی روون و راستەوخۆیە لەسەر بیرۆکەی (دەوڵەتی قانون) کە لە ئیسلامدا فەرمانڕەوا دەسەڵاتی رەهای نییە، بەڵکو پابەندە بە دەستوری وڵاتەوه و سەرچاوەی باڵای دەسەڵات کە کۆمەڵگەی موسڵمانە لە (ئیسلام و شەریعەتەکەیدا) خۆی ئەبینێتەوه.

هەروەها سەرجەم فەرمانەكانی دەوڵەت پێویستە لە ڕەوایەتی سیاسییەوە بێت بە جۆرێك پێچەوانەی سەرچاوە یاساییەكە نەبێت كە لە ئیرادە و ویستی گەلدا خۆی ئەبینێتەوە.[1]

بەڕاستی سەردەمی چوار خەلیفەكانی راشیدین حكومەت لەسەر بناغەی ئەوە پێكهاتبوو كە هەموو كارە سیاسییەكە بە هەموو ئاستەكانیەوە لە ڕەوایەتی (ویست و ئیرادەی گەل)ەوە وەرگرتبوو، نەك لە ئیرادەی سەرۆكێكی تاكڕەوی خۆسەپێن.

تەنانەت رۆژێك عومەری كوڕی ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ لەناو هاوەڵانیدا فەرمووی: "لن يعجزَ الناسُ أن يولوا رجلاً منهم، فان استقام فاتبعوه، وان جنف قتلوه، فقال طلحة: وما عليك لو قلت فان تعوج عزلوه؟ قال: لا، القتل انكى لمن بعده!".[2] واتە: عومەر فەرمووی: چی وائەكات لە موسڵمانان ـ خەڵكی ـ كە پیاوێك هەڵبژێرن و بیكەنە سەرۆكی خۆیان، ئەگەر راست بوو هاوكاری بكەن و ئەگەر لایدا و ستەمی كرد بیكوژن، تەڵحە وتی: جوانتر نییە بڵێی: ئەگەر لایدا، لایبەرن؟ عومەر فەرمووی: نا، نەخێر، كوشتنی باشە چونكە سەرۆكەكانی دوای ئەو دەرس وەرئەگرن".

لەسەر ئەم بناغەیە و لە روانگەی بیروباوەڕەوەیە كە باوەڕی وایە ئوممەت بە گشتی جێنشینی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) دوای مردنی، لە مەسەلەی جێبەجێكردنی شەریعەت و پاراستنیدا، نەك ئیمامی مەعصووم یان خەلیفە یان مەلیك یان ئەمیر یان حاكم.

---

[1] تحرير الانسان وتجريد الطغيان، ل٢٩٥، حاكم المطيري.

[2] الگبرى، ٥٧٢/٢.

بەڵێ، وەك شتێكی مێژوویی حاكمی سیاسی وڵاتی ئیسلام ناوی لێ نرابوو (خەلیفە)ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام ئەمە وەك ئەرك‌و كارەكانی، بەڵام وەك پسپۆڕیی و تایبەتمەندیی، ئوممەت بە هەموویانەوە تایبەتمەندن بە كاری جێنشینایەتی پێغەمبەرەوە، كەسیش لەم بوارەدا تایبەتمەندیی نییە و پێی نەدراوە.

ئوممەتیش لە ڕێگای شوورا و راوێژ و ڕەزامەندییەوە كەسێك هەڵدەبژێرێ كە لەباتی هەر هەموویان كاری (خەلافە)تەكە بەڕێوەبەرێت، ئەمەش وەك بریكار و نوێنەریی، نەك وەك ئەسڵی و خاوەن ماڵی.

لە فیقهی سیاسی سوڵتانی كۆندا زاراوەی (خلافە) و (ئیمامە) پەیوەندكراوە بە سەركردایەتی سیاسی كۆمەڵی موسڵمانان، ئیتر جیاوازیی نییە تاكێك ئەو كارە ئەنجام بدات یان مەزهەب و تایفەیەك، ئەمەش وایكردووە كە فیقهی سوڵتانیی فراوانییەك بەخۆیەوە ببینێت لە دیاریكردنی ماف‌و ئەركەكانی ئەو حاكمەدا و دانانی مەرجەكانی ئیمامەتكردن و سیفاتەكانی و شتانی تریش..

ئەم درێژەپێدانە لەوانەیە هۆكاری خۆی بووبێت، چونكە هەموو ئەو حوكمە شەرعییانەی پەیوەندییان هەیە بە سەركردایەتی سیاسییەوە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە، لەم لایەنەوە گرفتێكی تێدا نییە.

بەڵام ئەم ڕۆچوونە سەبارەت بە پلەو پایەی خیلافەت و پەیوەندییەكانی بە سەركردەیەكی تاكەوە، كە دامەزراوە لەسەر پاشخانەیەكی هەڵێنجراو لە فام و تێگەیشتنی فیقهی سوڵتانی، كە بریتییە لە ناوەندی بڕیاری دەسەڵات كۆدەكاتەوە تەنها لە فەرمانڕەوادا.

لەم فیقهەدا حاکمی تاك هەموو شتەکان لە دەستی ئەودا ئەبن، هەر ئەو فەرمان دەرئەکات، دەرکردنی مەرسوومی یاسادانان و هەرئەویش تاکە لایەنی جێبەجێکارە، دەسەڵاتی دادوەری باڵایش بەدەست ئەوە! ئێ پاشان ئەو سەرۆکە سێبەری خوایە لە سەر زەویدا!، بە چاکبوونی ئەو، چاکبوونی کاری دین و دنیایە! ئوممەتیش تەنها شوێنکەوتەیەکی ئەم سەرکردە تاقانەیە، ئەگەر ئەو چاك بوو، هەموو ئوممەت چاك ئەبن و ئەگەر گەندەڵیش بوو، هەموو ئوممەت گەندەڵ ئەبن.

ئا لەم روانگەیەوە ـ بە داخەوە ـ لە کەلتووری ئیسلامیدا ئوممەت بە ـ عامە ـ واتە خەڵکی رەش‌و رووت و گێل و بێ مێشك و هتد... وەسفکراوە.

لە بەرامبەردا سەرکردایەتی سیاسی و ئەوانەشی بەچواردەوریدان بە زانایان و ناوداران و تایبەتمەندان و کەم وێنە و هەڵبژاردە و پوختە ناوزەدکراون.

"پەیوەستکردنی خیلافەت بە ئوممەتەوە لەباتی پەیوەستی بە سەرکردایەتی سیاسییەوە، مەسەلەیەکی زاراوەیی وشەیی نییە، بەڵکو مەسەلەی دیاریکردنی چەمکی تێگەیشتنییە.

ئەمەش کاریگەری گرنگی خۆی هەیە لەسەر دیدی سروشتی دەسەڵاتی سیاسی و سنوورەکانی، پاشتر لەسەر پێشخستنی سیستەمی سیاسی ئیسلامی لە پرۆگرامێکی رێکخراوی ریزبەندا.

چونکە دانانی سەرۆکی وڵات بەوەی کە جێگری پێغەمبەری خوایە بەو شێوەیەی فیقهی سوڵتانی باسی کردووە، دەربارەی "پارێزەری ئایین و سیاسەتی دنیا"، سەر بۆ ئەوە ئەکێشێ کە کارو ئەرکی گەورەتر لە ئاستی خۆیان بدەین بە سەرۆکەکان و دەستیان زۆر کراوەتر بکات، چونکە مانای

وشەی (خەلیفە)، ئەم مانایە ئەگەیەنێت کە درێژەپێدانی کاری پێغەمبەر و بەرنامەکانیەتی و ئەمەش شتێکی زۆر ترسناکە.

کەواتە، هەموو ئەو ئەرکە شەرعییە زۆرانەی ئاراستەی ئوممەتی موسڵمان کراوە بە گشتی و جێگرایەتی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هەستان بە ئەرکی شاهێدی و فەرمان بە چاکە و بەرگریی لە خراپە و بەرپاکردنی نموونەیەکی بەرز و بڵندی ئینسانی، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر سەروەریی و سەرکردایەتی کردنی گەل چونکە شاهیدی دان و چاکترینی چ مانایەکی نییە بەبێ سەروەری و سەرکردەیی.

- ٤ -

## گرێبەستی بەیەعەتدان

دەروازەی سێیەم، کە لە ڕێگایەوە ئەتوانین سەروەری بۆ ئوممەت دووپات بکەینەوە، ئەویش (گرێبەستی بەیعەتپێدان)ە.

پەیوەندی نێوان ئوممەت و سەرۆکی وڵات، پەیوەندییەکە لەسەر بناغەی گرێبەستێکی نێوان هەردوولایە، ئوممەت ئەسڵی مەسەلەکەیە و ئیمامیش بریکارە و لەباتی ئوممەت کارەکان رادەپەڕێنێت.. چونکە دەسەڵات و حوکمڕانیکردنی لەبری خوای گەورە کارکردن نییە و پاشان مافێکی میراتی و پشتاوپشتیش نییە، بەڵکو بەیعەتدانێکە لە نێوان ئوممەت و ئیمامدا.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئیسلام لە بنەما سیاسییەکانیدا، زۆر پێش ئەوروپا کەوتووە لە دیاریکردنی بناغەیەکی فەلسەفەی کە بەپێی ئەو فەلسەفەیە دەسەڵات کارو چالاکییەکانی ئەنجام ئەدات، کە ئەویش بەپێی بیردۆزی (گرێبەستی کۆمەڵایەتی)یەوە دێتە دی، وەك چۆن هۆبز و لۆك و رۆسۆ باسیان لێوەکردووە، کە بەوپێیە ئەندامانی کۆمەڵگە لە مافی خۆیان دەست هەڵدەگرن و لە هەندێ سەربەستی خۆیان دەگرنەوە لەپێناو دەسەڵاتدا، ئەمەش لە بەرامبەر ڕێكو پێککردنی کاروباری ژیانیان و بەڕێوەبردنی وڵات بەشێوازێك کە بەرژەوەندیی هەموانی تێدا پارێزراو بێت". [1]

بەڵام ئەوەی تێدایە - وەك چۆن - زانای یاساناس - عبدوڕەزاق سەنهوری - دەڵێت: گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە سەر بناغەیەکی فەلسەفی تیۆری رووت

---

[1] تحرير الانيان، حاكم المطيري، ل٣٠٠.

دامەزراوە، ئەوەش گریمانەی سەربەستی کۆمەڵگەکانی پێوە بەندە پێش ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست.

بەپێچەوانەی گرێبەستی بەیعەت، لەسەر بنەمایەکی تیۆری و کرداری دامەزراوە، "کە لەسەر ئەو بناغەیە دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرا لە مەدینەی مونەوەرە، کاتێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی کرد بۆی تا دەسەڵات بگرێتەدەست بەپێی ئەم گرێبەستە و لەسەر ئەو رێککەوتنەی کە بەرەزامەندیی شاری مەدینە ئەنجام درا، بەجۆرێ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ببێت بە سەرۆکی شاری مەدینە و هەموو خەڵکەکەشی لە خۆشی و ناخۆشیدا گوێڕایەڵ و ملکەچ بن بۆی.

گرێبەستی کۆمەڵایەتی، لە دەوڵەتی ئیسلامیدا راستییەکی مێژوویی بووە و بەرەزامەندیی هەردوولا هاتۆتە دی، ئەوەبوو دانیشتوانی مەدینە لە یەکەم دیداریاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککە وتیان: "ئێمە گەلێکین، هیچ گەلێك ئەوەندەی ئەم گەلەی ئێمە رقو کینەو دوژمنایەتی تێدا نییە، بەڵکو خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ بیانکات بەیەك، ئێمە ئەڕۆینەوە ناویان و بانگیان ئەکەین بۆ ئەم رێبازەی تۆ، ئەوەی ئێمە پێی رازی بووین لەم ئاینە، ئەیخەینە بەردەستی ئەوانیش، ئەگەر خوای گەورە لەسەردەستی تۆدا کۆیان کاتەوە، ئەوا کەس لە تۆ بەڕێزتر و پیاوتر نییە". وردبەرەوە مەرجی رەزامەندیی گەلەکەیان و وەڵامدانەوەیان بۆ پەیامی ئیسلام دانا.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو بەیعەتی جیاوازی لە مەدینەییەکان وەرگرت: یەکەم بەیعەتیان ئەوەبوو کە مەرجی لێوەرگرتن باوەڕ بە خوا بێنن و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن و گوێڕایەڵی بن. بەڵام لە بەیعەتی دووەمدا

لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و بەرگریکردنی هاوبەش لەو دەوڵەتە دامەزرا و جۆرێك بوو لە بەیعەتی جەنگ و لەسەر ئەو بناغەیەی کە گرێبەستی بەیعەت هێنانی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە راگەیەنرا.

پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە رێگەی کودەتای سەربازی، یان شۆڕشی گەلەوە نەچووە سەر کورسی حوکمڕانی، بەڵکو بە گرێبەست و رەزامەندیی، قورئانی پیرۆزیش ئەو راستییە ئەخاتە روو، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾،[1] واتە: "سوێند بەخوای تۆ، باوەڕیان نەهێناوە هەتا بۆ چارەسەری کێشە و ناکۆکییەکانیان نەگەڕێنەوە بۆ لای تۆ".

قورئانی پیرۆز ئەوەی سەلماندووە کە موسڵمانانی شاری مەدینە، پێغەمبەر ئەکەن بە فەرمانڕەوای خۆیان بە حوکمی گەڕانەوەیان بۆ لای ئەو بۆ چارەسەرکردن و حوکمی باوەڕهێنانەکەشیان پێی، وە ئەمەش پێویستی شایەتییدانەکەیانە بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و ئەوان بۆیان نییە پشتی لێ هەڵکەن و حوکم بە شتی تر بکەن، وەك چۆن خەڵکی مەککە پشتیان لێ هەڵکرد ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾،[2] واتە: تۆ دەستت ناڕوات بەسەریاندا. بەڵام ئەم پشت هەڵکردنە لە بازنەی باوەڕ ئەیانباتە ناو بازنەی هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا، وە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند جارێك بەیعەتی لە هاوەڵانی وەرگرتووە، ـ وەك ئەوەی لە

[1] النساء : ٦٥

[2] الغاشية : ٢٢

حودەیبییە روویدا ـ بۆ ئەوەی ئەم بنەمایە بچەسپێنێت کە ئەویش بنەمای گوێڕایەڵی و ملکەچییە کە لەسەر ئەم گرێبەستی بەیعەتە دێتە ئاراوە".[1]

دوای ئەویش هاوەڵان هەر لەسەر رێڕەوی رۆیشتن "بەجۆرێ بەیعەتیان دا بە ئەبوبەکری صدیق و پاشتریش بە عومەری کوڕی خەتتاب و دوای ئەو عوسمان و دوای ئەویش عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ بەبێ هیچ زۆرلێکردن و ناچارکردنێك، ئەمەش شتێکی مێژوویی روونە و لە مێژووی ئیسلامدا روویداوە و مەگەر خۆبەزلزانێك ملەجەڕێی تیا بکات، هیچ یەکێك لەو چوار خەلیفەیە لە رێگەی شمشێر یان هێزەوە یان بە ناچارکردنی ئوممەت، نەهاتوونەتە سەر کورسی خەلافەت، بەڵکو بەپێی گرێبەستی بەیعەتدان بووە.

گرێبەستی (پەیمانی بەیعەت) دان، وەك هەموو گرێبەستە شەرعییەکانی تر، لە لای فیقهزانەکان وەك پەیمان ـ بریکاری یا گرێگرتەیی ـ وایە، بەجۆرێ کە ئوممەت ئەسڵەکەیە و خاوەنی مەسەلەکەیە و ئەو کەسەشی هەڵیئەبژێرێت بە سەرکردە و حوکمڕان، بریکارە یان کرێگرتەیە.

بۆیە ئەبینین (الحجاوی) لە کتێبی (کشاف القناع) دا ئەڵێ: هەموو کارو چالاکییەکانی حوکمڕان لە رێگەی بریکارییەوەیە و ئەو بریکاری موسڵمانانە.[2]

هەربۆیە سەرداری شوێنکەوتووان (ئەبو موسلیمی خەولانی) کاتێ چووە خزمەت موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ پێ وت:

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٠١.

[2] کشاف القناع، ٦/١٦٠.

سلاوت لیٚ بیٚ ئەی کرێگرتەی موسڵمانان، پێیان وت: بڵیٚ ئەمیری باوەڕداران، وتە: نەخێر، بەڵکو تۆ کرێگرتەی". [1]

کاتیٚ موعاویە ویستی بەیعەت لە موسڵمانان وەربگرێت بۆ یەزیدی کوڕی، بۆ ئەو مەبەستە داوای کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ خودایان لیٚ ڕازی بیٚ ـ کە بەیعەتی پیٚ بدات، (ئیبن عومەریش پێی وت: منیش کەسێکم لە موسڵمانان و ئەوان چیان پیٚ باش بێت منیش پێم باشە). [2]

هەروەها وتی: سوێند بە خوا ئەگەر ئوممەت دوای تۆ لەسەر بەندەیەکی حەبەشی ڕێك بکەون، منیش یەکێك ئەبم لەوان، وەك ئەوان ئەکەم. [3]

هەربۆیە پێشەوا بەغدادی لە کتێبی (أصول الدين)دا دەڵێت: "زۆربەی زاناکانی هاوڕێمان و موعتەزیلە، خەواریج و نەجاریە ئەڵێن: دانانی ئیمام (فەرمانڕەوا) لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئوممەتەوەیە". [4]

پێشەوا رازی ئەڵیٚ: "الأمة هي صاحبة الرئاسة العامة"، [5] واتە: ئوممەت ـ گەل ـ خاوەنی سەرۆکایەتی گشتییە.

(ماوەردی)یش لە (الأحكام السلطانية)دا ئەڵیٚ: "هەرکاتیٚ دوو سەرۆك هەبوو هەردووکیان بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە ئەو لەپێشترە، گویٚ لە هیچکامیان ناگیرێت و سوێنیش نادرێن، بەڵکو ئەوە ئیشی ئەوان نییە، ئەوە مافی موسڵمانانە بە گشتی". [6]

---

[1] رواه ابو نعيم في حلية الاولياء، ٢/١٢٥.

[2] الطبري، ٣/٢٤٨.

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] اصول الدين، ل٢٧٩.

[5] الايجی، لە (المواقف)دا، ل٣٤٥ هێناویەتی.

[6] الأحكام السلطانية، ل١٠.

**ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئوممەت ـ بەو پێیەی لایەنی بنەڕەتییە ـ ئەو دامەزرێنەری گرێبەستی بەیعەتەکەیە و ئەویش پێویستی ئەکات... ئەم ئەساڵەتەو ئەم دامەزراندن و قبووڵ کردنە، مانای سەرورەی ئوممەت ئەگەیەنێت.. چونکە ئەگەر کاروباری خۆی بەدەست خۆی نەبێت، هیچ کات بۆی نییە ئەم گرێبەستە ئەنجام بدات، مافی دانانی ئیمام نەدەبوو، کە هەڵسێت بیکات بە بریکاری خۆی... هەڵبژاردنی سەرۆك بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی لەلایەن گەلەوە و گرێبەستی بەیعەت کردنە، هەموو ئەمانە لقێکن لە سەروەری گەل...**

ـ ٥ ـ

## "بنەمای شورا لە ئیسلامدا"

دەروازەی چوارەم لە رەتکردنەوەی سەروەری گەل...

بنەمای (شوورا) و راوێژکردن لە ئیسلامدا، خوای گەورە کاتێ باسی ئوممەتی ئیسلام ئەکات بەوە وەسفی ئەکات کە لە کارە بچووکەکان و گەورەکانیشدا، پێویستە ئیشو کارەکانیان لە رێگای پرسو راوێژکردنەوە بێت، نەك لە رێگای زۆرداری و تاکرەوییەوە بێت.

وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾[1] واتە: کاروباریان لە رێگای شووراوە بەرێوە ئەبەن، ئەمەش مانای وایە هەموو کارێکی دەستەجەمعی پێویست بە راوێژ و پرسو را هەیە لەناو خۆیاندا، کەسیش بۆی نییە ـ ئەم سنوورە ببەزێنێت ـ و لە رێگای دەستبەسەردا گرتن و تاکرەوی و ستەمکاری لە حوکمرانیدا دەوڵەت بگرێتە دەست، چونکە هەر شتێك مافی دەستەجەمعی هەموو کۆمەڵگە بێت، کەس مافی ئەوەی نییە بڵێ بە من رەوایە یان بە فلان هۆز یان فلان مەزهەب، ئەمەشە ناوکرۆکی سەروەری، پاشان بە هیچ شێوەیەك رەوا نییە بۆ کەس بە تەنها و بەزۆر خۆی بسەپێنێ بەسەر گەلدا و ئەو مافە لە گەل زەوت بکات.

راوێژکردن (شوورا) بنەمایەکی ئاینی پیرۆزە لە ئیسلامدا، لە رێگای نیگا (وەحی)ی خواییەوە دابەزیوەتە سەر دڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەپێچەوانەی گەلەکانی تری سەرزەوییەوە کە لە ئەنجامی گوزەرانی تاڵی کۆمەڵگە هێنایە کایەوە بە کێشمەکێشم و خەباتی دوورودرێژ گەلان توانییان

---

[1] الشورى : ٣٨

ئەو مافە لە زۆردار و پاشاکان بسەننەوە و لە ڕێگەی هاوبەشییکردن و پرس‌و ڕاو ڕاوێژەوە دایبمەزرێنن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەس زیاتر ئەم بنەما پیرۆزەی جێبەجێ کردووە، ئەبو هورەیرە - خودای لێ ڕازی بێ - ئەفەرموێت: "ما رأيت أحداً أكثر مشورة لأصحابه من رسول الله (صلى الله عليه وسلم)"،[1] واتە: نەمدیوە هیچ کەسێك ئەوەندەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرس‌و راوێژ بە هاوەڵەکانی بکات، ئەمەش وەك وەڵام‌و گوێڕایەڵی پەروەردگاری کە فەرمانی پێکردووە راوێژ بە هاوەڵانی بکات لە هەموو مەسەلە گرنگ‌و سادەکانیشدا، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾،[2] ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر مەعصوم بووە و لە هەڵە و پەڵە پارێزراوە دەبێ راوێژ بە موسڵمانان بکات، جا وەرە کەسانی دوای ئەو کە هیچ کەس لە هەڵە بەدوور نییە؟

"راوێژکردن لە ئیسلامدا حوکمێکی لاوەکی نییە لە فەرمانەکانی ئیسلام و بە ئایەتێك یان هەندێ فەرموودە و رووداو چەسپابێت، بەڵکو بەنەمایەکە لە بنەماکانی ئاین، یەکێکە لە پێویستییەکانی جێنشینایەتی و بڕبڕەی پشتی دەسەڵاتی ئوممەتە و هۆی هەستانیەتی بە ئەمانەتی حوکمڕانی لەسەر بناغەی هاوبەشکاری و هاوکاری و بەرپرسیارێتی".[3]

ئیبن عەتییە کە یەکێکە لە قازییە گەورەکانی مەزهەبی مالیکی و قسەیەکی کاریگەری بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت: "راوێژکردن لە بنەماکانی

---

[1] رواه الترمذي.

[2] آل عمران : ١٥٩

[3] الشورى والديمقراطية، د. حسن الترابي، گۆڤار، ذ: ٧٥، لا١٣٧.

شەریعەتە و کۆڵەکەی دەسەڵاتە و ئەوەی راوێژ بە خاوەن زانست و خواناسان نەکات لابردنی پێویستە و ئە مەش رای جیاواز هەڵناگرێت". [1]

بەرزترین ئاستی راوێژکردن ئەوەیە کە پەیوەندە بە حوکمڕانییەوە، گرنگترین مەسەلەی فەرمانڕەوایی و سیاسەت، هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایە بە جۆرێ کە لە رێگای راوێژکردنەوە لە نێوان موسڵمانەکاندا دێتەدی، چونکە مەسەلەی دەسەڵاتداری مەسەلەی ئوممەتە و مافێکی شەرعی خۆیانە، چونکە لە رێگەی شووراوە یەکلایی ئەبێتەوە نەك لە رێگەی دەستبەسەراگرتنی حوکمو زۆرداری و تاك سەرۆکییەوە، هەروەها لابردنی سەرۆکیش، هەر لە رێگای گەلەوەیە و بەرێگای پرسو راو راوێژەوەیە نەك لە رێگەی زۆرەملێ یان کودەتاوە.

هەروەها دیاریکردنی ماوەی حوکمڕانییەکەی ئەگەر ئەوەیان بەباش زانی یان دانانی دەستوورێك کە ببێتە بەڵێننامەیەك لە نێوان ئەوان و فەرمانڕەواکەیاندا کە خۆیان بەیعەتیان پێداوە و هەڵیانبژاردووە، ئەمەش لە رێگای شوورا و راپرسی خەڵکەوە و.. هتد، لەو هۆکارانەی کە حوکمڕانی و سیاسەت پێویستی دەکات.

عومەری کوڕی خەتاب ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ هەواڵی پێگەیشت کابرایەك وتبووی: "ئەگەر عومەر بمرێت من دەنگ بە فلانە کەس ئەدەم، چونکە وەڵڵاهی بەیعەتدانەکەی ئەبوبەکر لەدەست دەرچوون بوو، عومەریش چووە سەر مینبەر و وتارێکی دا و وتی: "ئەزانم هەندێ کەس ئەڵێن هەڵبژاردنی ئەبوبەکر لە دەست دەرچوون بووە، بەڵام خوا لە شەڕ و خراپەیان لاماندا،

---

[1] المحرر الموجيز، ٣/ ٣٩٧.

هەرگیز خەلافەت دانامەزرێت تەنها لە رێگەی شوورا و راپرسییەوە نەبێت، هەرکەسێ لە خۆیەوە و بێ پرس و ڕا بەیعەت بە کەس بدات [1]

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: "لا بیعة إلا عن مشورة"،[2] واتە بەیعەت دانامەزرێت بەبێ پرسو را و مەشوەرەت پێکردن، بەو شەش کەسەی کە دیاری کردبوو بۆ موسڵمانان کە دەنگیان پێ بدەن دوای خۆی وت: "من آمر منكم على غير مشورة من المسلمين فاضربوا عنقه"،[3] واتە: هەرکەسێ لە پشت ئێوەوە و بەبێ راوێژ و پرسو را کەسێکی تری دیاری کرد بدەن لە ملی.

لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێت: "من دعا إلى امارة لنفسه من غير مشورة المسلمين فلا يحل لكم الاّ ان تقتلوه".[4] واتە: ئەوەی بانگەشەی سەرۆکایەتی بۆ خۆی بکات بەبێ راوێژکردن بە موسڵمانان، ئەوە هیچ چارتان نییە بێجگە لە کوشتنی.

ئبن کەسیر لە کتێبی (البداية والنهاية)دا باسی ئەوەی کردووە کە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ دوای ئەوەی کێبڕکێکە لە شەش کەسەکەوە تەسك بوویەوە بۆ (عوسمان) و (عەلی) ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ هەستا و دەستی کرد بە پرسو را بە خەڵکی و رای موسڵمانانی کۆئەکردەوە، ڕای هەموو خەڵکەکە بەدەستەجەمعی و بە پەرتەوازە و تەنهایی، دوو دوو یەك یەك، بە نهێنی و بە ئاشکرا، تا گەیشتە ناو

---

[1] مصنف عبدالرزاق، ۳۰۲/۱۰.

[2] هەمان سەرچاوە، ٤٣١/٧.

[3] طبقات ابن سعد، ٢٦٢/٣.

[4] ابن شيبة في تأريخ المدينة، ٩٣٦/٣.

ئافرەتانیش لەماڵەکاندا و پرسی پێ کردن و تەنانەت پرسی بە منداڵانیش کرد لە ماڵەوەیاندا و تا کار گەیشتە ئەوەی پرس بکا بە ڕێبوار و میوان و عەرەبە بیاباننشینەکانی ناو مەدینە و ئەمەش ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژی خایاند".[1]

خۆ ئەگەر ئەمە مافێکی ڕەوای خەڵکەکە نەبوایە، هەرگیز عەبدوڕەحمان ئاوا خۆی ماندوو نەئەکرد و یەك یەك رای وەرنەئەگرتن، کەواتە دروست نییە لە پشتی ئەوانەوە یان بەبێ ڕەزامەندی ئەوان، فەرمانڕەوا دیاری بکرێت و ئەوەش مافێکی هەموو خەڵکییە بەبێ جیاوازی و ڕەنگو زمان و ئاینییان.

یان (عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب) - خودای لێ ڕازی بێ - لە دوای شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عەففان فەرمووی: (ان بيعتي لا تكون الا عن رضا المسلمين)، واتە ئەم هەڵبژاردن و بەیعەت پێدانەم دانامەزرێت تا موسڵمانان پێ رازی نەبن.

کە چووە مزگەوتەکەوە و وتارێکی دا و فەرمووی: "يا أيها الناس أنّ هذا أمركم، ليس لأحد فيه حق إلاّ من أمرتم، فإن شئتم قعدت لكم، وإلاّ فلا أجد على أحد"،[2] واتە: ئەی جەماوەر ئەم مەسەلەیە بەدەست ئێوەیە، کەس بۆی نییە وەریگرێت مەگەر کەسێك ئێوە خۆتان هەڵیبژێرن، ئەگەر پێتان باشە من واز لە دەسەڵات ئەهێنم، وەگەرنا من هیچم بەسەر کەسەوە نییە.

وەربەرەوە لە وتەکەی: (ئەم کارە مافی ئێوەیە و کەس بۆی نییە بێ ئێوە هیچ بکات)، دەی هەر ئەمەیە مانای سەرورەی و دەسەڵاتی گەل.

---

[1] البداية والنهاية، ١٥١/٧.

[2] الطبري، ٧٠٠/٢.

داواکردن له ئوممەت (گەل) کە پابەند بن بە سیستەمی (شوورا) و راوێژکردنەوە، لە کارێکدا کە مافی هەموانە و پەیوەندی بە هەموو تاکێکی کۆمەڵگەوە هەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئوممەت بە گشتی خاوەنی ئەم مافەیە، رەوا نییە بۆ کەس دەست تێوەردانی تێدا بکات، مەگەر لە رێگەی پرس‌و را و راوێژەوە بێت و ئەمەش جەوهەر و ناوەرۆکی سەروەری و دەسەڵاتی گەلە.

بۆیە بیرمەندی ئیسلامی (ئەبو ئەعلای مەودودی) ئەڵێت: (بنەما و سیستەمی سەروەری ئوممەت کە لە ئیسلامدا دانی پیانراوە بۆ گەل لە ئایەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾،[1] هەر ئەو سیستەمەیە کە مرۆڤایەتی دانی پێدا نا، بەڵام پاش خەباتێکی دورودرێژ، بۆیە پێویستە هەمان سیستەم لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەردەوام بێت)[2].

کەواتە بنەمای راوێژکردن ـ شوورا ـ لقێکە لە (سەروەری ئوممەت و دەسەڵاتی گەل).

---

[1] آل عمران : ١٥٩

[2] نحو الدستور الاسلامي، ل١٣٢.

## پوختەی باسەکانی پێشوو

شەریعەتی ئیسلامی باڵاترین سەرچاوەی دەسەڵاتی یاسادانانە لە دەوڵەتە موسڵمانەکەدا، ئەم سەرچاوەگیرییەش بەرجەستە نابێت لە چوارچێوەی هیچ وڵاتێکدا ئەگەر لە رێگای (ئیرادەی گشتی) ئوممەتەوە نەبێت. هەروەك ویستی گشتی (الارادة العامة)ش وەك کردەیەکی سیاسی دەرناکەوێت مەگەر لە دەرەنجامی (سەروەری گەل) نەبێت و بەپێی ئەم نەخشەیەی خوارەوە:

سەروەری گەل ⟵ ئیرادەی گشتی ⟵ سەرچاوەگیری

کەواتە: سەروەری ئوممەت پێشەکییەکی پێویستە لەپێناو جێبەجێکردنی شەریعەتدا.

دواتر، کەس بۆی نییە ـ بەپێی ئەم سەروەرییە ـ شتێك بسەپێنێت بەسەر ئوممەتدا، بەبێ گەڕانەوە و حسابکردن بۆ ویستو ئیرادەی ئوممەت و ئەو دەستوورەشی کە لە رێگەی سندوقی دەنگدانەوە دەنگی لەسەر دراوە.

جا ئەگەر ئوممەت سیستەمی بەها و بنەما ئیسلامییەکانی کرد بە سەرچاوەی باڵای خۆی و لەو چوارچێوەیەدا یاساکانی دادەڕشت و قانوونی دادەنا، ئیتر بۆ کەس نییە لێی هەڵگەڕێتەوە یان شتێك بسەپێنێت کە پێچەوانە یان دژ بێت لەگەڵ سەرچاوە دەستوورییەکەیاندا.

بەڵام ئەگەر ئوممەت ـ گەل ـ لەکارخستنی شەریعەتی هەڵبژارد، هەڵوێستی دروست ئەوەیە کە راشکاوانە ناڕەزایەتی بەرامبەر ئەو هەڵبژاردنە رابگەیەنرێت، لەگەڵ قبوڵکردن و داننانی سیاسییدا بەو هەڵبژاردنە، ئەمەش بەپێی ئەو رێککەوتنە گرێبەستیەی نێوان میللەتە، پاشان بەپێی رێڕەوی

گرێبەستەکە، هەوڵ ئەدەین بۆ گەڕانەوەی جێبەجێکردنی شەریعەت، بەهەمان ڕێگای کە پێشتر شەریعەتی پێ پەك خرا.

ئەمەیە ئەو بیردۆزەی سیاسییەی کە پێشتر روونمان کردەوە و بەڵگەمان لەسەری هێنایەوە لە چوار بەشەکەی پێشوودا.

بەڵام هەندێ رەخنە هەن، کە هەندێ لە نووسەر و لێکۆڵەرەوان دەربارەی ئەم بیردۆزەیە دەریانبڕیوە، کە ئەتوانین کۆی بکەینەوە لە چوار رەخنەی سەرەکییدا کە بەدوای یەکدا باسی یەك بەیەکیان دەکەین:

## ڕەخنەی یەکەم

## ئەگەر ویستی گەل ئەوەی ئەخواست شەریعەت لەکاربخات

ـ ١ ـ

لەوانەیە ڕەخنەگرێك بڵێ: باشە ئەگەر ئوممەت خاوەنی سەروەری خۆی بێت و کەس نەتوانێت هیچی بەسەردا بسەپێنێ تا نەگەڕێتەوە بۆ ئیرادەی ئەو، ئەی ئەگەر ئەم ئوممەتە شەریعەتی ئیسلامی وەلا نا وەك سەرچاوەیەك، دەی ئایا هەڵوێستی شەرع چییە لەوبارەیەوە؟

پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە: ئەبێ یەکەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئەم پرسیارە هەرچەندە لەلایەن عەقڵەوە ڕوودانی دوور نییە، بەڵام لە واقیعدا بەپێی یاسای کۆمەڵگەی بەشەری واقیعی نییە، چونکە ناچێتە عەقڵەوە ئوممەتێك شووناسی موسڵمانەتی هەڵگرتبێت، لەهەمانکاتدا دوولەسەر سێی خەڵکەکەی شەریعەتی ئیسلامەکەیان ڕەد بکەنەوە.

بەڵێ، لەوانەیە میللەت حیزبێکی ئیسلامی دیاریکراو ڕەد بکەنەوە و لەباری سیاسییەوە بیخەن، ئیتر لەبەر شکستخواردوویی و سەرنەکەوتنی لە شێوازی بەڕێوەبردنی وڵاتدا، جاری واش هەیە هەموو حیزبە ئیسلامییەکان ڕەد ئەکەنەوە، بەڵام هەرگیز ڕوونادات ئوممەتی ئیسلام شەریعەتی ئیسلام وەك سەرچاوە و بنەما ڕەد بکەنەوە.

گەلی موسڵمان هەرگیز شەریعەتی ئیسلام و سەرچاوەی باڵا ڕەد ناکەنەوە، مەگەر بە گشتی واز لە ئیسلام بێنن، یان لە حاڵەتی ناحاڵی بوونی تەواویان لە ئیسلام هەبێت کە پێی ئەڵێن (الجهل المتطبق)، بە مانای گەڕانەوە بۆ سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام، دەی گەڕانەوە و

پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام، یان بوونی ناحاڵی بوونی تەواو، ڕوونادات لە کۆمەڵگەیەکی موسڵمانی دیموکراسی و کراوە و ئازاددا.

چونکە بەجۆرێ ئیسلام بەرجەستە دەبێت لە واقیعەکەدا، ئەمەش لە ڕێگای فێربوونی گشتی و زانکۆکانی و ڕاگەیاندنەکانی و کەلتوور و ڕەوشت و چالاکییە مرۆڤایەتییەکانییەوە، لەگەڵ بوونی ئازادی تەواو بۆ زاناکان و بانگخوازان و دەزگا ئایینییەکان، بەسەربەستی و ئازادی و سەربەخۆیی تەواوەوە.

دەی ناچێتە عەقڵەوە کە کۆمەڵگەیەکی موسڵمانی سەربەستی ئا لەو چەشنە، لە هەمانکاتدا ڕەدی شەریعەتی ئیسلام بکاتەوە و بە سەرچاوەی باڵای خۆی نەزانێت! مەگەر کاتێك شەریعەتەکە ناتەواو و دژبەیەك بن لەناو خۆیدا، دەی پاكو بێگەردی بۆ خوای گەورە کە شەریعەتەکەی ئاوا نییە.

ئەمە خاڵێکە، خاڵی دووەم، زۆرێك لە رەخنەگران، کاتێ قسە ئەکەن دەربارەی ئەوەی کە ئوممەت توانای گۆڕینی دەستوور یان سەرچاوەی باڵای وڵاتەکەی هەبێت. دوو شت تێکەڵ ئەکەن، ئەو دەستوورەی کە وەك بەڵێننامەیە و بریتییە لە کۆمەڵێ بنەمای سەرەکی کە فۆرم و شێوازی حکومەت دیاری ئەکەن و بنەماکانی حوکمڕانی ئەکێشن و بنەما و بەهاکان ئەخاتە چوارچێوەی یاسادانانەوە.

لەگەڵ ئەوە دەستوورەی کە کاری یاسادانانی ئاسایی ناو پەرلەمانەکانە کە پێویست ئەکات رۆژانە لەو جۆرە یاسایانە دەربکرێت، ئەم دوو شتە دوو شتی جیان لە یەکتری. ئەو کرداری یاسادانانەی کە ئەندام پەرلەمانەکان پێی هەڵدەسن ئەوە یاسادانانێکی رێژەییە و ئەگۆڕێت، پابەندە بە چوارچێوەی دەستووری هەمیشەیی وڵاتەوە، کەواتە بەپێی یاسا پەرلەمان بۆی نییە یاسایەك دەربکات پێچەوانە بێت لەگەڵ دەستوور یان دژی بێت.

بەڵکو بنەمای دەستووری لە فەلسەفە قانونیدا ئەڵێ: دانانی هەر یاسایەك کە پێچەوانە بێت، دواتر ئەو کاری دادگا دەستوورییە یان ئەو دادگا باڵایە کە هەستێت بە پووچەڵکردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی هەر یاسایەك کە تەنانەت زۆرینەی خەڵکیش دەنگیان لەسەر دابێت". [١]

هەر لەبەر ئەمەیە کە هەموو ئەو یاسایانەی پەرلەمانەکان دەری دەکەن، پێی ئەڵێن یاسا نەرمو شلەکان، چونکە پەیوەستە بە بەرژەوەندیی رۆژانەی خەڵکییەوە و کاروباری ژیانیش پێویستی بە خۆگونجاندن و کارتێکردن و گۆڕانی بەردەوامە.

---

[١] القانون الدستوري والنظم السياسية ، عبدالحميد متولي، ل٧٥.

بۆیە هەر ئەوەندەی بەسە بۆ دەرکردنی بڕیارێك کە پەنجا کۆ یەك دەنگی پیێ بدات، لەگەڵ پابەندبوونی بە چوارچێوەی دەستوور و نەگۆڕەکانەوە.

ئەمەش بەپێچەوانەی دەستووری یاساییەوە، کە بە (یاسا وشکەکان یان ڕەقەکان ناودەبرێت، چونکە دەرکردنی یان گۆڕینی) پێویستی بە هەندێ کاری توونو و ئاڵۆز هەیە بۆ ئەوەی گرنگترین تایبەتمەندییەکانی لە دەست نەدات، وەك: (جێگیری، پایەبڵندی بەسەر هەموو یاسادانانەکان و دەسەڵاتەکاندا). واتە بەجۆرێك بێت کە گرنتی ڕاستەقینە بە هاووڵاتیان بدات کە ڕووبەڕووی حکومەتەکان و حیزبە جۆراوجۆرە یەکلەدوای یەکەکان ببێتەوە، چونکە حکومەت و حیزبەکان ناتوانن بە زۆرینەی دەنگی ئاسایی لە نێو پەرلەماندا یاری بە بڕگەکانی دەستوور بکەن و بە ئارەزووی خۆیان هەرچۆنیان بوێت بیگۆڕن.

کەواتە بەس نییە بۆ گۆڕینی دەستوور پەیداکردنی زۆرینەیەکی ئاسایی گەل، واتە (٥٠ + ١)، بەڵکو بە لایەنی کەمەوە پێویستی بە دوو لەسەر سێی دەنگەکان هەیە، هەروەك چۆن لە ناو بینای پەرلەماندا بڕیارەکان تێناپەڕێنرێت، بەڵکو پێویستی بە ڕاپرسییەکی ناو خەڵك هەیە، بۆیە زۆرێك لە سیستەمەکان ڕێگە نادەن بە هیچ حیزبێکی سیاسی پێشنیازی گۆڕینی دەستوور بکات، تەنها لەبەر ئەوەی کە زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستهێناوە، بەڵکو ئەبێ ڕێژەیەکی (نیو +١) لەپەرلەماندا بەدەست بێنێت.

هەرچەندە ئەم ڕێژەیە لە ڕژێمێك بۆ ڕژێمێکی تر ئەگۆڕێت، هەندێ لە وڵاتەکان لە ٦٥٪ و هەندێکی تریش لە ٧٠٪یان داناوە، پاشان ئەو حیزبە یان ئەو حکومەتە ئەم ڕێژە دیاریکراوەی بەپێی یاسا بەدەستهێنا، هەر بۆی

نییە دەستوور هەموار بکاتەوە، بەڵکو تەنها ئەوەی بۆ هەیە پێشنیاری گۆڕینی دەستوور بکات واتە پرۆژەی هەموارکردنەوەکە پێشکەش دەکات.

جیاوازی هەیە لە نێوان پشت ئەستوری و نێوان پێشنیارکردندا، پاشان ئەم پرۆژە پێشنیارکراوە ئەخرێتە راپرسییەکی جەماوەرییەوە، دەبێت دوو لەسەر سێی دەنگەکان بەدەست بێنێت نەك تەنها پەنجا کۆ یەك.

هەندێ لە سیستەمەکان پێش ئەوەی پرۆژەکە بخاتە دەنگ، دەنگدانی جەماوەریەوە، مەرجی ئەوە ئەگرن کە رەزامەندی ئەنجومەنە خۆجێیەکان یان ئەنجومەنی نیشتمانی یان رەزامەندی سەرۆکی وڵاتی لەسەر بێت، نەك هەر ئەوە بەڵکو چەندان رێوشوێنی ئاڵۆزی داناوە کە بگیرێتەبەر، کە کارەکە وا دەکات گۆڕینی دەستوور قورس‌و گران بکات و زۆر هەستیارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت لە زۆر باروزروفدا ئەنجام نادرێت.

پاشان مادەکانی دەستوورکەش، لە مادەیەکەوە بۆ مادەیەکی تر ئەگۆڕێت لەلایەن گرنگی و هێزەوە، مادەی وا هەیە بڕبڕەی پشتی دەستوورە و جەوهەرەکەیەتی کە ناکرێ لە هیچ حاڵەتێکدا دەستکاری بکرێت، مەگەر دەستوور لەکاربخرێت یان شۆڕشێکی جەماوەری سەرتاسەری هەڵبگیرسێت. جگە لەم دوو هۆکارە ناکرێت لە رێگەی دەنگدانەوە دەستکاری بکرێت، چونکە دەستوور هەیکەلی دەوڵەت و بنەمای حوکمڕانی دیاری دەکات.

بەڵام هەندێ مادەی دەستووری تر هەن بەوشێوەیە گرنگ نین و ئاستیان لە خوارەوەیە و کاریگەرییەکی وایان نییە، کاری هەموارکردنەوە و

گۆڕانكاری كردنیش تیایدا یان زیادكردنی بڕگەیەك بۆی، كاریگەریەكی ئەوتۆی نابێت لەسەر سیستەمی حوكمڕانی.[1]

بۆیە دەبینین زۆربەی ئەو گۆڕانكارییە دەستووریانەی لە دەستووری وڵاتە جیهانییەكانی وەك ئەمریكا و فەرەنسادا روویداوە دەست نەبراوە بۆ بنەما سەرەكی و بنچینەییەكان كە دەستووری لەسەر بنیاتنراوە، بۆ نموونە مادەی یەكەم و دووەم، كە بە سەرچاوەگیری دەستوورەكە دادەنرێت.[2]

مەبەست لەم هەموو رێوشوێنە ئاڵۆزەی دانراوە، بۆ ئەوەیە كە دەستوور بە جێگیری و نەگۆڕی ـ تا دەكرێت ـ بمێنێتەوە، چونكە نەرمی و شلگیری بنەماكانی دەستوور و ناجێگیرییەكەی دەبێتە هۆی نەمانی سەقامگیری حاڵەتی سیاسی و تێكدانی سیستەمی حوكم و كردنەوەی دەرگا بە رووی یاریكردن بە یاساكان لەلایەن بەرژەوەندچیو دەسرۆیشتووەكان و پارەدارەكانەوە.

یان دەبێتە هۆی ناكۆكی سیاسی نێوان حیزب و لایەنەكان، كە ئەوەش وڵات بەرەو كێشمەكێش و ناكۆكی دەبات تەنانەت دەشگاتە جەنگی ناوخۆییش، بۆیە سەقامگیری دەستوور و نەگۆڕییەكەی هۆكاری سەقامگیربوونی كەشە سیاسییەكە دەبێت.

هەروەها مەبەست لە ئەم رێوشوێنە ئاڵۆزە، ئەوەیە كە دەستوور رەنگدانەوەی راستەقینەی (ویستی گشتی) ئوممەت بێت، نەك رەنگدانەوەی تاقمێكی دەسترۆیشتوو یان هێزێك دەستی گرتبێت بەسەر وڵاتدا یان حیزبێكی دیاریكراوی سەركەوتوو لە قۆناغێك لە قۆناغەكانی هەڵبژاردنەكاندا.

---

[1] الوسيط في القانون الدستوري العام، إدمون رباط، ل٤٨.

[2] مبادىء القانون الدستوري والعلم السياسي، اسماعيل مرزة، ل٦٦.

- ٣ -

خاڵی سێیەم، خاڵێکی تریش کە پێش وەڵامدانەوەی ئەم رەخنەیە ئەبێت تێبینی بکەین ئەوەیە گۆڕینی ریشەیی فەلسەفی دەستووری وڵات یان دەستکاری کردنی کارێکی کتوپڕی نییە، کە لە نێوان بەیانییەك و ئێوارەیەکدا روو بدات بەبێ هیچ پێشەکییەکی پێشتر.

بەڵکو لە ئەنجامی هەناسەبڕکێ و گۆڕانی کۆمەڵایەتی گەورە کە پێویستی بە ماوەیەکی لەسەرخۆ و دوورو درێژ هەیە کە ئەوەش گۆڕانکارییەکی شاراوەی هەست پێنەکراوە.

بە دەربڕینێکی تر، هەموو گۆڕانکارییەکی ریشەیی کە دەستووری لەسەر راوەستاوە، لە ئەنجامی گۆڕانی ژێرخانی ناهەستیی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی، گۆڕینی ژێرخانی ناهەستیش لە ساڵێك و دوو ساڵ و دەیان ساڵدا روو نادات، بەڵکو لەوانەیە سەدەیەکی پێویست بێتو رەنگە زیاتریش.

بە مانای کۆمەڵێ گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی قووڵ و سست و لەسەرخۆ، کە ببێتە هۆی گۆڕینی سیستەمی پێوانەیی بیرو بەها و قەناعەتەکان بە سیستەمێکی پێوانەیی تازە و جیاواز.

کەواتە ئێمە لەبەردەم کۆمەڵە دۆسیەیەکی ئاساییدا نین، کە بە تەنها راپرسی و دەنگدانێکی ئاسایی بیانگۆڕین، بەڵکو ئێمە لەبەردەم پاشخانێکی ئاینی و بەهایی و فەلسەفیەکی وادایین نە لا ئەبرێت و نە ئەگۆڕێت مەگەر گۆڕانکاریەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی درێژخایەن و لەسەرخۆ.

ئێ پاشان، ناچێتە عەقڵەوە، بەپێی روانگەی مێژوویی و روانگەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی، هیچ گەلێك لە گەلان شەریعەت هەڵبژێرێت و بیکاتە

سەرچاوەی باڵای دەستوورەکەی، پاشان راستەوخۆ، لە خولێکی تری پەرلەمانی داهاتوودا دەنگ بدرێت بۆ لەکارخستنی شەریعەت بەشێوەیەکی کتوپڕی، بەبێ هیچ پێشەکییەك... بەڵکو دەبێت کۆمەڵێ پێشەکی و پێشهات رووبدات کە ببێتە هۆی ئەو گۆڕان و گوێزانەوە گەورەیە لە پێکهاتەی کەلتووری کۆمەڵگەکە.

ئەمەش مانای ئەوەیە، لەکارخستنی شەریعەت، ئەگەر بێتەدی بەهۆی راپرسی و دەنگادنەکەوە نییە وەك هەندێك وائەزانێت، راپرسی و دەنگدان تەنها ئاشکراکەری ناخی ژێرخانی کەلتووری کۆمەڵایەتی نوێیە، کە لە رێگەی چەندان گۆڕانکاری سستی درێژخایەن دروست بووە.

دواتریش، لەکارخستنی شەریعەت، بەهۆی سەروەری گەلەوە نییە، بەڵکو ئەو گۆڕانکاریی و ئاڵوگۆڕانە بەسەر ژێرخانی کەلتووری کۆمەڵگەوە دروست بووە، ئەوکاتەش مەسەلەکە بەرەو بنەمای (سەروەری) ناڕوات، بەڵکو بەرەو زانینی هۆکاری ئەو گۆڕانکاریی و ئاڵوگۆڕانەیە کە هاتوون بەسەر کۆمەڵگەدا و وایان لە خەڵکەکە کردووە کە سەیری شەریعەت نەکەن وەك سەرچاوەیەکی باڵا.

لەدوای ئەم تێبینییە گرنگانە، دەبێ ئەو کەسانەی ئەم رەخنەیە ئەگرن ئەم تێبینییانە لەبەرچاو بگرن، دووبارە ئەگەڕێینەوە بۆ لای رەخنەکە، ئەڵێین ئەگەرهاتوو با بە گریمانەیەکی خەیاڵییش بێت، بڵێین ئەو مەسەلەیە روویداوە و زۆرینەی زۆری ئوممەت شەریعەتی ئیسلامیان رەدکردەوە و وەك سەرچاوەی باڵا، حکومەتە هەڵبژێرراوەکەش کە نوێنەری ئەو خەڵکەیە، ناچاربوو هەموو رێوشوێنە یاساییەکان بگرێتەبەر بۆ گۆڕینی دەستوور و لەئاکامدا گۆڕیان، ئایا لەو کاتەدا هەڵوێست چی بێت؟

وەڵام: هەڵوێستی شەرعی، هەمان هەڵوێستە کە کاتێ فەرمانڕەوایەکی ستەمکار دێتە سەر حوکمو رەفزی شەریعەتی ئیسلام بە گشتی لە دەستووردا دەکات.

رەخنەگری بەڕێز ئەڵێ: کەواتە هەرکاتێ حاکمێکی ستەمکار بەزۆر هاتە سەر حوکم و شەریعەتی ئیسلامی پەکخست وەك سەرچاوەی تاقانە و باڵا سەیری نەکرد... منیش هەموو توانام ئەخەمە کار بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو ستەمکارەدا ئەگەر توانای جەماوەری و سەربازییم بێت.

وەڵام: دەی ئێمەش هەروەها، ئەگەر حیزبێکی سیاسی لە رێگای ویستی گەلەوە هاتە سەر حوکم و باوەڕی بەوە نەبوو کە شەریعەت بکرێتە دەستووری وڵات و وەك سەرچاوەی باڵا سەیری نەکرد و لەکاری خست.. ئێمەش هەوڵی لابردن و رووخانی ئەو دەسەڵاتە ئەدەین لە رێگای ویستی گەلەوە دووبارە شەریعەت ئەگەڕێنینەوە بۆ شوێنی شایستەی خۆی وەك سەرچاوەی باڵای وڵات.

به مانایه‌كی تر:

كاتێ حاكمێكی تاكڕه‌وی زۆردار، به‌هێزی شمشێر و تۆقاندن و توندوتیژی ده‌سه‌ڵاتی گرته‌ده‌ست و شه‌ریعه‌تیشی وه‌ك سه‌رچاوه‌ی باڵا لابردو له‌كاری خست... بێگومان بۆ لابردن و دوورخستنه‌وه‌ی پێویسته هه‌مان هۆكار بگیرێته‌به‌ر و چه‌كو هێزی ده‌وێ بۆ راماڵینی و هه‌ركاتێ ئه‌و توانایه كه‌وته ده‌ستی میلله‌ت ئه‌توانن به‌زۆری جه‌نگ و خوێنڕشتن لایبه‌رن ودواتر شه‌ریعه‌تی ئیسلامی بكه‌نه‌وه به‌ده‌ستووری وڵات.

ده‌ی هه‌ر به‌و چه‌شنه، كاتێ ده‌سه‌ڵاتێك ده‌چێته سه‌ر حوكم له رێگه‌ی ده‌نگدانی ئازاده‌وه ئوممه‌ت ئه‌یبه‌نه سه‌ر كورسی ده‌سه‌ڵات، ئه‌ویش حیزبێكه باوه‌ڕی به‌وه نییه كه شه‌ریعه‌تی ئیسلامی بكرێته سه‌رچاوه‌ی باڵای یاساكانی وڵات، دواتر ده‌یسرێته‌وه و هه‌ركه دوو له‌سه‌ر سێی ده‌نگه‌كانی به‌ده‌ستهێنا ده‌ستوور به‌یه‌كجاری ئه‌گۆڕێت.

هه‌موو مه‌رجه یاساییه‌كانی ده‌گرته‌به‌ر، ئه‌و كاته هه‌ڵوێستمان ئه‌وه‌یه سه‌رله‌نوێ ده‌ست پێ بكه‌ین و هه‌وڵی خستنی ئه‌و حوكمه‌ته بده‌ین و دواتر هه‌ر له رێگه‌ی ده‌نگدانه‌وه بچینه‌وه سه‌ر حوكم و پاشان له رێگه‌ی دوو له‌سه‌ر سێی ده‌نگه‌كانه‌وه ده‌ستوور وه‌ك خۆی لێ بكه‌ینه‌وه و جێبه‌جێكردنی شه‌ریعه‌ت ده‌ست پێ بكه‌ینه‌وه.

واته: هه‌ڵوێستمان ئه‌و كاته رازی بوون و قانعبوونمان به ئه‌نجامی هه‌ڵبژاردنه‌كان ناگه‌یه‌نێت وه‌ك هه‌ندێ له ره‌خنه‌گره‌كان بۆی ده‌چن... به‌ڵكو ته‌نها قبوڵكردنێكی سیاسییه به‌پێی ئه‌و گرێبه‌سته‌ی نێوان تاكه‌كانی كۆمه‌ڵگا، چونكه دیموكراسیه‌ت داوا له لایه‌نه ركابه‌ره‌كان ده‌كات كه رازی بن و قه‌ناعه‌ت بێنن به پرۆژه‌ی كه‌سی به‌رامبه‌ر، نه‌خێر، به‌ڵكو ته‌نها دان

پیانانێکی سیاسییە بە ئەنجامەکەی، خۆ داننان بە ئەنجامەکەیدا مانای رازیبوون و قەناعەت هێنان بەو پرۆژەیە نییە.

دواتر، ئەگەر گەل لەکارخستنی شەریعەتی هەڵبژارد، هەڵوێستی ئێمە راگەیاندنی نەیاری و نابەدڵی ئاشکرای ئەنجامەکە دەبێت، بەڵام لە هەمانکاتدا دان بە ئاکامەکەیدا دەنێین و قبوڵی دەکەین، ئەمەش بەهۆی ئەو گرێبەستەی کە هەیە لە وڵاتدا.

پاشان بەپێی رێڕەوی گرێبەستەکە، هەوڵی گەڕانەوەی شەریعەت ئەدەینەوە، بەهەمان رێڕەو کە بەهۆیەوە پێشتر لەکارخرا.

لەم حاڵەتەدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان ئێمە و نێوان ئەو کەسانەی ئەم رەخنانە ئەگرن، ئەوان ئەیانەوێت شەریعەت جێبەجێ بکەن لە رێگەی دەستگرتن بەسەر کورسی دەسەڵاتدا لە رێگەی هێز و توندوتیژی و زۆرکارییەوە، ئەگەر پێویست بکات.

بەڵام ئێمەش هەمان ویستمان هەیە کە جێبەجێکردنی شەریعەتە بەڵام لە رێگای گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە و بە رێڕەوی ئاشتی و بەهۆکاری شارستانی.

ئەوان باوەڕیان بە سەرچاوەیی شەریعەت هەیە و وەك بیروباوەڕ دەبێت جێبەجێ بکرێت بەسەر کۆمەڵگەی موسڵماندا، بەڵام لە رێگەی توندوتیژی و زۆرکاری و کوشتوبڕەوە.

ئێمەش ئەمانەوێت شەریعەت بەرجەستە ببێت و جێبەجێش بکرێت، بەڵام لە رێگەی هەڵبژاردن و راپرسی و لە رێگەی دەزگا کۆمەڵایەتی و شارستانی سەربەستەکانەوە و لە رێگەی راگەیاندنی کراوە و رێگای ئاشتی و رێگا ئاساییەکانی تر.

کەواتە، جیاوازییەکە لە سەرچاوەیی شەریعەتەوە نییە یان لەسەر بنەمای (پابەندکردن) بە شەرعەوە، بەڵکو لەسەر ڕێڕەوێ کە سەروەری گەل بگەڕێنێتەوە، کە دواتر بتوانێت دەسەڵات بگۆڕێت و لاییات بەو شێوازەی ئێمە باوەڕمان پێیەتی.

ئەم سەروەرییەش یان بە ڕێڕەوی کودەتا و دان بەسەر حکومەتدا بێت، یان ڕێڕەوی - گرێبەستی و دەساودەسکردنی دەسەڵات، ئەگەر ڕەخنەگرەکان گریمانەی ئەوە بکەن کە گەل سەروەری بکەوێتە دەست، سەرئەکێشێ بۆ لەکارخستنی شەریعەت، بەڵام ئێمە گریمانە ناکەین بەڵکو زۆر دڵنیایین کە کەسی تاکڕەو و دەست بگرێت بەسەر کورسی دەسەڵاتدا ئەوە مێژوو و لەگەڵ واقیعدا ئەوەیان سەلماندوە کە شەریعەت لەکار ئەخات!

ئەگەر ئەو برا ڕەخنەگرانە، باوەڕیان بەوە هەیە کە لە ڕێگەی کودەتا و دەسەڵات گرتنە دەستی بەزۆرەوە شەریعەت بگێڕنەوە و بیکەنەوە سەرچاوەی حوکم لە وڵاتدا.

دەی هەر بەو چەشنە ئێمەش باوەڕمان وایە کە پێویستە شەریعەت بگەڕێتەوە و بکرێتەوە بە سەرچاوەی دەسەڵات، بەڵام لە ڕێگەی گرێبەستەوە. کەواتە جیاوازییەکە لەوەدا نییە کە ئەوان هەوڵی جێبەجێکردنی شەریعەت ئەدەن، بەڵام ئێمە هەوڵی بۆ نادەین، بەڵکو هەموومان هەوڵ ئەدەین شەریعەت بگەڕێتەوە، بەڵام بەکام سەروەری و بە کام ویستو ئیرادە؟

ڕەخنەگرەکان ڕێڕەوی (زاڵبوون) هەڵئەبژێرن تا شەریعەت بسەپێنن بەسەر گەلدا، ئەوان بەم کارەیان کە کارێکی دەسەڵات گرتنەدەستە و

بەزۆری زۆرداری، کە ئەمەش وائەکات لە کەسانی تریش کە زۆربەکاربێنن و ئەوان لەسەر حوکم لابەن و دواتر شەریعەتیش دووبارە لەکار بخەنەوە، دووبارە ئەمانیش ئەوان لابەن و لە کودەتایەکەوە بۆ کودەتایەکی تر، لە سەرۆکێکی خۆسپێنەوە کە شەریعەت جێبەجێ بکات بۆ خۆسەپێنێکی تر کە شەریعەت لەکار بخاتەوە.

ئەمەش تەنها قسەیەکی سەرزارەکی و تیۆری نییە، بەڵکو بە درێژایی مێژوو بەم شێوەیە بووە، هەرکەسێ بە زۆر دێتە سەر حوکم بەهێزی چەك و نواندنی زۆرەوە خۆی سەپاندووە، دوای ئەویش کەسێکی تر هەر بە زۆری چەك هەڵی کوتاوەتە سەر دەسەڵات و ئەوی لابردووە و خۆی حوکمی کردووە، لەم نێوانەشدا گەلی داماو رۆڵی نادیارە و هەر تەماشاکەرە و نە پرسی پێ ئەکرێت و نەئەگەڕێنەوە بۆ لای ویستی ئەو.

تا ئەمەیە رێڕەوی دەسەڵاتی خۆسەپاندن بەدرێژایی مێژوو، کە زۆری لەو رەخنەگرانە تەبەنای ئەکەن جا ئیتر بزانن بەخۆیا یان نا.

ئەوەی ئێمە ئەیخەینە روو، هەروەك زۆرێ لە بیرمەند و بانگخوازە ئیسلامییەکان باسیان لێوەکردووە، ئەوەیە قەبوڵی رێڕەوی (گرێبەست) بکرێت و گرێبەستی گەل لەناو خۆیاندا کە ئەوەش ئاکامێکی سروشتی سەروەرییەتی بەسەر خۆیدا و دەسترۆیشتنیەتی بەسەر سامان و زەوی زارەکەیدا، هەموو چین و توێژەکانی خەڵك لەسەر ئەوە رێك ئەکەون کە هیچ دەسەڵاتێك نەیەتە کایەوە لە رێگەی گەلەوە نەبێت و لە رێگەی راپرسی و سندوقەکانی دەنگدانەوە نەبێت.

کە تیایدا هیچ کەسێك بۆی نەبێت خۆی بسەپێنێت بەسەر دەسەڵاتدا و هیچ شتێك بەسەر گەلدا بیسەپێنێت بەبێ ویست و رەزامەندی گەل.

# رەخنەی دووەم
# ئایا ئیشکردن بەشەریعەت یان
# لە کارخستنی مەسەلەیەکی ئارەزوومەندانەیە؟

ـ ١ ـ

لەوانەیە رەخنەگرێك بڵێت: لە ئەسڵدا پابەندبوون بە شەریعەتەوە پێویستە و جێگای هەڵبژاردنی ئارەزوومەندانە نییە، لەکاتێکدا بنەمای (سەروەری گەل)، جێبەجێکردنی شەریعەت و لەکارخستنیشی بە مەسەلەیەکی ئاسایی ئەزانێت، لەسەر ئارەزوو و ویستی گەل دەوەستێت لەکاتێکدا کە شەریعەت خۆی سروشتی جێبەجێکاری زۆرەملێی تێدایە.

وەڵام: ئەم رەخنەیە ـ ئەگەر بە وردی لێی بکۆڵینەوە ـ بۆ ئەوە ناشێت وەك رەخنەیەك سەیری بکرێت.

چۆن؟

ئەم پرسیارە لەو خراپحاڵی بوونەوە سۆنگە ئەگرێت، کە لەوانەیە گەل دەنگ بە لەکارخستن و دوورخستنەوەی شەریعەت بدات... دەی ئەم لەوانەیە هیچ کاریگەریی و کێشەیەك دروست ناکات بۆ بیردۆزەکەی (بیردۆزی گرێبەستی کۆمەڵایەتی) و شیاوی ئەوەش نییە وەك رەخنەیەك سەیری بکەین، چونکە لەکارخستنی شەریعەت لە مێژووی مرۆڤەکاندا رووی داوە ئیتر چ ئوممەت سەروەر بووبێت یان حاکمی تاکڕەوی خۆسەپێن، یان چینی (چارەسەر و گرێبەست)، کە هەمووشیان زانا و دانای رەببانی بوون!

پابەندبوونی هەموو ئەوانە بە شەرعەوە یان دەستبەرداربوونیان لێی، دوو شتی رووداون لە روانگەی ویستی مرۆڤەکانەوە، وابووە حاکم شەریعەتی

جێبەجێکردووە و کەچی دواتر هەر خۆی یان حاکمی دوای خۆی دەستبەرداری شەریعەت بووە. هەروەها ئەهلی حەلوعەقدیش لە سەرەتاوە پابەندبوون بە جێبەجێکردنی شەرعەوە، کەچی دواتر دنیا لەخشتەی بردوون و خۆشی دەسەڵات گۆڕیونی و زۆر شتی شەرعیان گۆڕیوە وەك چۆن کەسانی جگە لەوانیش گۆڕیویانە، یان کەسانی دوای ئەوان دەستکاریان کردووە و گۆڕیویانە، کەواتە شتێکە و رووئەدات لە ژێر سێبەری روانگە و مەرجی مێژوویدا. ئەم حاڵەتەش پێچەوانە نییە لەگەڵ ئەوەی کە خودی شەریعەتەکە پابەندبوون پێویست ئەکات، خۆئەمەش مانای ئەوە نییە کە لە ئەرزی واقیعیشدا ئەبێ هەر بەردەوام جێبەجێ بکرێت، چونکە وا دەبێت روو بدات یان نا.

بە دەستەواژەیەکی فەلسەفییانە:

پێویستی پابەندبوونی بەهاکان مانای ئەوە نییە کە پێویستی هۆکاریشی بەدوادا بێت، مەبەست لە پێویستی هۆکاری لە نموونەیەکدا روون بکەینەوە.

بۆ نموونە ـ راستگۆیی ـ، لەسەر هەموو کەسێك پێویستە لە لایەنی بەهای رەوشتییەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە بە کردەوەش ئەبێ جێبەجێی بکات، واتە پێویست نییە لەسەر مرۆڤەکە راستگۆیی بهێنێتە کایەوە، بەڵکو هەروەك شتێکی رووداو ئەمێنێتەوە لەلایەنی روودانی واقیعی، کەواتە گومانی روودانی لە واقیعدا مانای ئەوە نییە کە پێویستە لەلایەن بەهای رەوشتییەوە.

پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بەهاکان، پەیوەندییەکی مەبەستییە، نەك پەیوەندییەکی هۆکاری، بەمانای ئەوەی کە گونجانی کرداری کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان پێکەوە لەگەڵ ئەو بەهایانەی کە باوەڕیان پێیەتی، ئەوە بێگومان

دەرەنجامی مەبەستی ئەو کۆمەڵە مرۆڤەیە لەگەڵ بەهاکاندا نەك هۆکاری بێت و لە ئەنجامی هۆیەکی سروشتی زۆرەملێ بەدەر لە ویستی مرۆڤەکان هاتبێتە کایەوە.

هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە فەیلەسوفەکان جیاوازییان کردووە لە نێوان یاسای هەڵسوکەوتی سلوکی و یاسای سروشتییدا. واتە یاسا سروشتییەکان کە جوڵەی سەرجەم شتەکان بەدەست ئەوە، ئەوە مانای ئەوەیە پێویستەو پابەندبووە، بەڵام لەکاتێکدا ئەو یاسایە کە هەڵس‌وکەوتی مرۆڤەکانیان بەدەستەو ژیانیان رێك‌وپێك ئەکەن، سیفەتی هەڵبژاردن و ئارەزووکاری تیایە، دواتریش گومانی روودانی، چونکە شت‌ومەکە مادییەکان بەپێی گونجانی تایبەت ئەجوڵێت و بەپێی پێویست و پەیوەندییەکانی نێوان شتەکان پەیوەندییەکی هۆکارییە، هۆیەکان گشت کات کار دەکاتە سەر کارتێکراوەکان و جموجوڵەکانیان، بەپێی یاسای گشتی کە بەسەر هەموو شتە لێکچووەکاندا جێبەجێ دەبێتو هەریەکە و بەپێی جۆری خۆی.

بەڵام هەموو ئەو یاسایانەی تایبەتە بە ژیانی مرۆڤەکان، سروشتێکی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵسوکەوتە مرۆییەکان تایبەتن بە ویستی سەربەستانەی تەواوی مرۆڤەکان، هەروەك ویستی مرۆڤەکان سەربەستانەیە، هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ لە ویستێکی سەربەخۆوە سەرچاوە ئەگرێت، ئەوە رووئەدات و ئیمکانیش هەیە روو بدات.

شەریعەت مەجالی هەڵبژاردنی تێدا نییە و شتێکی پێویستە، بەڵام پێویستییەکەی مانای ئەوە نییە کە دەبێتە پێویستی ناچاری هۆکاری، چونکە وادەبێت تاك پابەندبێت پێوەی و یاخود پابەند نەبێت، ئەمەش سروشتی هەموو بەهایەکی هەڵسوکەوتییە ئاینی بێ یان مرۆییە:

بەرجەستەکردن و هێنانەدی و جێبەجێکردن و پابوەندبوون پێوەی لە ئەرزی واقیعدا پەیوەستە بە ویستو ئیرادەی مرۆڤەکەوە و تواناکانییەوە، دواتر ئا لەم رووەوە شتێکی رووداو و روودانی مانای ئەوە نییە کە خۆی لە خۆیدا پێویست نییە ئەمە لە رووی بەهایی بیروباوەڕەوە.

ئەگەر وابێت، ئەوکاتە ئێمە لە نێوان دوو ویستو ئیرادە داین: (ویستی گەل) و (ویستی زۆردار)، ئیتر زۆردارەکە تاك بێ یان لایەنێك بێت و دەسەڵاتی بۆ خۆی قۆرخ کردبێت. روودانی هەردوو ئیرادەکە شتێکی ئاساییە، گەل لە روانگەی گریمانەی عەقڵییەوە ئەتوانێ شەریعەت وەك سەرچاوەی دەسەڵات رەد بکاتەوە، هەروەك زۆردارێکی قۆرخکاریش بەهەمانشێوە ئەتوانێت شەریعەت وەك سەرچاوەی دەسەڵات رەدبکاتەوە.

ئەو کاتە پرسیارەکە لەوە نییە کە لە گریمانەی روودانی لەکارخستنەکەدا بێت، چونکە بە ئاسایی ئەوە رووی داوە لە هەموو سیستەمێکی سیاسی کە عەقڵی بەشەری هێنابێتییە کایەوە یان کاری پێ کردووە یان لەکاری خستووە، بەڵکو پرسیارە راستەقینەکە ئەمەیە: کام لەم دوو رووداوە زووتر و خێراتر گۆڕاون و دەستکارییکردنی دێت بەسەردا؟

بەمانایەکی تر: کام لەو دوو رووداوە زیاتر جێگیرە و دوورە لە گۆڕین و دەستکارییکردن؟

گومان نابەم هیچ ژیرێك گومانی لەوەدا هەبێت کە گۆڕینی شەریعەت و دەستکاریکردنی و ساختەکاری تیایدا لە حاکمێکی زۆرداری قۆرخکارەوە نزیکتر و خێراترە لە روودانیدا لەوەی لەلایەن گەل بە گشتییەوە روودەدات.

گەلان‌و کۆمەڵگەکان ـ بەپێی سوننەتی کۆمەڵگەی بەشەری ـ قەناعەت و بیروباوەڕ و بەهاکانیان بە ئاسانی ناگۆڕێن مەگەر بە تێپەڕبوونی ساڵانێکی دورودرێژ، بەڵکو لە چەندان سەدەدا.

بەپێچەوانەی فەرمانڕەوای زۆردارەوە ـ کە دەسەڵات بەدەست خۆیەتی ـ لەوانەیە لە ماوەی شەوێکدا هەموو قەناعەتەکانی سەرتاپا بگۆڕێت، یان یەکسەر بە مردنی، حاکمی دوای ئەو باوەڕی بە کۆمەڵێ قەناعەت و بەها و بیروباوەڕی جیاواز لە حاکمی پێشوو هەبوو، هەموو جومگەکانی دەسەڵات ژێرەوژوور دەکات.

کەواتە هەردوو ئیرادەکە ـ ئیرادەی گەل و ئیرادەی زۆردار ـ لە گریمانەی عەقڵییدا روودەدات شەریعەت لەکاربخەن، دەی باشە ئایا کام لەو دوو ئیرادەیە باشتر و گونجاوترە بۆ شەرع؟ ئیرادەی زۆردارێکی خۆسەپێن، یان ئیرادەی ئوممەت بە گشتی؟

ئا ئەمەیە پرسیارە ژیرانەکە.

- ٢ -

هەندێ لە ڕەخنەگران ئەڵێن: ئەمە مانای وایە - بەڕای تۆ - ئوممەت سەرپشکە لە نێوان جێبەجێکردن و ڕەدکردنەوەی شەریعەتدا، ئەمەش بەتەواوی پێچەوانەیە لەگەڵ وتەی خوای گەورەدا کە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾،[1] واتە: هیچ پیاوو ژنێکی باوەڕدار بۆیان نییە سەرپشك بن لە جێبەجێکردنی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەیدا، ئەم سەرپشککردنەی ئێوەش پێچەوانەی حوکمی شەرعە؟!

وەلاّم: بەڵێ، بێگومان نابێ بگوترێ جێبەجێکردنی شەریعەت مەسەلەیەکی ئارەزووییە، سەرپشککاری لەبەردەم حوکمی شەرعدا و ڕێگەپێنەدراوە لە شەرعدا، ئەمەش یەکلاییە و بەشێکە لە ملکەچی و شوێنکەوتن.

بەلاّم ئەی "سەرپشککردن" مانای چییە؟

دوو مانای هەیە:

یەکەم: سەرپشککردن لە شەرعدا بەمانای ڕێگەپێدان دێت، بە مانای ئەوەی کە باوەڕدار بۆی هەیە بیکات یان نەیکات، بەلاّم (سەرپشککردن) بەم مانایە - لە ئایەتەکەدا قەدەغەی کردووە سەیرکردنی شەریعەت وەك سەرچاوەی ژیان جێگای سەرپشککردن نییە لەلای باوەڕدار، بەڵکو لە هەموو حاڵەتێکدا جێبەجێکردنی شەرع پێویستە.

دووەم: بەلاّم سەرپشککردن لە لایەنی ئیرادەوە، ویستو ئارەزوومەندانەی بەشەری - سەربەست - بەو جۆرەی کە خوا مرۆڤی

[1] الأحزاب : ٣٦.

دروستکردووه، که لەسەر ئەو بنچینەیە کە داواکارییەکانی پەروەردگاری لەسەر دامەزراوە.

وەك ئایەتی: (وهديناه النجدين) واتە: هەردوو ڕێگاکەمان خستووەتە بەردەستی مرۆڤ، یان ئایەتی: (فَمَنْ شاءَ فَليؤمِنْ وَمَنْ شاءَ فَليَكفُر) واتە: کێ ئەیەوێت باوەڕبێنێ و کێش ئەیەوێت با کافر بێت. یان ئایەتی: (لِمَنْ شاءَ مِنكُم أنْ يَستقيم) واتە: بۆ هەرکەسێ کە خۆی بیەوێت ڕێگای ڕاست هەڵبژێرێت.

کەواتە مرۆڤ بەم مانایە ئازاد و سەرپشکە لە نێوان گوێڕایەڵی یان سەرپێچییکردندا، خۆئەگەر ئەم ئازادییە ئارەوومەندانەیە نەبوایە هیچ داوا و فەرمانێکی شەرعی پێویست نەدەبوو، فەرمان و داواکارییەکان لەسەر ئەم سەرپشککردنە وەستاون کە پەیوەستە بە سروشتی دروستبوونی مرۆڤەوە.

با هەندێ نموونە بێنینەوە، تا بە ڕوونی جیاوازی نێوان هەردوو ماناکەی سەرپشك دەربخەین:

بۆ نموونە فەرمان بە نوێژکردن، باوەڕدار بەپێی شەرع سەرپشك نییە لە کردن و نەکردنی نوێژە فەرزەکان، بە واتای بیکات و نەیکات وەك یەك بێت، بەڵکو پێویست کراوە لەسەری کە نوێژ بخوێنێت. بەڵام لە بەرامبەریشدا، لەلایەن ئیرادەی سەربەستەوە (سەرپشکە) نوێژ ئەکات یان نایکات، خۆئەگەر ئەم ویستە سەربەستانەیە نەبوایە خوا داوای نوێژکردنی لێ نەدەکردین، چونکە ئەوکاتە زۆرلێکراو دەبوو، فەرماندەرکردن بۆی شتێکی بێ مانا ئەبوو.

قەدەغەکردنی داوێن پیسی یان مەیخواردنەوە، بەپێی شەرع کەسی باوەڕدار بۆی نییە ئەو دوو قەدەغەکراوە ئەنجام بدات یان نەیدات، بەڵکو پێویست کراوە لەسەری کە دەبێ لەو دوو قەدەغەکراوە خۆی بەدووربگرێت.

بەڵام لە بەرامبەریشدا - سەرپشکە - لەوەی لە داوێنپیسی و مەیخواردنەوە دورئەکەوێتەوە یان نا، ئەمە لەلایەنی ئیرادەی سەربەستانە، خۆئەگەر ئەم ئیرادەیە سەربەستانە نەبوایە داواکاری شەرعیشی لێنەئەکرا، ئەگەر مرۆڤ سەرپشك نەبوایە ئەوە زۆرلێکراو دەبوو، ئەوکاتە داواکاری شەرع لێی هیچ مانایەکی نەئەما.

سەیرکردنی شەریعەت وەك سەرچاوەی ژیان، لەسەر موسڵمان بەپێی شەرع واجبە، سەرپشککردنی تێدا نییە لەلایەن دروستییەوە، بەڵام لەبەرامبەریشدا جێگای سەرپشککردنە لەلایەن ویستو ئیرادەی مرۆڤەکانەوە. سەرپشککردن لەلایەن ویستی مرۆڤەکەوە مانای ئەوە نییە لەلایەن شەرعیشەوە سەرپشك بێت، مرۆڤ بەوە پێناسە ئەکرێت بەردەوام لەلایەن واقیعی دروستبوونییەوە کە سەرپشکی ئیرادییە، کە ئەمەش مانای ئەوە نییە کە لەلایەن بەهاییەوە یان شەرعییەوە سەرپشك بێت.

یان مرۆڤ لەسەری پێویست کراوە کە راستگۆ و دەستپاك و رەوشت بەرز بێت، بەڵام ئەم پەیوەستبوونەی بەم بەها باڵایانەوە لەسەر ئیرادەی سەربەستانەی وەستاوە لە هەڵبژاردن، دواتر خۆی بەرپرسیارە لەم هەڵبژاردنەیدا.

دیموکراسی کە لەسەر بنەمای (سەروەری گەل) دامەزراوە، گوێ نادات بە بنەمای هەڵبژاردن بە مانا شەرعی و دروستییەکەی، بەڵکو گوێ بە لایەنی هەڵبژاردنی سەربەستانەی مرۆڤەکە ئەدات.

دیموکراسی بە مرۆڤی باوەڕدار ئەڵێ: بەلای منەوە گرنگ نییە لە بیروباوەڕی تۆدا شەریعەت پێویستە جێبەجێ بکرێت، تۆ ئازادی لەوەدا ئەوەی بەلای منەوە گرنگە کە ناخی تۆ بزانم کە ئایا تۆ ئەتەوێ پابەند بیت بەم بیروباوەڕەتەوە یان ناتەوێت؟ بە مانایەکی تر: ئەو راپرسییە جەماوەرییەی کە لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا دەگوزەرێت، کاری ئەو تەنها دەرخستنی ویستی خەڵکەکەیە و قەناعەتەکانیان.

بەبێ گوێدانە سروشتی زۆرەملێ بەو جۆرە قەناعەتانە لە روانگەی باوەڕدارانییەوە، کە ئایا باوەڕیان پێیەتی یان نا؟ گرنگ ئەوەیە بیروباوەڕ و قەناعەتەکانیان دەربخەن، دەربڕینی ئیرادە و قەناعاتی مرۆڤەکان بەهیچ جۆرێك (سەرپشککردنی حەڵاڵکردن) ناگەیەنێت.

ئایا ئەگەر من پرسیارێکی ترم لێکردی: ئایا ئەتەوێت نوێژ بکەیت؟

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە من سەرپشکت بکەم لە نێوان نوێژ بکەیت یان نەیکەیت، بە مانای ئەوەی کە هەردوو شێوەکە دروستە؟ یان من تەنها بۆ ئەوە پرسیارم لێ کردیت تا ئیرادەی نێو دڵت ئاشکرا بکەم؟

راپرسی دیموکراسی گوێ بە هەڵبژاردەی شەرعی نادات، بەڵکو تەنها گوێ بە هەڵبژاردەی ئارەزوومەندانە دەدات، ئەگەر وادابنێین: گەلێکی لەسەدا سەد موسڵمان، بیەوێت شەریعەتی ئیسلام وەك سەرچاوەی دەستوور هەڵبژێرێت، چونکە پێی وایە کە جێبەجێکردن و شوێنکەوتنی شەریعەت پێویستە لەسەری، ئەمەش بەپێی موسڵمانبوونەکەی، دەی باشە ئەم ویستو ئیرادە جوان و چاکەی بەچی دەرببڕێت؟

ئایا بۆمان هەیە پێی بڵێین: بۆت نییە شەریعەت هەڵبژێرێت وەك دەستوور، چونکە شەریعەت قابیلی هەڵبژاردن نییە؟!

کەواتە کێ شەریعەت هەڵدەبژێرێت؟!

ئایا بۆمان هەیە بە گەل بڵێین: بێدەنگ بە و رای خۆت دەرمەبڕە و تۆ بۆت نییە پرۆسەی هەڵبژاردنی شەریعەت جێبەجێ بکەیت؟ چونکە شەریعەت تۆی ناوێت و خۆی پێویستە و دەبێ حوکم بکات؟!!

دەی کەواتە کێ ئەم ئارەزووە دەردەبڕێت؟

خۆ مەلائیکەت لە ئاسمان دانابەزێت؟ یان پەروەردگار ـ جل وعلا ـ خۆی دەرناخات ئەم ویستەی مرۆڤەکان ئاشکرا بکات؟

ئەگەر گەلی موسڵمان بۆی نەبێت، شەریعەتی ئیسلام وەك سەرچاوەی دەستوور هەڵبژێرێت، ئەی باشە کێ هەستێ بە دانانی شەریعەت وەك سەرچاوەی دەستوور؟ئالێرەدا تێکەڵکردن و لێتێکچوون لەلای رەخنەگران دروست بووە لە نێوان سەرپشککردن لەلایەن شەرعەوە و سەرپشککردن لەلایەن ئیرادەوە؟

لە کۆتاییدا هەر دەبێت هۆکارێکی بەشەری هەبێت کە رەنگدانەوەی ئەم ئیرادە سەربەستانەیە بێت، ئەم بژاردەیەی لەو رێگایەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت، کە هەڵبژاردنی شەریعەتە. دواتر، ئوممەت سەرپشکە بە تەواوی لەلایەن ویستو ئیرادەوە کە شەریعەت هەڵبژێرێت وەك دەستووری وڵات یان هەڵی نەبژێرێت، بەڵام لە بەرامبەردا وەك شەرع و وەك دین ـ سەرپشك نییە ـ بەڵکو بەپێی ئەو پەیمانەی بەخوای گەورەی داوە کە واتاکانی شایەتوماندا پێویستە لەسەری پابەند بێت بە شەریعەتەکەیەوە، چونکە بڕیاری داوە کە هیچ خوایەك نییە جگە لە خودای تاقانە و موحەممەدیش نێردراوە خوایە.

## ڕەخنەی سێیەم
## ئەگەر فەرمانڕەوا موسڵمان بێت،
## گەلیش شەریعەت وەك دەستوور ڕەد بکاتەوە

لەوانەیە، ڕەخنەگرێك بڵێت: گریمان هەموو قسەکانی پێشووتانمان قەبووڵ کرد، بەڵام ئەگەر سەرۆکێك موسڵمان بوو، بەڵام گەلەکەی ڕەدی جێبەجێکردنی شەریعەتیان ئەدایەوە، ئایا دروستە بۆ ئەو حاکمە کە دەست هەڵگرێت لە دەسەڵاتی خۆی مل بدات بۆ خواستی گەلەکەی؟

یان هەستێت بە زۆرلێکردن و ملقەوچاندنەوە یان بە زۆری هێز و بازوو، شەریعەت جێبەجێ بکات، تەنانەت ئەگەر پێویستیش بە کوشتن و خوێنڕشتن بکات؟

وەڵام:

پێش قسەکردن لەسەر دروستی یان نادروستی ئەو کارە، ئەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەم ڕەخنەیە لە ڕوانگەی دیدگایەکی هەڵەوە بۆ (سەروەری گەل) دروست بووە، چۆن؟ سەرۆك لەژێر سایەی (سەروەری ئوممەتدا) دەسەڵاتەکانی لە ئیرادە و خواستی ئوممەتەوە وەرگرتووە نەك سەپابێت بەسەریدا لە ڕێگەی زۆر و چەوساندنەوەوە، بەجۆرێك کە دوو ئیرادە ئەکێشن بەیەکدا: ئیرادەی گەل و ئیرادەی سەرۆك.

فەرمانڕەوا لە سایەی (سەروەری گەل)دا بە هەڵبژاردن و ڕەزامەندی دێتە سەر تەخت نەك لە ڕێگەی کودەتا، یا پشتاوپشت، ئەو تەنها بریکار و کرێکارێکە، سەر بە (سەروەری گەل)ە و ڕەنگدانەوەی ویستی گەلە، نەك

دژی ئەو بێت، چونکە هەر ئوممەت ئەوی دیارییکردووە و بردوویەتییە سەر تەختی دەسەڵات، هەر ئەویش لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و هەرکاتێ بیەوێت لای ئەبات، پشتئەستوور بەوەی کە ئەو خاوەنی سەروەرییە.

ئەگەر گریمان ئوممەت ـ گەل ـ رۆژێ لە رۆژان شەریعەت رەد بکەنەوە، ئەوکاتە حاکمێکیش هەڵدەبژێرێت کە رەنگدانەوەی ویستی ئەو بێت، چونکە ئەو بریکاریەتی لە هێنانەدی ئەم ئیرادەیە.

چۆن دەبێت وادابنێین، کە ئیرادەی ئوممەت و ئیرادەی فەرمانڕەوا دژبەیەك و پێکادان بکەن، کە ئەو تەنها بریکارە لەباتی ئوممەت؟

ئالێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە چ دژایەتییەك هەیە لە هێنانی ئەم رەخنەیەدا.. تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەوایش موسڵمان بوو، هەر دەسەڵاتی یاسادانان و دادوەریی نییە تا بە هۆیانەوە بەرامبەر گەل بوەستێت و دژی ئیرادەی گەل بوەستێت، چونکە لە کۆتاییدا ئەو هەردەبێ پابەند بێت بە بنەمای (سەروەری گەل) و بەپێی ئەو پەیمان و گرێبەستەی لە نێوان ئەو و گەلدا ئیمزا کراوە، ئەگەر پەیمانەکەی نەباتە سەر، ئەوکاتە بۆ گەل هەیە لایبات و بیگۆڕێت بە فەرمانڕەوایەکی تر.

کەواتە بوونی گەلێك کە شەریعەت رەد بکاتەوە، فەرمانڕەوایەکی موسڵمانی هەڵبژاردراو دژایەتی ئەم ئیرادە جەماوەریە بکات، لە ژێر سایەتی سیستەمێکی سیاسی دامەزراو لەسەر بنەمای (سەروەری گەل) ئەوە گریمانەیەکی هەڵەیە!

دوو شتی دژبەیەکن و هەڵەکەشی لەوەدایە کە:

لەم حاڵەتەدا هەڵوێستی شەرعی، مەبەست حاڵەتی (فەرمانڕەوا موسڵمان بێتو گەلەکەی رەدی شەریعەتی ئیسلامی بکەنەوە)، وەك هەڵوێستی یوسف

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و نەجاشی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ لەگەڵ نەتەوەکەیاندا کردیان، بەجۆرێ یوسف و نەجاشی دەسەڵات بەدەست بوون، گەلەکانیشیان باوەڕیان بە ئاینەکەی ئەوان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆر وایان نەکرد لە گەلەکەیان کە شوێن شەریعەتەکەی ئەمان بکەون.

ئیبن تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەڵێ: "... ئەوەی یوسفی صدیق (علیه الصلاة والسلام) لەگەڵ خەڵکی میصردا کردی، گەلی میصر گەلێکی بێ باوەڕ بوون، ئەویش نەیئەتوانی بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات کە ئاینی خودا داوای لێ کردبوو.

بەڵێ بانگی کردن بۆ باوەڕهێنان و یەکتاپەرستی و ئەوانیش وەڵامیان نەدایەوە، ئەوتا لەوبارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَاءكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءكُم بِهِ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولاً﴾،[1] واتە: پێشتر یوسف پێغەمبەرتان بۆ نێردرا بە ئایینی ڕۆشن و ئاشکراوە کەچی تائێستاش هەر بە گومانن لێی و وتیشتان هەرگیز دوای ئەو ـ دوای مردنی ـ خوا هیچ پێغەمبەرێك ڕەوانە ناکات.

هەروەها نەجاشی لەگەڵ ئەوەشدا کە پاشای گاورەکان بوو، گەلەکەی گوێڕایەڵی نەبوون و جگە لە کەسانێکی کەم نەبێت، کەس باوەڕی نەهێنا لەگەڵیدا، تەنانەت کە مرد کەس نەبوو نوێژی لەسەر بکات، پێغەمبەر لە شاری مەدینە نوێژی نادیار (غائب)ی بۆ کرد، هاوەڵانی کۆکردەوە و بە چەند ریزێك ریزی کردن و هەواڵی کۆچی دوایی نەجاشی پێدان و فەرمووی: ئەو برا چاکەی خەڵکی حەبەشەتان کۆچی دوایی کرد".[2]

---

[1] غافر : ٣٤

[2] "إن أخاكم صالحاً من أهل الحبشة مات".

زۆری له شەریعەتی ئیسلامی پێنەگەیبوو، کۆچیشی نەکرد و جیهادیشی نەکرد، حەجیشی نەکرد، ئەگێڕنەوە نوێژیشی نەکردووە و ڕەمەزانیش بەڕۆژوو نەبووە، زەکاتیشی نەداوە، چونکە ئەو کارانە ئاشکرای ئەکرد و گەلەکەی قەبوڵیان نەئەکرد، ئەویش نەیئەتوانی پێچەوانەیان بکات، دەی خۆ زۆر دڵنیاشین کە حوکمی وڵاتی نەکردووە بە شەریعەت و بە قورئان".[1]

پاشان هەر ئیبن تەیمیە دەڵێت: (نەجاشی نەیئەتوانی حوکمی گەلەکەی بە قورئان بکات، چونکە ئەوان نەیانئەهێشت، زۆرجار موسڵمان بۆتە دادوەری ناموسڵمان و تەتارەکان، بەڵکو بووە بە پێشەوا، کەچی لەهەمانکاتدا ویستوویەتی دادپەروەری ـ ئیسلام ـ بچەسپێنێت بۆی نەکراوە، بەڵکو هەر نەشیانهێشتووە و خوایش بەپێی توانا ئەرکی خستووەتە سەرشانەکان).[2]

کەواتە ئەو فەرمانڕەوا موسڵمانەی لە ژێر سایەی ـ سەروەری گەل ـ دا حوکم دەکات و گەلەکەشی شەریعەت وەك تاکە سەرچاوە ڕەد ئەکەنەوە، حاڵی وەك حاڵی یوسف (علیه الصلاة والسلام) و حاڵی نەجاشی ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ وایە لەگەڵ گەلەکانیاندا.

خۆئەشزانین کە نەجاشی پادشا بووە، خاوەنی دەسەڵاتی ڕەها بووە و فەرمانڕەوایەکی هەڵبژێرراوی گەل نەبوو تا دەسەڵاتەکانی سنووردار بکەن، دەی لەگەڵ ئەوەشدا حسابی بۆ حەزو ویستی گەلەکەی دەکرد، بە دەستووری قورئانیش حوکمی نەکردن، چونکە لێی هەڵئەگەڕانەوە، بەڵکو هیچێ لە شەریعەتی ئیسلامی پیادە نەئەکرد لەناویاندا.

---

[1] منهاج السنة، ابن تيمية، ٥/٧٠ـ ٧١.

[2] هەمان سەرچاوە.

لەکاتێکدا کە لە سایەی سیستەمی دیموکراسی کە لەسەر بنەمای سەروەری گەل دێتە کایەوە، فەرمانڕەوای موسڵمان لەکاتێکدا گەلەکەی شەریعەتی ئیسلامی وەك تاکە سەرچاوە رەدبکەنەوە ئەتوانێت داواکارییەکانی شەرع جێبەجێ بکات وەك نوێژکردن و رۆژووگرتن و حەجکردن و زەکاتی سامانەکەشی بدات و خۆی و ماڵ و منداڵی بە جوانی پابەندی شەرع بن، گەلەکەشی ئازاد بێت لە دەستووردا ئیرادەی گەل و بیروباوەڕ و کەلتوورەکەی لەپێش چاو بگیرێت، چونکە گەل خاوەنی سەروەری و خاوەنی بڕیارە.

دەی کام حاڵیان باشترە؟ حاڵی فەرمانڕەوایەکی موسڵمان لە ژێر سایەی سیستەمی دیموکراسیدا کە گەلەکەی رەدی ئەکەنەوە شەریعەت تاکە سەرچاوەی دەسەڵات بێت؟ یان حاڵی نەجاشی ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ لەگەڵ گەلەکەی؟

گومانی تێدا نییە کە حاڵی حاکمێکی موسڵمان لە سایەی سیستەمێکی دیموکراسی دا باشترە لە حاڵی نەجاشی لەگەڵ گەلەکەیدا؟ چونکە بنەمای سەروەری گەل لە سایەی دیموکراسیدا رێگری ناکات لە حاکمی موسڵمان کە پابەند بێت چ خۆی و چ بنەماڵەو گەلەکەشی بە یاسا و بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامەوە.

# ڕەخنەی چوارەم

# ئەبوبەکری صدیق ـ خودای لێ ڕازی بێ ـ

# لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا جەنگا و ئازادی بیروڕای پێ نەدان

لەوانەیە ڕەخنەگرێك بڵێ: بەڵام ئەبوبەکری صدیق ئازادی نەدا بەوانەی زەکاتیان نەداو هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و حیسابی بۆ ئیرادە و ویستیان نەکرد و بەڵکو لەگەڵیان جەنگا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حاکمی موسڵمان ئەتوانێت جەنگ لەگەڵ گەلەکەی خۆیدا بەرپا بکات ئەگەر ڕەدی شەریعەتیان کردەوە؟

وەڵامی ئەم ڕەخنەیە لە چەند ڕوویەکەوەیە:

**ڕووی یەکەم:** ڕووی سیاسی و قانوونی جەنگی هەڵگەڕاوەکان لەو جەنگەوە نزیکە کە لەگەڵ جوداخوازەکان و جەنگی ناوخۆیی بەرپا دەبێت، نەك جەنگێکی ئایینی بووە وەك وابڵاوە! ئەمەش مانای ئەوە نییە کە هەڵگەڕانەوەیەکی ئایینی نەبووبێت لەنێوان هۆزە هەڵگەڕاوەکاندا، بەڵکو هەندێکیان هەر بە ڕاشکاوی هەڵگەڕانەوەی خۆیان لە ئیسلام ڕاگەیاند.

بەڵام پاڵنەری سەرەکی هۆزەکان لە هەڵگەڕانەوەکەیاندا زیاتر سیاسی و ئابووری بوو، یاخیبوونێکی چەکدارانەی ڕاستەوخۆ بوو بە نیازی جیابوونەوە دژی دەوڵەتی ئیسلامی هەستان.

دوای ئەوەی دەنگدان کراو بەیعەت درا بە ئەبوبەکری صدیق، یەکسەر هەواڵ گەیشتە مەدینە کە هۆزە عەرەبەکان ـ پاشگەزبوونەوەیان ـ تێدا بڵاوبۆتەوە، لەگەڵ هاتنی ئەم هەواڵانەدا، نوێنەری ئەم هۆزانە هاتن بۆ مەدینە و بە ئاشکرا هەڵوێستی نوێی خۆیانیان ڕاگەیاند!

هەڵوێستە نوێیەکەش ئەوەبوو کە لەسەر ئیسلام و بیروباوەڕ بمێننەوە، بەڵام لەلایەنی سیاسی و ئابوورییەوە سەربەخۆ بن و زەکات نەدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە.

کەواتە بە موسڵمانەتی دەمێننەوە، خواناسی دەکەن و باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هەیە و وەك خۆی دەمێنێتەوە، نوێژ ئەکەن و ڕۆژووئەگرن و حەجیش ئەکەن، بەڵام زەکات بە دەوڵەت نادەن، لەناو هۆزەکانی خۆیاندا دابەشی ئەکەن، نایینێرن بۆ خەلیفەی موسڵمانان لە مەدینە، چونکە دان بە سوڵتە و دەسەڵاتی نوێدا دوای دەسەڵاتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نانێن!

ئەم پاشگەزبوونەوەیە لەلایەن عەرەبە شاری و عەرەبە دەشتەکییەکانەوە روویدا لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا، (نوەیری) بەم شێوەیە هێناویەتی و ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، عەرەب هەمووی پاشگەزبوویەوە لە ئیسلام جگە لە هۆزی قورەیش و هۆزە سەقیف نەبێت، کۆمەڵە شاندێکیشیان هاتن بۆ مەدینە بۆ لای ئەبوبەکری صدیق، وتیان نوێژ ئەکەین، بەڵام زەکات نادەین". [1]

وەك (مەدائینی) ـ لەلای تەبەرییەوە ـ دەڵێت: "شاندی عەرەب لە هەموو لایەکەوە هاتن و بڕیاریان دابوو نوێژ بکەن، بەڵام زەکات نەدەن". [2]

بلازەریش هێناویەتی و ئەڵێ: "دەستەو تاقمێك لە عەرەب ڕازیی بونون لەسەر نوێژکردن بمێننەوە، بەڵام زەکات دەرنەکەن". [3]

---

[1] نهاية الأرب، ١٧/٦٧.

[2] الطبري، ٣/٢٤٢.

[3] فتوح البلدان، البلاذري، ل٦٧.

ئیمام شافیعیش دەڵێت: "پاشگەزبووەکان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوو جۆر بوون: جۆرێکیان لە دوای موسڵمانەتی بە تەواوی کافر و بێبڕوا بوونەوە، وەك (طلیحة) و (مسیلمة) و (العنسی) و هاوڕێکانیان، جۆرێکی تریان لەسەر موسڵمانەتی مانەوە، بەڵام زەکات نەئەدا". جەنگی هەڵگەڕاوەکان کە خەلیفە (صدیق) رایگەیاند دژی جیابوونەوەی هۆزە پاشگەزبووەکان بوو کە بڕیاریان دابوو زەکات نەدەن بە دەوڵەتی ئیسلامی، بە مەبەستی مانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بە یەکگرتوویەکی سیاسی، خۆ دژی ئەو کەسانە بەرپای نەکرد، کە بە یەکجاری رەدی ئیسلامیان کردەوە، هەرچەندە لەناو پاشگەزبووەکانیشدا لەم جۆرە هەڵگەڕاوانە هەبوو کە شوێن پێغەمبەرە درۆزنەکان کەوتبوون،[1] بەڵام ئەمە پاڵنەری سەرەکی بەرپاکردنی ئەو جەنگانە نەبوو.

---

[1] وەك شوێنکەوتووەکانی (موسەیلەمە) و (ئەسوەد) و (طولەیحە) و کەسانی تریش کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان ئەکرد، بەڵام تەنانەت ئەو خۆبەپێغەمبەرزانانەش هەر پاڵنەری سیاسی هەبوو لە پشت پاشگەزبوونەوەکەیانەوە... دوکتۆر موحەممەد عەممارە شیکارییەکی مێژوویی زۆر جوان و بەهێزی کردووە و ئەڵێت: "پێویستە هەندێ راستی هەیە تێبینی بکەین و لێی تێبگەین، گرنگترینیان:

١ـ بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لە شێوە سروشتییەکەی خۆیدا گەشتبووە ئاستێکی بەرزی خاوێنی و پوختەیی ـ وەك چۆن ئیسلام داوای کردووە ـ وە مێژوو باسی ئەوەی نەکردووە کە یەك کەس لەوانە لە پێغەمبەرە درۆینەکان ـ باوەڕی نەمابێت و هەڵوەشابێتەوە و لادانی تێدا کردبێت.

٢ـ هیچکام لەو ـ خۆبەپێغەمبەرزانانە ـ نکوڵییان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوادا نەبوو، هەموو ئەو شتانەی مێژووی باسی لێوە کردووە لەم بارەیەوە ئەیانوت نابێ بەس موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەر بێتو ئەیانوت موحەممەد پێغەمبەری خوایە بۆ سەر هۆزی

ئەوە پاڵنەری سەرەکیی ئەو جەنگانە بوو، زۆربەی زۆری ئەو هۆزانەی کە پاشگەزبوونەوە لە زەکاتدان بە دەوڵەتی ئیسلامی، هەموویان خۆیان بە موسڵمان ئەزانی و نوێژیان ئەکرد.

هەر لەبەرئەمەش بوو کە عومەری کوڕی خەتاب و هاوەڵانی تریش لە سەرەتاوە ڕەخنەیان لە بڕیارەکەی ئەبوبەکر گرت و زۆر ناخۆش بوو لەلایان کە کەسانێك بکوژن نوێژ ئەکەن و لە یەکتاپەرستی جیانەبوونەتەوە، خۆئەگەر هەڵگەڕانەوەی هۆزەکان لە ئیسلام یەکجاریی و گشتی بوایە،

---

قورەیشو ئێمەش پێغەمبەری هۆزەکانی خۆمانین، ئیتر دەروون لاوازەکانی ناو هۆزەکان شوێنیان ئەکەوتن.

٣ـ مەسەلەی (وەحی) و نیگای خوایی جێگای نکوڵیی نەبوو لەلایەن پێغەمبەرە درۆینەکانەوە، بەڵکو هەر هەموویان وایان نیشان ئەدا کە وەحییان بۆ دێت، خۆیان قسەیان ڕێکئەخست و ئەیانوت لە ئاسمانەوە بە وەحی بۆمان هاتووە، کەواتە بێباوەڕ نەبوون بە مەسەلەی وەحی، بەڵکو ئەیانوت نابێ بەس بۆ موحەممەد بێتو بۆ کەسی تر نەیەت.

کەواتە، ئێمە لێرەدا لەبەردەم یاخیبوونی هۆزەکانداین، کە بوو بوو بەهۆی تێکچوونی یەکڕیزی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی کە پێغەمبەرێك لە قورەیش سەرکردایەتی ئەکات.

ئەوەی ئەوان کردیان پەرتەوازەکردنی یەکڕیزییەکە بوو، چونکە ئەم دەوڵەتە یەکگرتووە، پێغەمبەرێك سەرۆکایەتی دەکات، هەریەکە لەو پێغەمبەرە درۆینانە کە سەرکردایەتی ئەم جیابوونەوانەیان ئەکرد خۆیان بە پێغەمبەر ئەزانی... واتە مۆرکێکی سیاسی ـ ئاشکرا ـ بەدی ئەکەین لە پشت ئەو نیەتە پیسە بێ پەردەیە، بەڵکو گاڵتەجاڕییەوە کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان بۆ هەڵگەڕاوەکان دەکرد"، بۆ ئەم باسە سەیری باسی (ئیسلام و جەنگی ئاینی) بکە لە کتێبی (الدولة الاسلامية بين العلمانية والسلطة الدينية) لا١٢٥ـ ١٢٦.

بێگومان ئەو جموجوڵانەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان ئەکرد، ئەوە ناگەیەنێت کە کوفر و بێباوەڕی و دەرچوونی ڕاستەوخۆ لە بازنەی ئیسلامەتی نەبووبێت، بەڵکو پاشگەزبوونەوەیەکی ئاشکرابوو لە ئایینی ئیسلام، بەڵام پاڵنەری ڕاستەقینەیان حەزکردنیان بوو لە کێبرکێ کردنی سیاسی لەگەڵ قورەیش و وەستانەوە بە ڕوویدا.

هەرگیز هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوودڵ نەئەبوون لە بەرپاکردنی جەنگ دژیان.

پێشەوا بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ ئەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، ئەبوبەکریش ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دانی بە بێباوەڕی عەرەبەکاندا نا، عومەریش ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ پێی فەرموو: چۆن ئەتوانیت شەڕ بکەیت لەگەڵ خەڵکیدا لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (أُمِرتُ أن أُقاتِلَ الناس حتى يقولوا لا اله الا الله، فمن قالها عصموا مني ماله ونفسه إلاّ بحقه وحسابه على الله)[١]، واتە: فەرمانم بەسەردا دراوە کە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم تا ئەڵێن: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا، هەرکەسێ ئەوەی وت، سەروماڵی لە من حەرام دەبێت مەگەر بە هەقی خۆی بکوژرێت و لێپرسینەوەشی عایدی پەروەردگارە.

بەڵام لە کۆتاییدا، ژیری و لێهاتوویی ئەبوبەکری صدیق ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ لە بڕیارە مێژووییەکەیدا دەرکەوت بۆ هەموان کە لە وتە بەناوبانگەکەیدا دەریبڕی و فەرمووی: (وَالله لأقاتلنَّ من يفرق بين الصلاة والزكاة، فإنَّ الزكاة حق المال، والله لو منعوني عناقاً يُؤَدونهُ إلى رسول الله، لقاتلتهم على منعه).[٢] منعه).[٢] واتە: سوێند بە خوا لەگەڵ ئەوانەدا ئەجەنگم کە جیاوازی ئەکەن لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، چونکە زەکات مافی سەروەت و سامانە، وەڵڵاهی تەنانەت ڕەشۆی وڵاخێکیان دابێت بە پێغەمبەر و نەیدەن بە من، جەنگیان لەگەڵ ئەکەم لەسەر ئەوە.

---

[١] بوخاری لە (الفتح)دا، ٣٠٨/٣دا هێناویەتی.

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کەواتە ئەو، لەسەر ئاین جەنگی لەگەڵ نەکردن، چونکە ئەوان زۆربەیان لەسەر یەکتاپەرستی بەردەوام بوون و بەئیسلام رازی بوون و نوێژ و رۆژوو و حەجیان دەکرد، بەڵکو زەکاتیشیان دەرئەکرد، بەڵام ئەیاندایەوە بە هەژارانی ناو هۆزەکانی خۆیان، نەیانئەنارد بۆ پایتەختی خەلافەتی ئیسلام و بەیتولمال لە مەدینە.

کەواتە، لە هیچ روویەکەوە مانای شەڕی ئاینی تێدا نەبوو، بەڵکو جەنگێکی سیاسی لەگەڵ راگەیاندن تا شکۆ بگێڕێتەوە بۆ دوەڵەت و لە پەرتەوازەییش بیپارێزێت، کە ئەم یەکڕیزییەش گەشە و نومای بەدوادا دێت.

لەم بارەیەشەوە پێشەوا عومەر ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ ئەفەرموێت: "فوالله ما هو الاّ أن شرح الله صدر أبي بكر رضي الله عنه فعرفت أنه الحق"، واتە: سوێند بەخوا دوای ئەوەی دڵی ئەبوبەکر یەکلابوویەوە، بۆ ئەو مەبەسەلەیە، بۆ منیش دەرکەوت کە لەسەر هەقە.

زانای پایەبەرز (ئەبولحەسەنی نەدەوی) ئەڵێ: "شتێکی روونە کە پاشگەزبووەکان زۆرێ لە لایەنەکانی بیروباوەڕی ئیسلامیان رەدنەکردبوویەوە، دروشمە ئایینییەکانیان وازلێنەهێنابوو، بەڵکو بەهۆی لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بوو کە ویستیان ملکەچ نەبن بۆ دەسەڵاتی مەرکەزی، کە یەکێ لە ئەرکەکانی کۆکردنەوەی زەکات بوو، تەنانەت عومەری کوڕی خەتتابیش هەر تێکچوو کە باسی جەنگکردن لەگەڵیاندا کرا، مادەم لەسەر بیرباوەڕ بەردەوامن و نوێژ بەرپا ئەکەن... بەڵام روانینی ئەبوبەکری صدیق بۆ مەسەلەکە زۆر روون و ئاشکرا بوو، کە فەرموویەتی: "وَالله لأقاتلنَّ مَنْ يُفرق بَين الصلاةِ والزكاة، ..."... و بەوکارەی یەکەمین یاخی بوونی عەلمانی و چەکدارانەی دامرکاندەوە کە چەکیان هەڵگرتبوو تا

ئەجیندای خۆیان لە ڕێگەی هێزەوە بسەپێنن، خۆ ئەبوبەکر وەك بزاڤێکی فیکری لەگەڵ پاشگەزبووەکان نەجەنگا... چونکە ئەیتوانی ئەویش بە گفتوگۆ و فیکر ڕووبەڕوویان ببوایەتەوە، بەڵکو لەگەڵ جوڵەیەکی چەکدارانەی یاخیبوانەدا ڕووبەڕووبوویەوە کە دژی دەسەلآتی شەرعی وەستابوونەوە، کە دەیانویست پەرتەوازەیی و نەفامی بێننەوە و عەرەب جارێکی تر بگێڕنەوە بۆ سەردەمی نەفامی و خێڵەکی پێشوو".[1]

کەواتە ئێمە لەبەردەم جەنگێکداین، لە جەنگی جوداخوازی یان جەنگی ناوخۆیی دەچێت، یان لەو جەنگانە ئەچێت کە وڵات لە پێناو هێنانە کایەی یەکڕیزی سیاسی و پتەوکردنی پایەکانی دەوڵەت ئەنجامیان ئەدات... ئەم شەڕانەش سروشتین و لە مێژوودا چەند جار دووبارە بووەتەوە، بەتایبەت لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەت و هەوڵدان بۆ یەکگرتنەوەی... تەنانەت ئەم جۆرە جەنگانە لە دەوڵەتە سەقامگیرەکاندا و لە ژێر سایەی دەستوور و سیستەمی دیموکراسییدا ڕوودەدات.. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو دوای سەربەخۆبوونی و دامەزراندنی دەستوور و سیستەمە دیموکراسییەکەی دووچاری جەنگی ناوخۆیی بوویەوە لە نێوان باشوور و باکووریدا لە ساڵی ١٨٦١ تا ساڵی ١٨٦٥، کە تیایدا (جیفرسون دیفیس) کە یانزە ویلایەتی لەگەڵدا بوو لە باشوور و بڕیاری جیابونەوەی دا لە دەوڵەتە یەکگرتووەکەی ئەمریکا و دەوڵەتێکی ڕاگەیاند بەناوی (ویلایەتە کۆنفیدراڵییەکانی ئەمریکا).. ئەم پیاوەش شێتانە جەنگێکی ناهەمواری دژی دەوڵەتی فیدراڵی ڕاگەیاند کە لەو کاتەدا (ئەبراهام لینکۆڵن) سەرۆکایەتی ئەکرد، ئەم جەنگەش زیاتر لە (٦٢٠.٠٠٠) سەربازی تێدا کوژرا جگە لە ژمارەیەکی زۆری

---

[1] ردة لا أبابكر لها، الندوي، ل٢٧.

تری خەڵکی سڤیل، لە ئاکامدا بوو بەهۆی کۆتایی هاتنی کۆیلایەتی و جێگیرکردنەوەی یەکڕیزی و بەهێزکردنەوەی حکومەتی فیدراڵی.

سیستەمی دیموکراسی و سەروەری گەلی ئەمریکی، نەیانتوانی بەرگریی بکات لە روونەدانی وێنەی ئاوا جەنگێکی ناوخۆیی کە زۆرێ لە گەلانی تێودەگلێن بەناچاری و لەبەر چەندان هۆکاری مێژوویی... بەڵام هەرچۆنێ ببێ رووداوگەلێکی ناکاوی و ناچارین و مەرج نییە ئەسڵ بن!.. دواتریش نابێت بنەما گشتییەکانی سیستەمی سیاسی لەسەر بنیات بنرێت.

**رووی دووەم:**

جەنگی ئەبوبەکر ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ لەگەڵ پاشگەزبووەکاندا، تەنها لەبەر وازهێنانی ئەرکێکی ئاینی نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە وازهێنانی لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە ئاینییە حاڵەت و خراپەی تر بەدوای خۆیدا ئەهێنێت، کە بۆ رێگرتن لێیان پێویست بە جەنگ ئەکات لەگەڵیاندا...

جەنگەکە تەنها لەبەرئەوە نەبوو کە کۆمەڵێ کەس زەکاتیان نەدا بە دەسەڵاتی سیاسی ئەو سەردەمە، بەڵکو لەبەرئەوەبوو کە ئەم زەکات نەدانە دەبێتە هۆی داڕمانی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی تازە دروستبوو بەسەر هۆزە عەرەبە جیاجیاکاندا.

لەسەر ئەو بناغەیەی کە پێدانی زەکات لەلایەن هۆزەکانەوە بە دەوڵەتی خەلافەت لە شاری مەدینە، وەك پێوەر و رەمزێکی سیاسی بووە بۆ بەردەوامی یەکگرتوویی دەوڵەت لەو ساتەوەختەدا، هەروەك زەکاتنەدانەکەیان یاخیبوونێکی ئاشتییانە نەبوو وەك ئەوەی خەواریج لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبدا کردی، بەڵکو یاخیبوونێکی سیاسی بووە.

ئا لێرەوە زۆرێ لە فیقهزانان، کوشتاری پاشگەزبووان وەك جەنگی یاخیبوون دەبینن، پێشەوا (خەتابی) ئەڵێ: "ئەوانەی ناوی پاشگەزبوویان لێ نرا دوو جۆر بوون: جۆرێکیان لە ئایین پاشگەزبوونەوە و لەکۆمەڵی موسڵمانان چوونە دەرەوە و گەڕانەوە سەر بێ باوەڕی و ئەوانەن کە ئەبوهورەیرە ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دەربارەیان ئەڵێت: "وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ العرب" کە هاوڕێکانی موسەیلەمەی درۆزن و ئەوانەی تریش کە گومانیان لە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بووە.

جۆری دووەم ئەو کەسانە بوون کە جیاوازییان دەکرد لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، ئەوان لەڕاستییدا وەك یاخییبووان دادەنرێن".[1]

کەواتە ئێمە لەبەردەم جەنگێکداین، لە روانگەی فیقهییەکەیەوە وەك جەنگی یاخییبووەکان سەیری کراوە، یاخییبوانیش لەلای زانایان خەڵکێکی دەستدرێژکار و دوژمنکارانەیە...

---

[1] لە کتێبی (اعلام السنن) ١/٧٤١، جۆری یەکەم لە قسەکانی خەتابییدا، لە روانگەی فیقهییەوە لە جۆری جەنگاوەرانن، وەك ئیبن حەزم لە کتێبی (المحلى)دا (١١/١٩٣) دەڵێ: "پاشگەزبووەکان دوو بەش بوون، بەشێکیان هەرگیز باوەڕی نەمابوو، وەك تاقمەکەی موسەیلەمە و سەجاح، ئەوانەی شەڕانی و پێشتریش باوەڕیان هەر نەهێنابوو".

شەڕکەرەکان ئەو دوژمنانەن لە دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامن ئەوان هەرگیز حوکمی گەلیان بەسەردا جێبەجێ نابێت بەپێی یاسا و بەپێی شەرعیش، کەواتە ئەم بەشە لە دەرەوەی باسەکەی ئێمەیە.

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە (ئەسوەد و موسەیلەمە و سەجاح) لە کەهەنەکانی گاوران بوون، وەختی خۆیشی هەر موسڵمان نەبووبوون و زۆرێ لە گاورەکانی عەرەبیشیان لەگەڵدا بوو، کە دواتر بوونە دووڕووەکانی عەرەبە دەشتەکییەکان.

مەبەستیش لەمە: ستەمکاران دەرچوون لە گوێڕایەڵی ئیمام (واتە دەسەڵاتی شەرعی کە ئوممەت لەسەری ڕێککەوتوون) دەستدرێژیی کارییەکەیان لەبەر ئایەتی قورئانە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾،[1] واتە: ئەگەر دوو تاقمی موسڵمان بوو بە شەڕیان سوڵحیان بکەن ئەگەر لایەکیان سەرکەشی کرد و یاخیی بوو، بە هەمووتانەوە لێ بدەن، .... تا کۆتایی ئایەتەکە.

هەموو هاوەڵانیش کۆدەنگ بوون لە ڕەوایی جەنگ لەگەڵیاندا، ئەبوبەکر جەنگی دژی ئەوانە ڕاگەیاند کە زەکاتیان نەدا، عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش جەنگی ڕاگەیاند لە جەمەل و صەفین دا.. کەواتە (بغاة) یاخییبووەکان لە ریزبەندی شەرعدا، دوژمن کارو دەستدرێژکار و ستەمکارن بەپێچەوانەی ستەملێکراوان و خاوەن مافەکانەوە، ئەوانە لەلای زانایان ناچنە خانەی یاخییبووانەوە.

ئیبن عابدینی حەنەفی ئەڵێ: "موسڵمانان ئەگەر لە پشت سەرۆکێکەوە کۆببنەوە و بە ئاسایشەوە بژین، لەم کاتەدا تاقمێك لە باوەڕداران دژیان بوەستنەوە ئەگەر لەبەر زوڵم و ستەمیان لێ کرابێت ئەوە لە یاخییبوونان هەژمار ناکرێن، ئیمام ئەبێ ئەو ستەمەیان لەسەر لابات و چاك بێت لەگەڵیاندا، نابێ میللەت هاوکاری ئیمام بن دژی ئەوانە، چونکە ئەوە پشتگیرییکردینی ستەمکارانە".

---

[1] الحجرات : ٩ـ ١٠.

مەبەست ئەوەیە ئەبوبەکری صدیق ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ کاتێ لەگەڵ پاشگەزبووەکاندا جەنگا بە مانای جەنگ لەگەڵ یاخییبووانداو یاخییبووانداپە، واتە جەنگ دژی دەستەیەك لە موسڵمانان لە ژێر دەسەڵاتی سیاسی وڵات ئەچێتە دەرەوە و یاخی ئەبێتو هەندێ داواکاری ئاینی جێبەجێ ناکات و یاساشکێنی ئەکات... بەڵام نە تەنها لەبەرئەوەی ئەرکێکی ئاینییان وازلێهێنابوو، بەڵکو پێویست بوونی جەنگ لەگەڵیان بەهۆی ملنەدان و یاخیبوونی چەکدارانە و دەرچوون لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەت و یاسادا بوو.

چونکە ئەگەر جەنگ دژی پاشگەزبوان تەنها لەبەر وازهێنانی فەرمانێکی ئاینی بووبێت، ئەوە جەنگ دژی خەواریجەکانی سەردەمی خەلافەتی عەلی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ پێویستتر بوو لە زەکات نەدانی هۆزە عەرەبەکان.

خەواریجەکان لە روانگەی ئاینیەوە تاوانەکەیان زۆر ترسناکتر و گەورەتر بوو لە تەنها زەکاتنەدان بە خەلیفەی موسڵمانان، ئەوان هاوەڵانی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) بەکافر و بێ باوەڕ دادەنا و عەلیشیان خستبووە ریزی کافران لەگەڵ شوێنکەوتووەکانیشی و نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەوەی گوناهە گەورەکانیش ئەنجام بدات هەر بە کافر ئەیاندایە قەڵەم!! خوێن و ماڵی موسڵمانانیان حەڵاڵ کردبوو و ئافرەتانیان دەکردە کەنیزەك... ئەوان بەم کارەیان زۆر لە پێش پاشگەزبووەکانی سەردەمی ئەبوبەکری صدیق ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ بوو، گوناه و تاوانەکەشیان زۆور گەورەتر بوو لە زەکاتنەدان.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نە عەلی و نە هاوەڵان، جەنگیان دژیان بەرپا نەکرد لەبەرئەو تاوان و سەرکەشییە ترسناکانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەقی ئایەتی قورئان و فەرموودەش هەبوو کە فەرمان دەکات بە جەنگ لەگەڵ ئەو

جۆرە کەسانەدا، کەچ لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵان - خوایان لیّ ڕازی بیّ - جەنگیان سەرەتا دژیان رانەگەیاند، وتە بەناوبانگەکەیان پیّ دەگوتن:

"لەسەرمانە سیّ شتتان بۆ بکەین، یەکەم: ڕێگری نوێژ و مزگەوتتان لیّ ناکەین کە یاد و زیکری خوای تیا ئەکرێت، دووەم: جەنگتان لەگەڵ راناگەیەنین لە پێشدا، سێیەم: لە دەستکەوتی جەنگی بیّ بەشتان ناکەین مادەم لەگەڵمان بن لەو جەنگانەدا".

بەڵکو عەلی و هاوەڵان - خوایان لیّ ڕازی بیّ - لەبەر یاخیی بوون و دەستدرێژییەکانیان بۆ سەر خەڵکی بە کوشتن و دزی و تاڵانی و تۆقاندن جەنگیان دژیان راگەیاند، واتە پاش ئەوەی لە دژی دەسەڵات و قانون وەستانەوە و ئەگەر  لەبەر دەستدرێژییان بۆ سەر خەڵك و دەرچوون لە یاسای وڵات نەبوایە هاوەڵان جەنگیان دژیان رانەدەگەیاند...

ئیبن قودامە ئەڵیّ: "ئەگەر هەر گەلێك راوبۆچوونی خەواریجیان هەڵگرتبێت، وەك کافرکردنی خەڵك بە گوناهە گەورەکان و وازهێنان لە کۆمەڵی موسڵمانان و حەڵاڵکردنی سەروماڵی موسڵمانان... لەگەڵ ئەمانەدا هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەدان و خوێنی کەسیان نەڕشتبوو، لە قازی ئەبوبەکرەوە رەحمەتی خوای لیّ بێت ئەگێڕنەوە وتوویەتی: "نابیّ بەو کارانە جەنگیان لەگەڵدا رابگەیەنرێت و ناکوژرێن، ئەمەش رای ئەبوحەنیفە و شافیعی و جمهوری ئەهلی فیقهە و لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیشەوە ریوایەت کراوە.

ئیبن موفلیح ئەڵیّ: "ئەگەر گەلێك هەمان رای خەواریجیان هەبوو، بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی ئیمام نەچووبوونە دەرەوە، جەنگیان لە دژ راناگەیەنرێت و

کەس دەست ناداتە رێگەیان و هەموو فەرمانەکان ئەوانیش ئەگرێتەوە، وەك ئەهلی عەدل و راستە رێگە و کۆمەڵێ زانا ئەمەیان باسکردووە".

(المروزي) لە ئیمام ئەحمەدی پرسی دەربارەی کەسانێك لە بیدعەچییەکان، باسی خەڵکی ئەکەن و خەڵکی کافر ئەکەن، لە وەڵامدا ئیمام وتوویەتی: دەستیان بۆ مەبەن، پێم وت: ئەی چۆنە زیندانی بکرێن؟ وتی: نەخێر، چونکە دایك و خوشکیان هەیە و خێزانیان بەسەردا کەوتووە، نابێ زیندانی بکرێن.

وردبەرەوە، سەیرکە چۆن ئیسلام مافی هاوولاتیيبوون دەستەبەر کردووە بۆ کەسانێك بەجۆرێ لایانداوە، بوون بە خاوەنی کۆمەڵێ بیری خراپ کە دەبێتە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی ولات و ئاشتی کۆمەلایەتی، وەك تەکفیرکردنی خەڵك و حەلاڵکردنی خوێنیان و شتانی تریش. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیسلام نەرمی نواندووە و لە ئامێزی گرتوون، مافی پاراستوون، کە مادەم پابەندن بە قانوونەوە و تاوانێکی واشیان نەکردووە کە شایانی سزا بن.

مەبەست لە هەموو ئەمانە، ئەوەیە کە ئەگەر ئەبوبەکر لەبەر نەکردنی فەرمانێکی ئاینی جەنگی دژی پاشگەزبووەکان راگەیاندبێت، ئەوکاتە جەنگ دژی خەواریجەکان شایانتر ئەبوو، بەلام هۆکاری ئەبوبەکر لەو جەنگانەدا بەهۆی رێگرییکردن و یاخییبوونی چەکدارانە کە دواجار دەبووە هۆی داڕمانی دەسەلاتی ولاتە تازەکە، هەروەها جەنگی عەلی ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ دژی خەواریجەکان لە دوای ئەوەوە بوو کە خەڵکیان کوشتو یاخییبوون و دزی و چەپاویان دەس پێکرد و دەستدرێژییشیان دەکردە سەر خەڵکی، تا

وایان لێهات بوون بە هەڕەشە بۆ سەر سیستەمی وڵات و ئاشتی کۆمەڵایەتی و ئاسایشی وڵات.

ئیبن قودامەش ئەڵێ: "ئەگەر پێمان بکرێت بەبێ جەنگ سەرکوتیان بکەین ـ واتە خەواریجەکان ـ نابێ جەنگیان لەگەڵدا بکەین، چونکە مەبەستەکە وازپێهێنانیانە نەك کوشتنیان و هەر مەبەستێك بەبێ کوشتار بێتەدی، پێویست بە جەنگ ناکات لەسەری، ئایەت و فەرمووده زۆرن لەسەر حەرامێتی رشتنی خوێنی موسڵمان و زانایانیش لەسەری کۆدەنگن، ئەوەشی جیاکراوەتەوە لەم فەرمانە ئەوەیە زۆر پێویستە رێگریی بکرێت لە دژی یاخییبوان و رێگران، لەوە بەدەر ئیتر حوکمی کوشتن و کۆدەنگی زانایان لەسەری وەك خوێن ئەمێنێتەوە، هەر لەبەر ئەمەش ئەسیر یان هەڵاتوو ناکوژرێت، برینداریان ئازار نادرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە بە هۆی لاوازی و شکستەوە وازیان لە جەنگ هێناوە و هەرکاتێ بەهێزبوونەوە دەست ئەدەنەوە چەکیش، جا کەسێك خۆی لە جەنگ لەگەڵمان بەدوور بگرێت و یان نەترسین دواتر جەنگمان لەگەڵ بکاتەوە پێویستترە، چونکە موسڵمانە".

کەواتە، جەنگ ناکرێت لەپێناو فیکرە و قەناعات و سەرچاوەگیریدا، بەڵکو بۆ پاراستنی سیستەمی وڵات و بەرقەراربوونی ئاشتی و جێگیرکردنی یاسا دەکرێت، دەی خۆ هیچ بیروباوەڕ و رێڕەوێك ترسناکتر و خراپتر و گەورەتر نییە تاوانەکەی لە رێڕەوی خەواریجەکان! لەگەڵ ئەوەشدا لەلای زۆربەی زانایان وازلێهێنانیان باشترە.

رووی سێیەم: ئێمە لە بەردەم دەوڵەتێکدا نین کە لە رووی سیاسییەوە تەواو و کامڵ بووبێت، یەکڕیزییەکەی دامەزرابێت و هەژموونی فراوان

کردبێت، بەڵکو ئێمە لە بەردەم کۆمەڵە هۆزێکداین کە پەرش‌و بڵاوبوون لەناو دوورگەی عەرەبیدا، هەر هۆزە و گەورەیەکی خۆی هەبوو، کە خاوەنی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی خۆی بوو، هەندێ لەو هۆزانە پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) مۆرکردبوو، هەندێکیشیان هیچ هاوپەیمانێتییەکیان مۆرنەکردبوو و هەندێکیان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا موسڵمان بوو بوون و هەندێکیشیان هێشتا باوەڕیان نەهێنابوو... زۆربەی ئەو هۆزانە زەکاتیان بە جابییەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەدا و هەندێکیشیان زەکاتیان نەئەدا، چونکە هەر لە سەرەتاوە موسڵمان نەبوو بوون.[1]

زەکاتدان بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەروەك بەندایەتییەکی خوای گەورەیە و بەشێکە لە گوێڕایەڵییکردنی، بەڵام لە لایەکی ترەوە وەك ئاماژەیەکی سیاسی وایە کە بەهۆیەوە هۆزەکان دەری ئەخەن سەر بە دەوڵەتی ئیسلامین لە مەدینە، بەڵام لەسەر ئاستی ناوخۆ هەموو هۆزێك دەسەڵاتی تایبەتی خۆی و سەرۆکی خۆی و سەربەخۆیی خۆی هەبووە.. کەواتە بە مانای نوێ دەوڵەتێك نەبووە، وەك ئەم دەوڵەتانەی ئەمڕۆ بەجۆرێ کە بە تەواوی دەستی بڕوات بەسەر نەخشەی دوورگەی عەرەبیدا. کەواتە ئێمە لە بەردەم دەسەڵاتێکی کلاسیکی سادەداین نەك لەبەردەم دەسەڵاتێکی سیاسی تێکەڵ و ئاڵۆز، وەك دەسەڵاتی مەدەنی هاوچەرخ لە دەوڵەتێکی نوێدا.

کەواتە نابێ ڕووداوێکی مێژوویی سیاسی بەم جۆرە و بەم وەسفانەی باسمانکرد بکرێتە پێوەر بۆ جۆر و وەسفێکی بە تەواوی جیاواز.

---

[1] حروب الردة في الإسلام، لا٦٥، غەیداء خەزنەکاتبی.

بۆیە کاتێ ڕووداوی (پاشگەزبوونەوە) لە سەردەمی هەردوو عومەردا ڕوویدا ـ عومەری کوڕی خەتتاب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ سیاسەتێکی زۆر جیاوازیان گرتەبەر لە سیاسەتەکەی ئەبوبەکری صدیق، ئەمەش لەبەرئەوەی هەم ڕووداوەکە جیاواز بوو، هەم بارودۆخ و هۆکارە مێژووییەکانیش جیاواز بوون.

ئەو ڕووداوانە پاشگەزبووەکانیان وازلێهێنا کە گەڕانەوە سەر ئاینەکەی پێشوویان و تەنها سەرانەیان ـ جزیە ـ لەسەر هێشتنەوە و حسابی ئەهلی زیمەی بۆ کردن و نە زیندانی کردن و نە ئازاریدان نە جەنگیشی دژیان ڕاگەیاند.

هەر بەو جۆرەش عومەر کوڕی خەتتاب لەگەڵ خەڵکی ـ تەستەر ـ دا جولایەوە کاتێ بێ باوەڕبوونەوە و هاوەڵە کۆچەرییەکان جەنگیان لەگەڵیان ڕاگەیاند و ئافرەتانیان کردن بە کەنیزەك، بەڵام عومەر فەرمانی دەرکرد هەموویان ئازاد بکرێن و بگەڕێنەوە سەر یاسای (جزیە)دان.

سەعیدی کوڕی مەنسوور لە سونەنەکەیدا ئەڵێ: "... خەڵکی تەستەر بەپێی ڕێکەوتن موسڵمان بوون و پاشان بێ باوەڕبوونەوە، کۆچەریان ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ دایان بەسەریاندا و ئافرەتانیان کردن بە کەنیزەك، بەڵام عومەر کوڕی خەتتاب ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ فەرمانی دا فەرمووی وازیان لێ بێنن با لەسەر ئایینە کۆنەکەیان بن و جزیەیان لێ وەربگرن و جیاوازی کرد لە نێوان سەرکردەکانیاندا".[1]

عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش بەهەمانشێوە لەسەر ئەم ڕێڕەوی عومەر کوڕی خەتتاب ڕۆیشت، عەبدوڕەزاق لە موصەنیفەکەیدا ئەڵێ: هۆزێك لە

[1] الاثر، ژمارە ٢٥٨٨.

کەنداوێکی عێراق موسڵمان بوون و پاش ماوەیەکی کەم پاشگەزبوونەوە، مەیمونی کوڕی مەهرانیش کە والی ناوچەکە بوو لەوبارەیەوە نامەیەکی بۆ خەلیفە عومەر نووسی و ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: "وازیان لێ بێنە و سەرانەیان لێ وەربگرنەوە".[1]

کەواتە، کاتێ ئێمە باسی رووداوی پاشگەزبوونەوە دەکەین، ئێمە لەبەردەم رووداوێکی تایبەتیداین، کە حوکمی تایبەتی خۆی هەیە، واتە لەبەردەم بنەمایەکی گشتییدا نین کە بەردەوام کاری پێ بکرێت.

رووی چوارەم:

ئێمە کاتێ رووداوی پاشگەزبوونەوە ئەخوێنینەوە، دەبینین ئێمە لەبەردەم گەلێکدا نین ـ گەل بە مانا هاوچەرخییەکەی ئەمڕۆ ـ کە کێشمەکێشی سەرچاوەی حوکمی وڵات بکات، یان داوای مافە سیاسییەکانی خۆی بکات، یان داوای لابردنی سەرۆکی وڵات بکات، بەڵکو ئێمە لەبەردەم کۆمەڵە هۆزە عەرەبێکی پەرتو بڵاوداین کە یاخییبوونێکی چەکدارانەیان ئەنجامدا و داوای جوداخوازییان ئەکرد، کە ئەمەش دەبێتە هۆکاری دارمانی وڵاتە تازە دروستبووەکە، کەواتە ئێمە لە بەردەم یاخییبوونێکی سیاسی چەکدارانەدا بووین، لە بەردەم داواکارییەکی جەماوەری ڕەوادا نین، لەبەرئەم هۆیەش بوو، کاتێ لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا ـ خوای لێ ڕازی بێ ـ کۆمەڵێك یاخییبوونیان راگەیاند، کە چ هەڵسوکەوتی عوسمان و چ هاوەڵانیش بەگشتی وەك هەڵسوکەوتی ئەبوبەکری صدیق نەبوو لەگەڵ پاشگەزبوانی سەردەمی خۆی.

ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

---

[1] الاثر، ژمارە ١٨٧١٤.

یەکەم: سیمای دەوڵەت بە روونی دیاربوو بە خیلافەتی ئیسلامییەوە لەسەردەمی عوسماندا بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکەی سەردەمی ئەبوبەکر، بەڵکو لەبەردەم جەماوەر و گەلێکی واداین کە ملکەچی تەواوی خۆیان بۆ وڵات رادەگەیاند، بەڵکو داوای مافێکی خۆیانیان ئەکرد، ئیتر رەوا بوو بێت یان نا.

دووەم: ئەو کۆمەڵە کۆمەڵێکی جوداخواز نەبوون، کە داوا بکەن بەشێك لە جەستەی وڵاتی ئیسلام جیاکەنەوە، وەك چۆن لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا روویدا، بەڵکو هەموو داواکارییەکیان لابردنی هەندێ والی و کاربەدەست بوو، پاشان داواکارییەکانیان - دوای ئاڵۆزبوونی رووداوەکان - بەرزکردەوە بۆ لابردنی (خەلیفە)، لەگەڵ ئەمەشدا - هەڵسوکەوت لەگەڵیان بەو جۆرە نەبوو کە ئەبوبەکر لەگەڵ پاشگەزبووەکاندا کردی، بەڵکو پێشوازی لێ کردن و گوێی بۆ داواکارییەکانیان گرت، پاشان بۆی نووسین هەموو ئەو شتانەی لەسەری رێك کەوتبوون و مەرجیان لێ گرتبوو.. پاشان دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەیانی خۆیان و لە رێگادا نامەیەکی ساختەیان پێگەیشت (کە گوایە عوسمان نوسیویەتی) بۆ ئەمیری میسر (ئیبن ئەبی سەرح)، کە گوایە هەرکە گەیشتەوە میسر بیانگرە و سزاشیان بدە.

بۆیە بەپەلە گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و داوای دەستلەکارکێشانەوەی خەلیفەیانکرد، یان کوشتنی!!.. بۆ چەند رۆژێك گەمارۆی ماڵەکەیان دابوو، هیچ یەکێکیش لە هاوەڵانیش جەنگی لەگەڵ نەکردن، تەنانەت کاتێ کە هەندێ لە نەوەکانی هاوەڵان و یستیان بەرگری لە عوسمان بکەن، بەڵام عوسمان رێگری لێکردن لە ترسی ئەوەی کە لە پێناوی ئەودا دڵۆپێك خوێنی موسڵمان نەڕژێت!

ڕووی پێنجەم:

ئەو هەڵوێستەی ئەبوبەکری صدیق تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، لە ڕووداوێکدا کە ئەویش تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، کە هەوڵو ئیجتیهادی خۆی کرد تیادا بەجۆرێ لەلای خۆی بەڕاستی ئەزانی، کە بەڕاستی دواتر دەرکەوت ڕاستیش بوو، بەڵام ئەو هەوڵە پشتی بە بنەمایەکی جێگیر و تۆکمە نەبەستبوو لەو مەسەلە فیقهییەدا، بەجۆرێ کە هیچ ڕەخنە و گازندەیەك هەڵنەگرێت، چونکە ئەگەر وابووبێت چ عومەر و چ هاوەڵانی تریش پەڵپو ڕەخنەیان لێ نەدەگرت.

ئیمام جویەینی ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەڵێ:

"... هەوڵو ئیجتیهادی پێشەوا لە هەر حوکمێکی شەرعیدا و لە مەسەلە بەگومانەکاندا، ئەگەر گەلێکی بۆ بانگ کرد، لەسەریان پێویست ئەبێت کە گوێڕایەڵی ئیمام بن، ئەگەر سەرپێچییان کرد، ئیمام بۆی هەیە جەنگیان لەگەڵدا بکات، وەك چۆن (صدیق) لەگەڵ پاشگەزبووەکان کردی، کاتێ وتیان زەکات نادەین و ئەوەش بەسەرهاتێکی مەشهوورە.

پاشان گوێڕایەڵییکردنی ئیمام و جەنگکردن لە پشتییەوە نابێ پشت بە حوکمێکی گوماناوی ببەسترێت.. چونکە نابێت دوو تاقمی موسڵمان بدرێت بە گژیەکتردا بە فەتوایەکی گومانی و لەسەر بۆچوون و پێمباشەیەکدا، چونکە جەنگ لەکاتێکدا دەکرێت لە مەسەلەیەکی یەکلاکراوەدا بێت، ئەو کاتە سەرپێچییکردنی ئیمام دروست نییە، ئیتر با ئەو مەسەلەیەی ئیمام گەلەکەی بۆ بانگ ئەکات لە بنەڕەتدا ـ گوماناوی بێت ـ هەر ئەبێ شوێنی بکەون، چونکە ئەگەر شوێنکەوتنی ئیمام لەو مەسەلانەدا کە بە ئیجتیهادی

خۆی ئەیکات جێبەجێ نەکرێت کەواتە هیچ یەکێك لە مەسەلە ئیجتیهادییەکان ناخرێن بەلایەکدا". [1]

کەواتە، ئێمە لەبەردەم هەوڵێکی فیقهی - ئیجتیهادی جوزئی - داین، کە بۆ ڕووداوێکی تایبەت و بارێکی مێژوو‌ییدا بووە، نابێ ئەم ئیجتیهادە بەشییە - جوزئییە - بەرز بکەینەوە بۆ ئاستی ئیجتیهادی گشتی.

بە مانای وەرگرتنی بنەماو ئوسولی گشتی لە سیاسەتی شەرعیدا تەنها لە نیگا و وەحییەوە سەرچاوە ئەگرێت، نەك لە شارەزایی سیاسەتی مێژووییی سەردەمی هاوەڵان - خودایان لێ ڕازی بێ - چونکە ئەو شارەزاییە بە تەواوی پەیوەستە بە بارودۆخ و هۆکارە مێژووییەکانی ئەو قۆناغە.

شارەزایی سیاسییانەی هاوەڵان - لە کۆتاییدا بەرجەستەکردن و جێبەجێکردنی ئەو بنەما و بناغە گشتییانەی کە کار دەکاتە سەر کردەی سیاسی. کەواتە نابێ بە هیچ جۆرێك کردەی سیاسی مێژوویی لەگەڵ بنەما گشتییەکاندا کە کار ئەکاتە سەر کردەی سیاسی، تێکەڵ بکەین.

ئا لێرەدا جیاوازییەکی سروشتی دروست بوو لە نێوان سیاسەتی ئەبوبەکر و سیاسەتی عومەردا لە هەندێ لە ڕووداوەکاندا، هەروەك نێوان سیاسەتی عوسمان و سیاسەتی عەلی - خودایان لێ ڕازی بێ -، بەڵام بنەما گشتییەکان لەلای هەموویان هەریەك شت بوو بەپێچەوانەی سیاسەتی جێبەجێکردنەوە.

دواتر، دروست نییە ئەم ئیجتیهادە بەشییە مێژووییە، وەربگرین و وەك بنەمایەکی گشتی کاری پێ بکەین، بەڵکو هەندێ لە لێکۆڵەرەوان ئەم ئیجتیهادە بەشییە مێژووییە بەجۆرێ وەردەگرن کە بەرامبەر ئایەتەکانی

---

[1] الجويني، الغيائي، ل٣٥٠.

سەرپشککردن دەوەستنەوە، یان بەرامبەر کارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەوەستنەوە کە لە مەککە و مەدینە کردی، کە ئەوەبوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە فەتحی مەککەدا شمشێری هەڵنەکێشا و بە شمشێریشەوە نەچووە شاری مەدینە.. هەروەها ناشبێت بەم ئیجتیهادە بەشییە بەرامبەر ئەوە بوەستینەوە کە یوسف سەلامی خوای لێ بێ و نەجاشی - خوای لێ ڕازی بێ - کردیان لەگەڵ گەلەکەیاندا کە کافر و بێبڕوایش بوون.

یان بوەستینەوە پێیان بەرامبەر هەڵوێستی سێ خەلیفە راشیدەکەی تر - عومەر و عوسمان و عەلی - - خودایان لێ ڕازی بێ - کە لە سەردەمەکانی هەریەکەیاندا جۆرە پاشگەزبوونەوە و یاخییبوونی سیاسی روویداوە و کەچی کەسیان وەك سیاسەتەکەی ئەبوبەکریان نەکرد.

ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئیجتیهادەکەی (صدیق) راستو دروست نەبووە، بەڵکو بێگومان راست بووەو پێکاویەتی.. کە دواتر هەموو هاوەڵان هاتنە سەر رایەکەی ئەو، چونکە نازانین حاڵی دوورگەی عەرەبی و حاڵی ئیسلام چی بەسەر ئەهات ئەگەر ئەو بڕیارە راستو دروستەی ئەبوبەکر نەبوایە... بەڵام هەرچۆنێ ببێ، ئیجتیهادێکی بەشییە و بۆ رووداوێکی مێژوویی دیاریکراو بووە، نابێت بە ئەصڵ و بنەمایەکی گشتی لە باسی سیاسەتدا.

**رووی شەشەم:**

ئەوەی ئەبوبەکری صدیق کردی، عومەری کوڕی خەتتاب لە بەرامبەری وەستایەوە و بەڵکو هەموو هاوەڵانیش ناڕازیی بوون، نەك هەر ئەوە، بەڵکو گفتوگۆ و وتوویژ کەوتە نێوانیان، کە لە ئاکامدا هەموو هاوەڵان هاتنە سەر بۆچوونەکەی ئەبوبەکر...

کەواتە، ئێمە لەبەردەم بۆچوونو ئیجتیهادێکی بەشییداین کە بێگومان راستو دروست بوو، بەڵام لەبەردەم فەرمانێکی ئایینی یەکلایی و جێگیردا نین کە فەرزی بکات لەسەر هاوەڵان شەڕ لەگەڵ پاشگەزبوواندا بکات، بەڵکو تەنها بەرژەوەندییەکی سیاسی بۆ ئیسلام و موسڵمانانی دوورگەی عەرەبی تێدا بوو.

کەواتە بەڵگەی تێدا نییە کە راستەوخۆ لەگەڵ گەلدا بجەنگین تەنها لەبەر ئیجتیهاد و کردەیەکی ئەبوبەکری صدیق لە رووداوێکی تایبەتیدا کە هۆکار و بارودۆخ و کاریگەری تایبەتی خۆی هەبووە.

# ڕەخنەی پێنجەم
# جیهادی جەنگ و سەربەستی ئیرادەی گەلان

- ١ -

لەوانەیە برای ڕەخنەگر بڵێت:

"ئەی چی ئەڵێی بەرامبەر جیهادی جەنگی، ئایا بەزۆر پابەندکردنی گەلانی دونیای تێدا نییە بە شەریعەتی ئیسلامی؟ ئایا ئەمە پێچەوانە نییە لەگەڵ سەروەری گەلاندا؟".

وەڵام:

بەڵێ، بێگومان - جیهادی جەنگی - بەم واتایەی پێچەوانەیە لەگەڵ سەروەری گەلو ئوممەتدا، ئەگەر ئامانج لێ بەزۆر پابەندکردنی گەلان بێت لە شەریعەتی ئیسلامو سەپاندنی بەسەریاندا لە ڕێگەی زەبر و زەنگ و هێزەوە. بەڵام ئایا ئەمە هۆکاری جیهادە لە ئیسلامدا؟ ئایا ئامانجی جەنگ لە ئیسلامدا بۆ ئەوەیە گەلان بەزۆر بێنە ناو ئیسلامو بەزۆر شەریعەتیان بەسەردا جێبەجێ بکرێت؟

لەڕاستییدا ئەوەی بە وردی سەرنجی ئایاتی جەنگ لە قورئاندا بدات، تێدەگات بە ڕوونی، کە هۆکاری جەنگ لە ئیسلامدا ناچارکردنی گەلان نییە تا بەزۆر بیانکەن بە موسڵمان. جەنگ لە ئیسلامدا هۆکار و پاساوی خۆی هەیە کە ناکرێ و نابێ هەرگیز دژ و پێچەوانەی بنەمای (لا اكراه في الدين) بوەستێتەوە، یان لەگەڵ سەرجەم ئەو ئایەتانەی باسی سەرپشککردن ئەکات کە لە قورئاندا زۆر زۆرن وەك چۆن دواتر باسی ئەکەین.

لەسەر ئەم بنەمایە ـ ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ـ دامەزرابوو، لە فەتحی مەککەدا زۆری نەکرد لە بتپەرستەکان تا ناچار بن ببنە موسڵمان، بەڵکو بەرەڵای کردن و خستییە ئارەزووی خۆیان.

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: "پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) منەتباری کردن و زۆری لێ نەکردن موسڵمان بن، بەڵکو دوای ئەوەی دەستی رۆشت بەسەریاندا هەموویانی ئازاد و بەرەڵا کرد، بۆیە بە موسڵمانەکانی فەتحی مەککە ئەڵێن (الطلقاء) واتە ئازادکراوان. بەرەڵایش پێچەوانەی دیلکراوە، بەوەدا دەرئەکەوێت کە ئەوان ئەسیر بوون، ئەویش بەرەڵای کردن وەك چۆن دیل ئازاد و بەرەڵا ئەکرێ، زۆریشی لێنەکردن بۆ موسڵمان بوون، تەنانەت صەفوانی کوڕی ئوممەییە و چەندان بێ باوەڕی تر بە بێباوەڕی مانەوە تا ئەوەبوو بەشداریی جەنگی حونەینیشیان کرد لەگەڵیدا، بەبێ ئەوەی زۆریان لێ بکات و بەخۆشی خۆیان موسڵمان بوون، دەی چی تر لەمە روون و جوانترە کە بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی هەرگیز زۆری لە کەس نەکردووە تا ببنە موسڵمان".[1]

پاشان ئەڵێ: "گاورانیش هەرگیز هێرشو پەلاماری نەداون، تا لە دوای رێککەوتتنامەی حودەیبییە پەیامنێری خۆی نەنارد بۆ لای یەکبەیەکی پاشاکانیان و بانگی ئەکردن بۆ موسڵمان بوون، ناردی بۆ قەیسەر، کیسرا، مقەوقس، نەجاشی و شانشینە عەرەبەکانی رۆژهەڵات و شام، ژمارەیەك لە گاورەکانی و خەڵکانی تریش هاتنە ناو ئیسلام، تەنانەت گاورەکانی شام هەندێ لەو کەسانەشیان کوشت کە موسڵمان بوو بوون لە گەورە پیاوانی مەعان".

---

[1] قاعدة مختصرة في قتال الكفار ومهادنتهم وتحريم قتلهم لمجرد كفرهم، ل١٣١.

کەواتە گاورەکان جەنگیان دژی موسڵمانان ڕاگەیاند و دەستیانکرد بە کوشتنی ئەو کەسانەی ناوخۆیان کە موسڵمان بوو بوون بە ستەمو ناڕەوایی، ئەگەرنا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەنها لە ڕێگەی پەیامنێر و نامەوە و بەبێ ناچارکردن و زۆرلێکردن، داوای لێدەکردن موسڵمان ببن و زۆری لە کەسیان نەکرد تا بێنە ناو ئیسلامەوە.

ئەوەبوو کاتێ گەورەکان دەستیان کرد بە کوشتنی موسڵمانە نوێیەکان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پەلێکی بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریسە و جەعفەر و ئیبن ڕەواحە نارد بۆیان و لە موئتەدا یەکەمین جەنگی ئیسلام و گاورەکان بەرپا بوو لەسەر زەوی شام".[1]

فەرموودەی: "أمرت أن أقاتل الناس حتى تشهدوا ان لا اله الا الله واني رسول الله، فاذا فعلوا ذلك عصموا مني دمائهم واموالهم الاّ بحقها وحسابهم على الله".

مەبەست لە خەڵکی لێرەدا: بێ باوەڕە جەنگ هەڵگیرسێنەرە دەستدرێژکارەکانن ئەوانەی نایەڵن بانگەوازی ئیسلام بگاتە کەس ـ وەك پێشتر باسمانکرد ـ نەك مەبەست لێی سەرجەم بێ باوەڕ و بتپەرستان بێت.. دەی ئەم جۆرە لە خەڵکی ڕەوایە جەنگ لەگەڵیاندا تا موسڵمان ئەبن و ئەگەر موسڵمان بوون و حەرامە بێت جەنگ لەگەڵیاندا، خۆ مەبەست ئەوەنییە کە جەنگیان لەگەڵدا ئەکرێت بۆ ئەوەی موسڵمان ببن.

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: "مەبەستی ئەوەبووە کە دروستە جەنگ لەگەڵیان لەوکاتەدا، بەجۆرێ ئەگەر ئەوەیان کرد ئیتر دروست نییە جەنگ کردن لەگەڵیاندا"، پاشان ئەڵێ: "مەبەست ئەوە نییە، کە بڵێ من فەرمانم پێ

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، لا١٣٥.

کراوە جەنگ لەگەڵ هەرکەس بکەم تا موسڵمان دەبن، چونکە ئەمە پێچەوانەی دەقەکان و کۆدەنگی زانایانە و هەرگیز لە ژیانیدا ئەمەی نەکردووە، بەڵکو هەموو ژیانی وابووە هەرکەس دەستی ئاشتی درێژکردبێت جەنگی لەگەڵدا نەکردووە".[1]

ئیبن قەییمیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەمە دووپات ئەکاتەوە لە باسکردنی ڕێنموونییەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەمبارەیەوە و ئەڵێ: "هەرگیز زۆری لە کەس نەکردووە بۆ موسڵمان بوون، بەڵکو تەنها جەنگی لەگەڵ ئەوانەدا کردووە کە جەنگیان لەگەڵ کردووە، بەڵام ئەوانەی ئاشتی و ئاگربەست بووبێت لە نێوانیان، نە جەنگی لەگەڵ کردوون و نە زۆریشی لێ کردوون بۆ هاتنە ناو ئیسلام، ئەمەش وەك ملکەچییەك بۆ فەرمانی پەروەردگاری کە پێی ئەفەرموێت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾، ئەم نەفییەش بۆ نەهییە، واتە زۆر لە کەس نەکەن بۆ هەڵبژاردنی ئاین.. ئەوەشی لە ژیاننامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ورد بێتەوە بۆی دەرئەکەوێ کە هەرگیز زۆری لە کەس نەکردووە بۆ موسڵمان بوون، بەڵکو تەنها جەنگی لەگەڵ ئەوانەدا کردووە کە جەنگیان لەگەڵدا ڕاگەیاندووە، بەڵام ئەوانەی ڕێککەوتن و هودنەی هەبووە لەگەڵیان جەنگی لەگەڵ نەکردوون مادەم لەسەر بەڵێن و ڕێککەوتن بەردەوام بوون.

بەڵکو خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە کە مادەم ئەوان بەڵێن پارێزن تۆش بەڵێنی خۆت بەرەسەر.. ئەوەبوو کە ڕۆشتە شاری مەدینە و لەگەڵ جولەکەکان ڕێککەتنی کرد و لەسەر ئاینی خۆیان هێشتنییەوە، ئەو کاتە جەنگی لەگەڵ کردن کە ڕێککەوتن نامەکەیان شکاند و ناپاکییان لەگەڵدا کرد

[1] هەمان سەرچاوە، ل٩٥.

و جەنگیان بەرامبەری ڕاگەیاند.. لەگەڵیان جەنگاو هەندێکیانی ئازاد کرد و هەندێکی تریانی دوورخستەوە و هەندێکیشی لێ کوشتن، هەر بەو جۆرەش بوو کە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لەگەڵ قوڕەیشییەکان ڕێککەت کە ئاشتی بێت لە نێوانیان و جەنگی لەگەڵ نەکردن تا ئەوان جەنگیان بەرامبەر ڕاگەیاند و پەیمانەکەیان شکاند، جا ئەو کاتە هێرشی کردە سەریان لەناو ماڵی خۆیاندا کە پێشتر لە ئوحود و خەندەقدا ئەوان هێرشیان ئەکردە سەر شاری مەدینە و لە جەنگی بەدریشدا ئەوان بۆ جەنگ هاتن و ئەوەبوو کە وازیان هێنا پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) واز لێ هێنان.

مەبەست لەم وتانە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) هەرگیز زۆری لە کەس نەکردووە بۆ هاتنە ناو ئیسلام، بەڵکو هەموو خەڵکی بە ئارەزووی خۆیان و بە خۆشی خۆیان موسڵمان بوون". [1]

لەسەر ئەم بەرنامە و پرۆگرامە، دواتریش چوار خەلیفە ڕاشیدەکانی دوای خۆی بەردەوام بوون وەك ئیبن تەیمیە ئەڵێت: پاشان خەلیفەکانی دوای ئەویش ئەبوبەکر و عومەر و سەرجەم کۆچەریان و پشتیوانان، کە ئاشکرایە ئەو جیلە شوێنکەوتەترین کەسی پێغەمبەری خوا بوون و گوێڕایەڵترینیش بوون و پارێزەرترین کەسیش بوون بۆ پەیمانەکەیان لەگەڵیدا، جەنگی ڕۆمو فارسیان کردو جەنگی جوولەکە و گاوریان کرد و جەنگی ئاگرپەرستانیان کرد، تەنها لەگەڵ ئەوانەدا جەنگان کە جەنگیان لەگەڵ ئەکردن..". [2]

---

[1] هدایة الحیاری، ١٢/١.

[2] مجموع الفتاوى، ٣٠٥/٤.

هەندێ کەس سەیرە بەلایەوە کاتێ ئەڵێین: لە مەبەستەکانی جەنگ لە ئیسلامدا، ئەوەیە بنەمای - سەروەری گەل - بچەسپێت، ئەمەش لە ڕێگای پاراستنی مافی سەربەستی (هەڵبژاردن) لەوەی کە لێی زەوت بکرێ، یان بدزرێت، یان پێشێل بکرێت.. یان بە دەربڕینی قورئانی کە ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ...﴾، واتە: جەنگ بکەن لە پێناوی خوا تا فیتنە و خراپەکاری لەبەین دەچێت.

ئیبن تەیمیە ئەڵێت: "- لەو ئایەتەدا - مەبەست لە فیتنە واتە سزادانی خەڵکی لەسەر موسڵمان بوون وەك چۆن بێ باوەڕانی مەککە سزای ئەو هاوەڵانەیان ئەدا کە موسڵمان ئەبوون، ئەو کاتە فەرزە جەنگ کردن لەگەڵیاندا تا سزا و ئەشکەنجەو خراپەکاری بەردەوام نەبێت و موسڵمانان ناڕەحەت نەکرێن و ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە موسڵمانان توانای بەرگرییان لە خۆیان نەبێت و نەیفەرمووە: "جەنگیان لەگەڵدا بکەن تا موسڵمان ئەبن".[1] (فتنة) لێرەدا ماناکەی پڕاوپڕ لەو شێوە یاساو بەڵێننامە نێودەوڵەتییانەی ئەمڕۆ ئەچێت، کە ناونراوە (چەوساندنەوەی ئاینی) کە پاساوی جەنگە بەڵکو پێویستە هەموو وڵاتانی جیهان بۆ ڕزگارکردنی ئەو گەلانە ئامادە بن کە لەسەر ئایین ئەچەوسێنەوە[2] و ئەم ئامادەباشییەش لە ڕوانگەی ڕەوشتبەرزییەوە و رووپۆشێکی یاسایی و سیاسیشی هەیە.

---

[1] قاعدة في قتال الكفار، ل٩٢.

[2] وەك ئەوەی ئەمڕۆ بە دڕندانەترین شێوە موسڵمانەکانی بۆرما ئەچەوسێنرێنەوە و ئەیانکوژن.... ئەسووتێنرێن...

مەبەست لە جەنگەکانی ئیسلام: یەکەم: بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکارییەکان، دووەم: لەبەر لابردنی ستەمو چەوساندنەوەی ئاینی، و رزگارکردنی ویستو ئیرادەی گەلان و لابردنی زوڵمو ستەم و بەربەستییەك کە نەهێڵێ گەلان گوێبگرن بۆ ئیسلامو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

بەڵێ، رایەکی فیقهی کۆن هەیە، دەڵێ مەبەست لە جیهاد لە ئیسلامدا (بێ باوەڕ) بوونە، نەك جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنان، واتە هەر بەوەی کەسەکە بێ باوەڕ بێت بەسە بۆ ئەوەی جەنگی لەگەڵدا بکرێت ـ ئەگەر رێوشوێنی گونجاو لەباربوو ـ تا موسڵمان ئەبێت یان ئەکوژرێت.

ئەم رایە فیقهییە هی هەندێ لە زانایانە، بەڵام جمهووری زانایان لەسەر ئەوەن کە: هۆی هەڵگیرسانی جەنگ لە ئیسلامدا (مقاتلة) بەواتا بەرامبەر دەستدرێژی نەکات و جەنگ رانەگەیەنێت ئێمە نابێ جەنگ بکەین، ئەم رایەش ئیبن تەیمیە و قوتابییەکەشی (ئیبن قەیم) ـ بەڕەحمەت بن ـ و کۆمەڵێ تر لە لێکۆڵینەرەوان ئەم رایەیان لاپەسەندە.

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: (یەکلاکەرەوەیی لە جەنگی بێ باوەڕان لە نێوان دوو رای جیاوازدا، کە ئایا هۆکارەکەی تەنها لەبەر بێ باوەڕی بێ باوەڕەکانە یان لەبەر هۆکاری وەڵامدانەوەی جەنگ راگەیاندنی بێ باوەڕانە... دوو ڕای هەیە:

یەکەم: رای جمهوری زانایان کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەبی حەنیفە و کەسانی تری لەسەرە.. (کە هۆکارەکەی جەنگە لە دژی دوژمنایەتی و دەستدرێژکاری بێباوەڕانە بەرامبەرمان).

دووەم: رای ئیمامی شافیعییە، کە دەڵێ هۆکاری جەنگ لەبەر بێ باوەڕی بێ باوەڕانە.

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: "ئەو رایەی جمهور بەهێزە و بەڵگەی قورئان و فەرموودە و پەیڕەوکردن خوای تەعالا ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾، واتە: لە پێناوی خوا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵتان جەنگ ئەکەن. یان ئایەتی (١٩٠)ی (البقرة)دا ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾،[1] واتە: لە پێناوی خوادا بجەنگن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لەگەڵتان ئەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی نەکەنە سەریان... کەواتە حوکمەکە دیارە بۆ ئەو کەسانەیە جەنگمان لەگەڵدا ئەکەن، ئەمەش مەبەستو هۆکاری رێگەدانە بە جەنگ لە ئیسلامدا.

وشەی (وَلاَ تَعْتَدُواْ) واتە لەو سنوورە لا مەدەن ئەگەر لاتان دا ئەوە کاری دەستدرێژکارانە و دژومنکارانەیە).[2]لە شوێنێکی تردا ئەڵێ: "بێ باوەڕان ـ بە مەرجی ـ جەنگکردنیان، جەنگیان لەگەڵدا ئەکرێت، وەك چۆن جمهووری زانایان بۆی چوون، وەك قورئان و سوننەیش ئەمە ئەگەیەنن، کە لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسی لێوەکراوە".[3] لە (صارم المسلول)یشدا ئەڵێت: "خوای تەعالا لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾،[4] واتە: فەرمانی کردووە بە جەنگ لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگمان لەگەڵدا ئەکەن، کەواتە مەرجی جەنگکردن ئەوەیە بەرامبەر جەنگمان پێ بفرۆشێت).[5]

---

[1] البقرة : ١٩٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٩٠.

[3] النبوات، ل١٤٠.

[4] البقرة : ١٩٠.

[5] الصارم المسلول، ٥١٣/٢.

له کتێبی (السیاسة الشرعیة)دا ئەڵێت: "جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا بکەین کە جەنگمان لەگەڵدا دەکەن کاتێ بمانەوێ ئاینی خوا باس بکەین بۆ خەڵکی و ئەوان نەیەڵن، وەك چۆن خوای تەعالا ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾".[1]

کەواتە هۆکاری جەنگ لە ئیسلامدا، هێرش و دەستدرێژیی دوژمنانە و شەڕکردنیانە لەگەڵماندا، نەك لەبەرئەوەی کە بێ باوەڕن یان جیاوازیان هەیە لەگەڵماندا لە ئاین یان مەزهەب و تایفەگەریدا و لەم حاڵەتانەدا نابێت بە هیچ جۆرێك جەنگ بەرپا بکرێت.

ئەگەر ئاشتیمان مۆرکرد لەگەڵ بێ باوەڕاندا و ئەوانیش جەنگیان لەگەڵ ئیسلام نەدەکرد و موسڵمانی ژێر دەستیشیان نەئەچەوساندەوە، یان جیاوازییان هەیە لەگەڵماندا لە ئاین یان مەزهەب و تایفەگەریدا و لەم حاڵەتانەدا نابێت بە هیچ جۆرێك جەنگ بەرپا بکرێت.. ئەگەر ئاشتییمان مۆرکرد لەگەڵ بێ باوەڕاندا و ئەوانیش جەنگ یان لەگەڵ ئیسلام نەدەکرد و موسڵمانی ژێردەستیشیان نەئەچەوساندەوە، ئەوکاتە بەپێی شەرع پێویستە لەسەرمان ئەو پەیمان و رێککەوتنانە بپارێزین لەبەر وتەی خوای پەروەردگار کە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾[2]، واتە: ئەی باوەڕداران گرێبەست و رێکەوتنەکان بپارێزن.

ئیبن تەیمیە ئەڵێت: (مەبەست لە جیهادی ـ جەنگی ـ بەرزڕاگرتنی ناوی پەروەردگار و ئاینی پاك و دروستیش تەنها بۆ خوا بێت و فیتنە و سزا و ئەشکەنجە روونەدات بەهۆی جیاوازی ئاینییەوە، بەڵکو تەنها جەنگ لەگەڵ

---

[1] السیاسة الشرعیة، ل١٠٤.

[2] المائدة: ١.

ئەوانەدا دەکرێت کە بەرگری دەکات لەو شتانەی سەرەوە، کە ئەوانەش جەنگکەرەکانن، بەڵام ئەوانەی بەشداری جەنگ ناکەن بۆمان نییە بیانکوژین).[1] بەڵام ئەگەر ئەوان دەستپێشخەری جەنگ بوون لەگەڵ موسڵماناندا، یان ڕێگرییان ئەکرد لەوەی ئاینی پاکی ئیسلام بڵاوبێتەوە و ئەو کەسانەشیان ئەکوشت کە بێ چەك بوون، ئەوە ئەو دەستدرێژییەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە.

ئیبن تەیمیەش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هۆکارێکی جوانی فەلسەفی ئاشکرا ئەکات بۆ هۆکاری جەنگ لە ئیسلامدا و ئەڵێ: "هەرکەسێ ڕێگری نەکات لە بەرپاکردنی ئاینی خوا ئەوە بێ باوەڕیەکەی زیانی بەس بۆ خۆی هەیە".[2] بە مانای ئەوەی کە زیانی بێ باوەڕی ئەگەر پەیوەند بێت بەو کۆمەڵگاوە کە باوەڕیان بە ئیسلام نەهێناوە، بەڵام لە سنوور لای نەداوە و نەگەشتۆتە ئاستی دژایەتییکردن و جەنگ دژی ئیسلام.. ئەوکاتە بێ باوەڕییەکەیان زیانەکەی تەنها بۆ خۆیانە و دروست نییە جەنگکردن لەگەڵیاندا، چونکە ئەچێتە خانەی ئەو دەستدرێژییە دوژمنکارانەیە کە خوای تەعالا بەرگری لێ کردووە.. جیهاد و جەنگیش تایبەتە بە دەستدرێژییکردنی بێباوەڕان نەك پەیوەند بێت بە زیانی بێ باوەڕیەکەیان.

---

[1] الصارم المسلول، ٢/٥١٤.

[2] مجموع الفتاوى، ٣٥٥/٢٦.

هەموو ئایەتانەی قورئان دەربارەی جەنگ هاتۆتە خوارەوە، هەر هەموویان بە راشکاوی ئەوە ئەگەیەنێت کە هۆکاری جەنگ، جەنگکردن و دوژمنایەتییە، نەك بێ باوەڕی یان لەبەر موسڵمانکردنی بەزۆری خەڵکی.

لەوانە وتەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ * وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ * فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.(١)

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی پێشوو واتایەکی راستەوخۆ ئەدەن بەدەستەوە سەبارەت بە هۆکاری جەنگ لە ئیسلامدا، تایبەتە بەو کەسانەی کە لەگەڵمان ئەجەنگن، پاشان هەر لەو ئایەتەدا بەرگری ئەوەمان لێ ئەکات کە نابێ سنوور ببەزێنین و دەستدرێژیی بکەینە سەر بێ باوەڕان واتە بەبێ ئاگایی خۆیان بدەین بەسەریاندا، چونکە خوا دەستدرێژییکارانی خۆش ناوێت.. پاشان هەر لەو ئایەتەدا ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە دەرپەڕاندنی خەڵك لە ماڵ و حاڵی خۆیان و ترسانو تۆقاندنیان و زۆرلێکردنیان بۆ کافربوون و ترساندنی ماڵو منداڵەکانیان ئەوە فیتنە و ئەشکەنجەیە و لە کوشتن ترسناکترە. بە مانای ئەوەی خراپەی (چەوساندنەوەی ئاینی) گەورەترە لە خراپەی کوشتن.. (الطبري) لەم بارەیەوە ئەڵێ: قسەکە بەم مانایەیە: "ئەشکەنجەدانی باوەڕدار لە پێناو پەشیمانکردنەوەی لە ئاینەکەی و بیکەنەوە بە هاوبەش پەیداکەر بۆ خوا دوای ئەوەی کە موسڵمان بووە

---

(١) البقرة : ١٩٠ـ ١٩٢

(چەوساندنەوەی ئاینی) ناڕەحەتتر و زیان بەخشندە لەوەی کە موسڵمانێك بکوژێت لەسەر ئەوەی کە سوورە لەسەر موسڵمانەتیەکەی).[1]

ئایەتەکە یاسایەکی تێروتەسەل لە خۆی دەگرێت کە ڕێڕەوی جەنگ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دیاری دەکات کە لەم خاڵانەدا خۆی ئەبینێتەوە:

١ـ فەرمان دەدات بە جەنگ لەگەڵ جەنگاوەراندا و بەس.

٢ـ بەو شێوەی ئەوان دەجەنگن دەبێت وەڵامیان بداتەوە.

٣ـ لە مانگە پیرۆزەکاندا ئەبێ جەنگ بوەستێت مەگەر لە حاڵەتێکدا کە ئەوان بەردەوام بن لەسەر جەنگ، ئەگەر بەردەوام جەنگیان نەئەوەستاند ئێمەش نایوەستێنین.

٤ـ وەستانی جەنگ ئەو کاتە ئەبێ کە بێباوەڕان جەنگ ئەوەستێنن و واز لە دوژمنکاری ئەهێنن و سەربەستی بۆ خەڵکی ئەگێڕنەوە و سزا و ئەشکەنجەی موسڵمانان نادەن لەسەر موسڵمانەتی و هەوڵی پاشگەزبوونەوەیان نادەن.

٥ـ ئەگەر دووبارە زوڵم و ستەمیان دەست پێ کردەوە، جەنگ دەست پێ ئەکاتەوە وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ دەستدرێژکارییەکەیان.

٦ـ ڕەدی دەستدرێژیی ئەبێت وەك خۆی و بەقەدەر خۆی بێتو دروست نییە زیاتر بێت یان ئێمە دەستپێشخەر بین بۆی.

بەم شیکردنەوەیەدا تێبینی ئەوە ئەکەین کە ئامانج لە جیهادی جەنگی لەم ئایەتەدا ئەوە نییە کە خەڵکی بخەینە ناو بازنەی ئاین یان زۆریان لێ بکەین بۆ ئەو مەبەستە، بەڵکو مۆڵەتی جەنگ دراوە بەهۆی دەستدرێژییکردنە سەر موسڵمانان یان دەرکردنیان لە ماڵ و حاڵیان یان

---

[1] تفسير الطبري، ٢/١٩٧.

هەوڵدان بۆ پاشگەزبوونەوەیان لە ئاین لە ڕێگای ئەشکەنجەدان و سزا و ناڕەحەتکردنەوە.[1]

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ * الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ * الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾.[2] ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاستەوخۆ ئەوە ئەگەیەنێت کە هۆکاری ڕێگەدان بە جەنگ لە ئیسلامدا، ئەو زوڵمو زۆرەیە کە ڕووبەڕووی موسڵمانان دەبێتەوە وەك چەوساندنەوەی ئاینی، دەرکردنیان لە ماڵ و حاڵیان، ئاوارەکردن و دەستدرێژییان بکرێتە سەر. ئایەتەکان بە ڕوونی باس لەوە ئەکات کە جەنگ لە بەرامبەر زوڵمو ستەمدا ڕێگەی پێدراوە و کە لە دوو شێوەدا خۆی دەبینێتەوە:

یەکەم: شکاندن و نەهێشتنی سەربەستی و دانیشتنی پڕ لە ئاشتی و سەقامگیری لە وڵاتدا و دیاریکردنی چارەنووس تیایدا (الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ).

دووەم: شکاندن و نەهێشتنی سەربەستی باوەڕداری و سەربەستی ئایینداری: (إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ).

---

[1] عبدالرحمن الحلي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٤.

[2] الحج : ٣٩ـ ٤١.

ئەگەر ستەم بەم شێوەیە بکرێت، ئەو کاتە جەنگ مافێکی ڕەوایە بۆ پاراسنی سەربەستییەکان، بەتایبەت سەربەستی بیروباوەڕ و ئاینداری.[1]

لەوبارەیەوە دیسان وتەی خوای تەعالایە کە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.[2]

ئەم ئایەتانەیش زۆر ڕاشکاوانە و یەکلاکەرەوانە باس لە پەیوەندی موسڵمانان بە غەیری خۆیانەوە دەرئەخات، کە پەیوەندییەکە لەسەر بنەمای ئاشتی بەرپا دەبێت، نەك جەنگ، جەنگ حاڵەتێکی کتوپڕییە و نەخوازراو بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا دێت، هەڵسوکەوتی ئاشتییانە و هاوکاری و ڕێزی دوو لایەنە بناغەی هەڵسوکەوتی گەلانی دونیایە، گەر لە حاڵەتێکدا کە بەرامبەر دوژمنایەتی هەڵبژارد لەگەڵمان و جەنگی لە دژی ئیسلام و موسڵمانان ڕاگەیاند یان دەیچەوساندنەوە لە ماڵو حاڵی خۆیاندا، ئەمانەش پێویستە بجەنگن لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی زوڵمو ستەم و سەرکەشی بەری لێ بگیرێت و دادپەروەری مرۆڤایەتی باڵ بکێشێتەوە بەسەر مرۆڤەکاندا.

بەڵام ئەو کەسانەی کە بە ئاشتی لەگەڵماندا ئەژین و لەسەر ئاینەکەمان جەنگمان لەگەڵدا ناکەن، دەی دروست نییە جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا یان دەستدرێژیی کردنە سەریان، بەڵکو ئایەتەکان نە تەنها ڕێگەمان نادات بەوەی کە جەنگیان لەگەڵدا بکەین، بەڵکو لەوەش زیاتر داوامان لێ ئەکات چاکەیان

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل١٣٢.

[2] الممتحنة: ٨ـ ٩.

لەگەڵدا بکەین و دادپەروەر بین لەگەڵیاندا، ئەمەش ئەوپەڕی کەماڵی سنگفراوانی و لێبوردەیی ئیسلامە بەرامبەر ناموسڵمانەکان و خوای گەورەش دادپەروەرانی خۆش دەوێت. هەروەها وتەی پەروەردگار کە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾.[1] ئەم ئایەتانە لەسەر ئەو بێباوەڕانەی کە ئاشتەواییمان لەگەڵدا ئەکەن ئەدەوێت، کە ئەگەر دەستی ئاشتەواییان بۆ راکێشاین ئیتر بۆمان نییە جەنگ و دژایەتییان بکەین. پاشان دەربارەی بێ باوەڕە دەستدرێژکارەکان ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُواْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوَاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثِقِفْتُمُوهُمْ وَأُوْلَـئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً مُّبِيناً﴾.[2]

ئەم ئایەتەی دووەم سەبارەت بەو کەسانەیە کە جەنگمان لەگەڵ ئەکەن و دەستدرێژییمان ئەکەنە سەر.

ئەوانەی دەست هەڵئەگرن لە جەنگکردن لەگەڵمان، پەتی ئاشتی هەڵئەدەن بۆ جیهانی ئیسلامی، ئیتر بۆمان نییە دەستیان بۆ بەرین، بەڵام ئەوانەی واز لە جەنگ ناهێنن لەگەڵماندا، ئەوانە هەقی خۆمانە لەگەڵیان بجەنگین و بەدوایانەوە بین، خوای گەورە رێگەی داوین ئەم کارە ئەنجام بدەین. کەواتە ئامانج و مەبەستی جەنگ لە ئیسلامدا، رێگەپێدراوە لەپێناو هەڵگرتنی ستەمو دەستدرێژیی و بەرگرییکردن لە خاکو سەرخستنی چەوساوەکان کە لەلایەن ملهوڕێکەوە لە ئاینەکەیان سادیان بکاتەوە یان پەشیمانیان بکاتەوە و لە ئازادییەکانیشیان بێبەشیان بکات. جا ئەو کاتە ئاین یەکلادەبێتەوە بۆ پەروەردگار لە رێگای نەهێشتنی چەوساندنەوە و زامنکردنی ئازادییەکان بۆ خەڵکی.

---

[1] النساء : ٩٠.

[2] النساء : ٩١

کۆمەڵێ لە زانایان پێیان وایە هەموو ئەو ئایەتانەی باسی گیانفیدایی و کوشتار ئەکەن لە قورئاندا بە ئایەتی (السیف) سڕاونەتەوە - واتە کاریان پێناکرێت و تەنها ئەخوێنرێنەوە - کە ئەمەش ئایەتەکەیە: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُواْ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.[1]

تەنها بەم ئایەتە دەیان ئایەتی قورئانەکەی پەروەردگاریان تەنها بۆ مێژوو جێهێشتووە، وایان لێهاتووە تەنها بۆ خوێندنەوە و موبارەکی ماونەتەوە و تەنها (بۆ قەلقەلەیەکی زمانە لە کاتی خوێندنەوەدا)،[2] هیچ پەیوەندییەکیشیان بە حوکمەکەی و بە یاسادانانەوە نەهێشتەوە.

ئیبن جەوزیش ئەڵێ: زاناکان را جیاوازییان هەیە کە ئایا ئەم ئایەتانە سڕاونەتەوە یان نا؟ لەسەر دوو ڕان:

یەکەم: بەڵێ مەنسووخە.

دووەم: نەخێر، ئایەتێکی جێگیرە (محکمة).[3]

ئیبن تەیمیەش ئەڵێت: "ئەم رایە - واتە رای دووەم - رای جمهوری زانایانە و رای مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و کەسانی تریشە، رای یەکەم لاوازە، چونکە ئەو قسەیە پێویستی بە بەڵگەیە، دەی لە هەموو

---

[1] التوبة : ٥.

[2] مصطفى أبو زيد، النسخ في القرآن (٥٠٨/٢).

[3] زاد المسير، ١٩٧/١.

قورئاندا ئایەتێك نییە دژیانبێت و هەڵیوەشێنێتەوە، بەڵکو ئایەتی تێدایە پاڵپشتی ئەکات، کەواتە سڕینەوەکە لە کوێدایە".[1]

مامۆستا عبدالله کوڕی یوسف الجدیع ئەڵێت: "کۆمەڵێك چەند بە هەڵەداچوون کە وتیان سڕراونەتەوە بە ئایەتێکیش سڕیویاننەتەوە کە ئەوانیش لە هەمان بابەت دەدوێن، کە ئەوان ناویان ناوە ئایەتی (السیف) کردویانە بە شمشێرێك و مانای کۆمەڵێ ئایەتیان پێ کەنارکردووە لە قورئاندا کە قورئاندا خۆی فەرموویەتی: ﴿لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾،[2] واتە: قورئان کتێبێکە نە لە پێشەوە و نە لە پشتەوە و هەڵوەشانەوە رووی تێ ناکات، چونکە لەلایەن کاردوست و سوپاسکراوەوە دابەزیوە.

تا وای لێهات کەسێ بڵێ ئەم ئایەتە (١٢٤) ئایەتی نەسخ کردووەتەوە، سوێند بەخوا ئەم قسەیە ئەوپەڕی پووچو بێ مانایە و خراپە، چونکە شمشێر تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە شمشێرت لێ هەڵ ئەکێشێت، نەك بۆ ئەوەی وازئەهێنێ و دەست هەڵ ئەگرێت، چ جای کەسێك دەستی ئاشتییمان بۆ درێژ بکات".[3]

ئایاتی جەنگو جیهاد بە ئایەتی (سەیف) ناسڕرێتەوە، لەبەر کۆمەڵێ هۆکار، لەوانە:

---

[1] قاعدة مختصرة في قتال الكفار ومهادنتهم، ل١٠١.

[2] فصلت : ٤٢.

[3] تقسيم المعمورة في الفقه الاسلامي وأصره في الواقع، ل٧٣.

یەکەم: خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾[1]، واتە: دەستدرێژیی مەکەن خوا دەستدرێژییکارانی خۆش ناوێت، دەی کەی ماقوڵە دەستدرێژیی لە زەمەنێکدا ناشیرینو بێزراو بێت لە لای خوا و لە زەمەنێکی تردا بسڕێتەوە و لە سەردەمێکی تردا ڕێگە پێدراو بێت؟!

دەستدرێژییکردن هەر خراپە لە هەموو سەردەمێکدا، ئیبن تەیمیە ئەڵێت: "هەرکەسێ وتبێتی (وَلاَ تَعْتَدُواْ) مەنسوخە، قسەیەکی لاوازە، چونکە دەستدرێژیی کردن ستەمە، خوایش هەرگیز ستەم قبوڵ ناکات".[2]

دووەم: نابێت بڵێین هۆی ڕەوایەتی جەنگ لە ئیسلامدا تەنها بێ باوەڕییە، بەپێی ئایەتی (السیف)، چونکە ئەوە پێچەوانەی بنەمای (زۆرلێکردنە) ـ الاکراه ـ.

ئیبن تەیمیە ئەڵێ: "﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾، کە هەق ڕۆشنبوویەوە زۆرلێکردن نییە لە ئیسلامدا، ئەمەش دەقێکی گشتییە: ئێمە زۆر لە کەس ناکەین لە ئایندا، ئەگەر بێ باوەڕان لەسەر موسڵمان نەبوونیان بکوژرێن، ئەوە گەورەترین زۆرلێکردنە".[3]

"هەموو کۆمەڵی سەلەف و خەلەفیش لەسەر ئەوەن کە ئەو ئایەتە تایبەتمەند نییە و نەسخیش نەبۆتەوە، بەڵکو ئەڵێن: ئێمە زۆر لە کەس ناکەین بۆ ئەوەی ببنە موسڵمان، بەڵکو تەنها لەگەڵ ئەوانەدا ئەجەنگین کە دەنگمان لەگەڵ ئەکەن، کاتێ موسڵمانیش بوو خوێنو ماڵی لەسەرمان

---

[1] البقرة : ١٩٠.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

حەرام ئەبێت، خۆئەگەر بیٚ باوەڕ بێت و بەڵام بەشداری جەنگ نەكات لە دژمان جەنگی لەگەڵ ناكەین و زۆریشی لیٚ ناكەین بۆ موسڵمانبوون).[1]

سێیەم: ئایەتەكە تایبەتە بە كۆمەڵیٚ لە بێباوەڕان، كە جەنگاوەری دەستدرێژكارن، نەك هەموو بێباوەڕان، ئایەتەكەی سورەتی (البراءة) دەربارەی كۆمەڵێكی تایبەت لە بتپەرستەكان دەدەوێت، كە لە نێوان ئەوان و پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) پەیماننامە هەبوو، كەچی شكاندیان و دژایەتیی موسڵمانانیشیان كرد.

ئیبن تەیمیە لە وەڵامی ئەو كەسانەدا كە ئەیانووت ئایەتی (ولا تعتدوا) بە ئایەتی شمشێر نەسخ بۆتەوە، ئەڵیٚ: "ئەوە پێچەوانەی ئەمە نییە و ئایەتەكە رەهایە ـ مطلق ـ ە و بیٚ باوەڕ لە هەندیٚ حاڵەتدا نابیٚ بكوژرێن وەك كاتی رێكەوتننامە و كاتی ئەمین و ئەمانكردنیان یان كاتیٚ بەشداریی جەنگ نەبن لە دژمان ـ ئەمەش تایبەت و كۆتكراوە ـ ئەویش رەهایە و راستەوخۆ فەرمان بە كوشتنیان ناكات".[2]

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە ئەم ئایەتە تایبەتە بە كۆمەڵیٚ لە جەنگاوەرە بیٚ باوەڕەكان نەك بتپەرستەكان بە گشتی، ئەوەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئاً وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَداً فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾.[3] واتە: لەگەڵ ئەوانە مەجەنگن كە پەیماننامە لە نێوانتاندا هەیە و پاشان هیچ خاڵێكی پەیماننامەكەیان نەشكاندووە و دوژمنان ناهێننە سەرتان دەی سا

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١١٦.

[3] التوبة : ٤.

ئێوەش پەیمانەکەیان لەگەڵدا بەرنەسەر، چونکە خوای گەورە تەقوادارانی خۆش ئەوێت.

بەڵگەیەکی تریش لەسەر ئەوەی کە ئایەتەکە تایبەتە بە کۆمەڵێ لە بێ باوەڕانەوە نەك هەموو بێ باوەڕان، ئەم ئایەتەیە کە راستەوخۆ دوای ئایەتی (السیف) هاتۆتە خوارەوە و ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْلَمُونَ﴾.[1] واتە: هەرکەسێ لە بێ باوەڕان پەنای بۆ هێنان، پەنای بدە و بیهێنە لای خۆت تا لە نزیکەوە و راستەوخۆ ئایەتەکانی پەروەردگار ببیستێت و پاشان ئەمانی تەواوی پێ بدە، چونکە ئەوانە گەلێکن نازانن.

"ئەم ئایەتە فەرمانە لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی کە پەنای ئەوانە بدات کە پەنای بۆ دێنن لە بێ باوەڕان، و پاشان بانگیان بکە بۆ باوەڕهێنان بە خوای گەورە، پاشان خێر و گەورەیی باوەری بۆ روون بکەرەوە، ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر بێ باوەڕی و گومڕایی خۆی، بەڵام تەنها داوای پەناهەندەیی لە پێغەمبەر دەکرد، دەی تۆش داواکەی بەجێ بێنە و بیگەیەنە جێگای پڕ لە ئەمن و ئەمان".[2]

هەروەها بەڵگەیەکی تریش لەسەر ئەوەی ئایەتی (السیف) پەیوەستە بە کۆمەڵێ لە بێباوەڕە دەستدرێژکارە شەرەنگێزەکانەوە نەك هەموو بێباوەڕان بە گشتی.

ئەوەیە کە ئەو ئایەتانەی کە بە دوایدا دێن هۆی جەنگکردن لەگەڵ بێباوەڕان روون ئەکاتەوە کە تەنها لەبەرئەوەیە کە ئەو بێباوەڕانە رێ لە

---

[1] التوبة : ٦.

[2] مصطفى أبو زيد، سەرچاوەی پێشوو، ٥١٢/٢.

بڵاوبوونەوەی پەیامی خوا ئەگرن و دەستیش لە باوەڕداران ناپارێزن و پاشان پەیمانشکێنی ئەکەن و گاڵتەش بە ئاینی خوا ئەکەن و نیازیان هەیە پێغەمبەری خوا وەدەرنێن و ئەوان دەستپێشخەری جەنگ ئەکەن لەگەڵ موسڵمانان.

کەواتە ئەو بتپەرستانەی ئایەتی (السیف) باسیان ئەکات، کۆمەڵێکی تایبەتن لە بێباوەڕان، لە نێوان ئەوانو پێغەمبەریشدا پەیمانی مۆرکراو هەیە و ئەوان پەیمانەکەیان شکاندووە و هاوکاری دوژمنانیشی ئەکەن و ئەوانە خوا و پێغەمبەرەکەی لێیان بەرییە و رێگەی جەنگی داوە لەگەڵیان".[1]

- ٥ -

بەپێی ئەم بەڵگانەی پێشوو، هەورەها لە رێگەی وردبوونەوە لە خیتابی قورئانی پیرۆز، بۆمان دەرئەکەوێت کە: "قورئان زۆر سوورە لەسەر ئەوەی کە پەیوەندی نێوان موسڵمانان و گەلانی تر، ئەبێ لەسەر بنەمای رێزگرتنی دوو لایەنە بۆ ئەركو مافەکان.

لەپێش هەموویانەوە مافی هەڵبژاردنی بیروباوەڕ و قیەم و بەرجەستەکردنی لە ئەرزی واقیعدا، بۆیە قورئان قەدەغەی کردووە لە موسڵمانان کە پەنابەرن بۆ توندوتیژی و جەنگ لە کاتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ گەلە ناموسڵمانەکان و شوێنکەواتووانی ئیسلامی عەزیز هان ئەدات تا چاك بن لە هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا، وەك ئایەتی: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ

---

[1] هەمان سەرچاوە.

إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾.[1] واته: بەشێوازێکی زۆر جوان نەبێت دەمەقاڵە و گفتوگۆ لەگەڵ خاوەن ئاینەکانی تردا مەکەن، مەگەر لەگەڵ ئەوانەیان کە ستەمکارن و پێیان بڵێن، ئێمە باوەڕمان بەو پەیامە هەیە بۆ ئێمە هاتۆتە خوارەوە و ئەوەشی بۆ ئێوە هاتووە و خوای ئێمە و ئێوە یەك خوایە و ئێمە ملکەچین بۆی.

لەم بانگەشەیەی قورئانی پیرۆزدا، کە موسڵمانان ئاگادار ئەکاتەوە باوەڕ بەخوا بوون و موسڵمان و جولەکە و گاور کۆئەکاتەوە لە خاڵێکی هاوبەشدا، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ گرنگی ئامادەسازی زەمینەی هاوبەش لە نێوان ئوممەتی ئیسلام و ئوممەتەکانی تردا، وە لەو ڕێگایەوە هاوکاری و هاوسۆزی بێتە کایەوە، هەرئەوەشە کە ئایەتی (٦٤)ی سورەتی (آل عمران) فەرموویەتی:

﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾.[2] واته: بە جولەکە و گاوران بڵێن وەرن با لە خاڵێکی هاوبەشدا یەکبگرن کە ئەویش جگە لە خوا خوایەکی تر نەناسین و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەین و هەندێکمان هەندێکی ترمان نەکەین بە خوا، ئەگەر هەر ملیان نەدا بۆ موسڵمان بوون، پێیان بڵێن دەی شایەت بن ئێمە موسڵمانین.

هەروەها ئەبینین قورئانی پیرۆز موسڵمانان بانگ ئەکات بۆ پێکەوەژیانی ئاشتییانە لەگەڵ خەڵکانی تر، تەنانەت لە کاتی ناکۆکی ئاشکراشدا لە بیروباوەڕ و دیدگادا و کارەکە ئەداتە دەستی پەروەردگار تا هەق سەرئەخات

---

[1] العنكبوت : ٤٦.

[2] (آل عمران: ٦٤).

و ناهەقیش نابووت ئەکات و بەردەوام هەق رۆشن بکاتەوە و خەڵکی بانگ بکات بۆ دەستگرتن بەو دادپەروەرییەوە کە خوای گەورە داوای ئەکات کە ئەفەرموێت: ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكاً هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَازِعُنَّكَ فِي الْأَمْرِ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَى هُدًى مُّسْتَقِيمٍ * وَإِن جَادَلُوكَ فَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾.[1] واتە: بۆ هەموو گەلێك كۆمەڵێ پەرستشمان داناوە كە ئەو گەلە جێبەجێی ئەكەن، كەس كێشمەكێشت لەگەڵ ناكات لەم كارەدا و تۆ گوێمەدەرێ و بەردەوام بۆ لای خوا بانگەواز بكە، چونكە تۆ لەسەر رێبازی راستیت.

ئەو كەسەی بە وردی لە ئایەتی (جیهاد) بكۆڵێتەوە و لە مەبەستەكانی وردبێتەوە بۆی دەرئەكەوێت كە بەكارهێنانی هێز و توندوتیژی بەرامبەر هێز و توندووتیژی دوژمنان بەكاردێت، واتە: بەكارهێنانی هێز دژی ئەو وڵات و دەستە و تاقمانەی پەنا بۆ دوژمنایەتی و زەبر و زەنگ ئەبات بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی، وە دەستكەوتنی حوكمی تاكڕەوی وڵات.

كەواتە، لێرەدا هەڵەی ئەو رایەمان بۆ دەرئەكەوێت، كە دەڵێ ئامانج لە جیهاد و كوشتار لە ئیسلامدا بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلامە لەناو گەلاندا.

ئێمە لەو باوەڕەداین ئەم رایە لەوەوە سەرچەشمەی گرتووە كە بە هەڵە تێگەشتنێك هەیە لە كاتی فەتحی وڵاتاندا لەلایەن سوپای ئیسلامەوە.

خۆ جەنگ دژی فارس‌و رۆمەكان بە مەبەستی بڵاوكردنەوەی ئیسلامەوە نەبوو، وەك هەندێك گومانی بۆ ئەبەن، بەڵكو جەنگ دەكرا دژی ئەو دەسەڵاتە خۆسەپێنە ستەمكارانە بووە كە لە رێگەی ئاگر و ئاسنەوە خۆی سەپاندووە و بە زۆری چەك رێگر بووە لەوەی بانگەوازی قورئان بگاتە گەلەكانیان و هەق رۆشن ببێتەوە.

---

[1] (الحج : ٦٧ـ ٦٨)

هەڵوێستی ئەسڵی و ئاسایی ئیسلام لەگەڵ گەلاندا بریتییە لە پێکەوەژیانی ئاشتییانە و ڕێزگرتنی مافەکان و دروستکردنی زەمینەیەکی هاوبەش بۆ پێشبڕکێ لە کاری خێردا.

هەر ئەم هەڵوێستەشە کە قورئانی پیرۆز دووپاتی ئەکاتەوە و لە دەستوورەکەی مەدینەشدا بە ئاشکرا ئەمە بەدی ئەکرێت.[1]

---

[1] العقيدة والسياسة، لؤى صافي، ل٢٥٦.